# چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی دێرینی
# گەلانی ئاری نەژاد و پاشماوەی شوێنەوارەکانیان و ئاینزایان لە کوردستاندا

# چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی دێرینی گەلانی ئاری نەژادو پاشماوەی شوێنەوارەکانیان و ئاینزایان لە کوردستاندا

کۆمەڵێك نووسەر

وەرگێڕانی: کەمال نوری مەعرف

MUKIRYANI
ESTABLISHMENT FOR RESEARCH & PUBLICATION

2013

**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاو کردنەوە**

● **چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی دێرینی گەلانی ئاری نەژاد و پاشماوەی شوێنەوارەکانیان و ئاینزایان لە کوردستاندا ( بەرگی دووەم )**

● کۆمەڵێك نووسەر

● وەرگێڕانی: کەمال نوری مەعروف

● نەخشەسازی ناوەوە: سەنگەر دلاوەر عەبدوڵڵا

● بەرگ: جێگر عەبدولجەبار + مراد بەهرامیان

● نرخ: (٤٠٠٠) دینار

● چاپی یەکەم: ٢٠١٣

● تیراژ: ٥٠٠ دانە

● چاپخانە: چاپخانەی موکریانی ( هەولێر )

● لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (2732)ساڵی(2011)ی پێ دراوە.

زنجیرەی کتێب (٥٦٩)



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# ناوەڕۆك


- پێشەکی وەرگێڕ.................................... 7
- ئاسەواری فەرهەنگ و شارستانێتی عیلامی.................... 9
- لەلانکەی شوێنەوار و مێژوودا............................ 45
- تیشکێك بۆ سەر تەپەی حەسەنلو........................... 25
- شوێنەوارەکانی دەوروبەری شاخی بێستوون..................... 17
- تیشکێك بۆ سەر کۆچی گەلانی هیند و ئەوروپی و ناوچەی نیشتەجێبوونیان... 57
- تیشکێك بۆ سەر مێژووی ئیلامیەکان......................... 63
- جوگرافیای ئێران و کاریگەرێتی لەسەر مێژووی ناوچەکە............ 71
- تیشکێك بۆ سەر گۆڕە بەردینەکانی سەردەمی هاخامەنشی............ 79
- تیشکێك بۆ سەر پۆشاکی ماد.............................. 85
- زەردەشت... مێژووی دەرکەوتنی............................ 93
- تیشکێك بۆ سەر مێژووی ئۆرارتۆ........................... 119
- تیشکێك بۆ سەر ئاوێستا.................................. 123
- بەڵگە هێنانەوە لەسەر تەلارسازیی ئاشکانییەکان............... 129
- پەرستگای ئاناهیتاو شێوازی بیناسازییەکەی ................... 143
- تیشکێك دەربارەی سەردەمی ژیانی زەردەشت ................... 169

- تیشکێك بۆ سەر ((وەندیداد))) و ئاپینی مووغەمەکان ........................ 307
- لەکام رۆژگار لە ئێراندا ئاینی زەردەشت بڵاوبۆتەوە.............................. 185
- باسێکی ئاسایی لەسەر زەدەشت....................................... 187
- ئایە زەردەشت یەکتاپەرستبووە؟........................................ 189
- وندیدار.. تێگەیشتن لە تایبەتمەندییەکانی غەیری زەردەشتی ....................... 215
- لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی لەسەر سەرهەڵدانی ئاپینی مووغەکان............. 233
- کنە و پشکنین لە پایتەختی مانابیەکان لە قەلایچەی بۆکان بۆ
جاری نۆیەمین دەستی پێکرد................................................. 231
- تەلارسازی هەڵکۆڵینی بەرد.................................................. 237
- بینای مەزەبی لە رۆژگاری ساسانیدا ........................................ 241
- نووسین و ئەدەبیات لە سەدەمی ساسانیدا ................................... 245
- نووسین و زمان لە سەردەمی ئاشکانیدا ....................................... 255
- پەیامی زەردەشت ئەلف-ئاوێستا:.............................................. 259
- زەردەشت.. حکومەت ........................................................ 283
- تەلارسازی سەردەم ماد ..................................................... 303
- سیستەمی ئیداری مادەکان.................................................. 177

# پێشەکی وەرگێڕ

خوێندکاری خۆشەویست وا جارێکرتیش بە چەند لاپەڕەیەکیتر لەسەر شوێنەوارو مێژووی دێرینی گەلانی هیندو ئاری دێمەوە لاتان کە لە فارسییەوە گۆڕیومن بە هیوام خزمەتێکە گچکەم بە ئێوەی قوتابی بەشی مێژوو و شوێنەوارکردبێت لە دانشگاکانی کوردستانا.

ئەم چەند لاپەڕەیە بەشێکی هێجگار کەمە لەو خەرمانە گەورەیەی کە هەمانە و لە باوك و باپیرانمانەوە بۆمان ماوەتەوە لە ئەنجامی هەوڵ و تێکۆشانیان بۆ خزمەتی خاك و نیشتمانەکەیان ئەوەی ئەوان لە مێژووی شارستانیەتدا دروستیانکردووە پەیامێکە بۆ ئێمە کە پێویستە عیبرەت و وانەیان لێوەربگرین لە هەمان کاتیشدا هاندەرێك بێت بۆ زیاترکردنی هەستی نەتەوایەتیمان بەرامبەر داگیرکەرانی وڵاتی شیرینی کوردەواری. بەڵگەی ئەو مێژووە دێرینەش کە شانازی پێوەدەکەین بەشێکی بۆ گردو تەپۆڵکە و ئەشکەوت و پەنا بەردینەکان دەگەڕێنەوە کە مرۆڤی کۆن سەرەتاکەی لە تەکنۆلۆژیایەکی کۆنەوە دەستی پێکرد و مرۆڤی ئەم سەردەمەش گەیاندییە ئەم پێشکەوتنەی ئێستا کە پەیوەندی بە رادەی بیروهۆشی مرۆڤەوە هەیە.

هیوادارم بەم چەند لاپەڕەیە بۆ جاری دووەم توانیبێتم کتێبخانەی کوردی هەژار بەم جۆرە سەرچاوانە تۆزێك ببووژێنمەوە بۆ ئەوەی سوودی خۆی بگەیەنێت. لەلایەکیتریشەوە دەبێت ددان بەو

راستییەدا بنێین کە زانیاریمان لەسەر مێژووی ئەو چاخە کۆنانە هێجگار کەمە بەهۆی کەمی سەرچاوەو نەبوونی کاری کنەو پشکنینی شوێنەواری لە وڵاتی گەورەماندا.

لێرەوە رووی دەمم دەکەمە دەزگا بەرپرسەکانی حکومەتی هەرێم کە ئەرکی لە چاپدانی ئەم جۆرە سەرچاوانە لە ئەستۆی ئەوانداسە و پێویستە دەستی یارمەتی بۆ خاوەن ئەو قەڵەمانە درێژ بکەن بۆ لە چاپدانی بەرهەمەکانیان،

تاوەکو زیاتر ئاشنا بین بە مێژوو و شوێنەوارەکانمان بۆ ئەوەی نامۆ نەبین لە مامەڵەکردنمانا سەبارەت بەو بابەتانە و وەکو پیاوانی سیاسی کوردیشمان بەسەرنەیەت کە دەڵێن: ئێمە مێژوویەکمان دەوێت کە ئەمرۆ بەدەستی خۆمان بینووسینەوە.

دەبا هەموومان هاوبەشی بکەین لەو خزمەتە گەورەیەدا بۆ ئەوەی قوتابییەکانمان بە چەکی مێژوو پەروەردەبن و خۆشەویستی کوردو کوردستان زیاتر لە دڵیانا بچە سپێ و لەمەدا لاسایی گەلی ئەرمەن بکەینەوە لە خۆشەویستیماندا بۆ خاکەکەمان.

جارێکیتریش ئەوە دەڵێمەوە: با هەوڵ و تێکۆشانمان زیاتر بکەین بۆ نووسینەوەی مێژوومان، چونکە هیچ گەلێك نەماوە لە دنیادا مێژوو و شارستانێتی خۆی نەنووسیبێتەوە غەیری کورد نەبێت کە خەرمانێکی گەورەی لە شوێنەوار هەیە، بەڵام هیچی بۆ نەکردووە. هەروەکو لای دۆست و دوژمنانیشمان ئەو راستییە دیارو درەوشاوەیە کە ئێمەی کوردگەلێکی دێرین و رەسەنین و بەر لە گەلانیتری ناوچەکە کوردستانی خۆمان ئاوەدان کردووتەوەو تیایدا ژیاوین.

## ئاسەواری فەرهەنگ و شارستانێتی عیلامی

## 2700 – 640 پ. ز

ئاسەواری فەرهەنگ و شارستتانێتی عیلامی لە خۆزستان و لوڕستان و فارس خاوەنی تایبەتمەندی دڵخۆشکەری خۆیان بوون کە بەر لە (2) هەزار ساڵ (2700-640 پ.ز) جۆرێ لە دامەزراویان هەبووە، بەو شێوەیە مێژووی نووسین و زمانیان تاوەکو ئەمڕۆ بەناوی خۆیانەوە ناسراوە، بەڵام پەستگاکانیان لەو رووەوە ئەوەی هەیانبووە لە ناوچووە جگە لە پەرستگای ((دوراوەنتاشی)) ((چغازە نبیل)) کە لە لیستی ئاسەواری جیهانیدا تۆمارە. ناوی عیلام چەند جارێك لە تەوراتدا هاتووەو لە کتێبی کارەکانی پەیامبەران و مەراسیمی جەژنی (پەنجا)دا هۆکاری ئەو جەژنە لە عیلام بەیانکراوە، و لەو مەراسیمەدا هاوبەشییان کردووە کە بەناوی یەکێك لە پادشاکانی عیلام بووەو لە (سیفر)دا بەشێوەی (کیدور لالە ئۆمەر) یان (کوتر لال گامار) هاتووە کە بە خوای پاسەوان ناوی براوە.

دەشتیّ عیلام لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لەبەر دوری لەلایەن مرۆڤەوە بە (خۆزستان) ناوی گۆڕاوە. ((خۆزستان) لە رۆخی کەنداوی فارسەوە بەرەو باکوور وردە وردە دەکشیّ و بەرزدەبێتەوە، لە ئەهواز بەرزییەکەی دەگاتە سەد مەتریکو لە (کوهپایە)ی (ئاندیمشك)یش دەگاتە 170 مەتر لە رووی دەریاوە.

دەشتی عیلام کەمەر کەزە کۆنەکەی (سۆزیان)ەیە و هاوواتەکەی (شوش)ە سەرزەمینی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵە و رووباری (کارون) و قەڵای (کەرخە)ش لێرەن. دەشتی (شوش) و شاخەکانی و دەبرەندەکانی زاگرۆس (لوڕستان) و (بەختیاری) تاوەکو دەشتی سپی فارسی (ملیان) بە سنووری عیلام گەیشتوون، عیلامەکانیش بەو شاخانەیان وتووە (ئانزان) و (ئانشان).

عیلامیەکان ناوی وڵاتەکەیان بە ئەلف و بێی مێخی بە شێوە (هێلتائامتی) نووسیوە کە (هێل) بەمانای سەرزەمینەو (تائامتی)یش بە مانای حەکیم یان ئاقڵ دێ و خۆشی هێنەرە بۆ خوا کە لە راستیدا ((سەرزەمینی خوایە))، ئەوەش زانراوە سۆمەرییەکان بە عیلامیان وتووە (نیم) کە بەسەرزەمینی بڵند دەڵێن.

(شوش) مەرکەزی عیلامەو لە چوار رێگاوە پەیوەستە بە (بابل)ی نێوان دوو رووبار بەمانا بە (لوڕستان) و (بروجەرد) و (هەمەدان) و (رەی) و (بائیزە)، (ئەسفەهان)یش دەکەوێتە بەردەمی و (فەهلیان) و (ملیان)ی فارسیش لەمەدا خاوەن بڕیار بوون. عیلامیەکان ئەوەی هەیانبووە لە سەرچاوە لە خاکی نێوان دوو رووبار لە سۆمەرییەکان و بابلیەکان لەبەرد و مس و قوڕقوشم و زیو بەدەستیان گەیشتبوو هەر لەوێشەوە هەموو کاڵاکانیتریش بۆ عیلام چووە لەگەڵ ئەوانەشدا چنینیش هەبووە.

لە (3) هەزار ساڵی بەر لە زایین سۆمەرییەکان نووسینی ئامادەکراوی لەبەرچاوی ئامارکراویان هەبووەو ئیبداعیان تیایدا کردووەو تابلۆکانی ئەم نووسینانەش بە رێگای پەیوەندییەکانی بازرگانی گەیشتوونەتە عیلام. ئەمانە لە باشوور واتە (خۆزستان) و باشووری خۆرهەڵاتی ئێران لە تەپەی (یەحیا) و گردی (ئیبلیس) و (شەهداد)ی شاری سوتاو دەرکەوتوون. لەوانیشەوە گەیشتوون بە (بەهبەهان) و (ملیان)ی گودین تەپەی کەنگاوەر لە خۆرئاوای بەرزاییەکانی ئێراندا دەرکەوتوون. بەو جۆرە وردە وردە نووسینی وێنەیی چووەتە ناو ئەدەبیات و گفتوگۆی بازرگانییەوەو لەناویا کۆبووەتەوە.

نووسینی وێنەیی لە راستەوە بۆ چەپ دەڕواو دەخوێنرێتەوە. جامی زیوینی جەلال ئاباد کە خوارەوەی لەناویا هێڵی وێنەیی لەسەر نەخشێنراوەو بە رێکەوت کەوتووەتە دەست (والتەر هینتس) و خوێندوویەتەوە. ئەم نووسینە بەپێی راپۆرتەکەی (هێنتس) (150) نیشانەی لە خۆگرتووەو بە شێوەیەکی تایبەتی داڕێژراوە بەهۆی ئەم نووسینەوە نووسینێکی ئەلف و بێ دروستبوو کە هەندێك لە هێماکانی وێنەیی بوون لە سەردەی 23ی بەر لە زایین ئەو شێوەیە تاکە نووسینی باڵابوو دەنووسراو دەخوێنرایەوە.

هەموو بەردە نووسراوەکان کە نووسینی عیلامییان لەسەر پەیوەستبوون بە پادشای عیلامی ناوبراو لە 2250ی پ. ز. لە ساڵی 1961ی زایینی هێمای ئەوانە بڵاوبوونەوەو لە ساڵی 2220 پ.ز نووسینی سۆمەری-بابلی و عیلامی بەشێوەی نووسینی مێخی دەرکەوت کە کۆنترین شێوەی (نیوە وێنەیی و نیومێخی) بوو، ئەوەش لە پەرستگای (هومبان نۆمن)ی شاری (لییان) لە (بوشەهر) ساڵی 1913ی زایینی بوو بە رێگای (مۆریس پزار) بەدەستگەیشت.

نووسینەکانی (داریۆش) و (خشایارشا) کە بە 3 جۆر نووسینی فارسی کۆن واتە (ئەلف و بێ)ی بابلی عیلامی نووسراون لە هەمەدان و بێستوون و تەختی جەمشید و شوش دۆزرانەوە ئەمانە بوونە یارمەتیدەر تاوەکو نووسینی عیلامی و بابلی لە رێگای فارسی کۆنەوە بە تەواوی دەرکەوت و هێماکانیان کۆکرانەوە.

**نیگایەك بەسەر مێژوو و فەرهەنگی عیلامیەکان کە پێکهاتووە لە:**

1- پادشاکانی زنجیرەی (ئاوان) (2500 تا 2200 پ.ز).
2- پادشاکانی زنجیرەی (سیماشکی) (2100 تا 1900 پ.ز).
3- پادشاکانی زنجیرەی (گارداکانی) سنووری (1850 تا 1520 پ.ز).
4- پادشاکانی عیلامی ناوەند (1450 تا 1120 پ.ز).
5- پادشاکانی زنجیرەی عیلامی نوێ (983 تا 640 پ.ز).

عیلامیەکان خاوەنی ئایینێکی تایبەت بە خۆیان بوون کە پەیوەست بوو بە وڵاتی نێوان دوو رووبار و لەناویا کۆیلەیەتی نەبووەو رێزیش لە ئافەرت گیراوە، پەرستنی ماریش لایان رەگو ریشەی لە سیحرەوە هاتووە. مارکە خاوەنی جۆرە رەسەنایەتییەك بووە بەرامبەر جادووی ئەفسووناوی (ئیبلیس) وەستاوەو تیایدا دەرکەوتووە.

وێنەکردنی ئەم جانەوەرە لە رووی گۆزەو دەمی سواڵەتەکاندا بە ئامانجی پاسەوانی بووە. مارە نەخشکراوەکانیش وەکو پاسەوان پارێزگارییان لە دەروازەی دەربەندەکان کردووە یان پێچیان خواردووەو بە باڵای بەرزەوە دیارن.

یا وەکو لە دەمی سواڵەتەکەدا شێوەکەی نەخشێنراوە هەروەها ئەم جانەوەرە لەسەر کۆمەڵێك ئامێر دەرهێنراوە پادشاو پاسەوانی بۆ کردووە یا وەکو بەدەوری درەختا خۆی پێچاوەو یادگارێکی وەبیرهێناوەتەوە کە خوایە.

ئایینی عیلامییەکان لە پایەی کەسیدا پەیوەستبووە بە خوا (پینیکیر). ئەم خوایەی عیلام دایکی خوای شایستەی هەموو خواکانە، و ناوی لە پەرستگای (لییان)ی (بوشەهر) (کیریشا) بووەو لە وێرانەکانی (لییان) و (شووش) و (هەفت تەپە) و (چۆغە زەنبیل) ژمارەیەکی زۆر لە پەیکەری رووتی ئەمە بەدەست گەیشتووە.

لە ئەنجامی شووکردنی ئەم دایکە خوایە واتە (پنیکیر) یان (کیریشا) لە هەزارەی دووە می پ.ز. بە (هومبان) کە لەژێر ناوی خوای ئاسماندا ناسراوە بەرهەمەکەی خوایەکیتری لێکەوتەوە بەناوی (هوتران).

جارێکیتر لە هەمان هەزارەی دووەمداو بەهۆی فراوانبوونی (شووش) کە بووە شارێکی گەورە لەگەڵیا خوای (شووش) ئینشوشیناك)یش پایەی بەرزبۆوەو لە نێوان 37 خوادا پایەی شەشەمی وەرگرت.

خوا (ئینسوشیناك) کە بە خوای (ئیشنیکاراب)ی مێردی خوای پەیمان ناوزەدکراوە لە سەرتاسەری عیلام سوێندییان بەو دوو خوایە خواردووە.

پەرستگاکان واتە شوێنی خواکان کە مەڕاسیمی مەزەبییان تیاکراوە لە میحرابداو سەکۆی قوربانی پەیکەری خواکان لەلایەن نزاکەرانەوە دانراون.

بە نیگەرانییەوە لە ئێستادا ئەم پەرستگایانە نەماون جگە لە ژمارەیەك بەردی نەخشێنراو کە لە (کورانگۆن) و (ئانشان) و (ئێزە) دۆزراونەتەوەو بۆ یادگاری لەو پەرستگایانەدا دانراون و لە رووەدا نووسینەکانی عیلامی ناوی بردوون.

گەورەترین نموونەی ئەم پەرستگایانە زەقورەی (چۆغە زەنبیل)ە کە پەیوەستە بە سەدەی 13ی پ. ز. کە بەناوی (دورئونتاش) ناوی هاتووەو شاکاری بیناسازی

عیلامییەکانی ئەو سەردەمەیە. نەخشەی بنەڕەتی زەقورەکە چوارگۆشەیە و درێژی باڵێکی 105 مەترە.

دانانی نەخشەی ناوبراو پێدەچێت لەلایەن (ئۆنتاش ناپیریشا)وە بوو بێت کە بە وردی کاری تیایدا کردووەو سوپایەکی گەورەش لە کرێکار دروستیانکردووەو ئەو بینا گەورەیەی لێدەرچووە یان شێوەی خۆیەوە گرتووە.

بەر لە دەستپێکردنی کارەکە بە ملیۆن خشتی کاڵو هەزاران خشتی سوورکراوە ئامادەکراوەو ئاویان لە رووباری (دز)ەوە لە دوری 1,5 کیلۆمەتر بۆ نزیك بیناکە هێناوەو تەئمینی کورەی سووتاندنی خشتیشیان بۆ کردووەو دیوارە گەورەکانیان بە وانە دروستکردووەو خشتەکانیشیان مۆرکردووە.

زەقورەکان لە رێگای دیواری دەوردراو خاوەنی حەوت دەروازە بوون. لە بەشی باشووری خۆرهەڵاتی زەقورەکاندا سەکۆی بچکۆڵەی قوربانی هەبوون کە ژمارەیان حەوت سەکۆیە و بەخشت فەرشکراون. دوو ریز لە سەکۆی قوربانیش بەدوای یەکترا هاتوون و لە هەر یەکێك لەو ریزانەدا حەوت تاکە سەکۆ هەبوون کە پێدەچێت هەنگاوێك مەراسیمی قوربانیان لەسەر ئەندامدرابێت لەگەڵ دوو ریز لە چینی حەوت تاکی تریش کە بەدوای یەکترا هاتوون بۆ قوربانی و لەژێرەوە رێڕەویان بۆ کراوە کە خوێنی قوربانییەکانی پیادا رۆشتووە.

گەورەترین دەروازە کە هەبووە لە دیواری ناوەڕاستیا بووە، واتە لە نێوان حەریمی پیرۆز و شاری (دور ئۆنتاش)دا کراوەتەوە، کە بەپێی ئەو نووسینانەی کە هەن لە بەشی دیاری دەروازە گەورەکەدا و بەشی ناوەوەی دەروازەی پادشادا شوێنی دیاریکراوە. پەرستگای چوارگۆشەش رووبەڕووی دەروازەکانی (2) و (4) و (7) بوون کە بۆ هەر یەکێکیان دروستکراوە بەپێی نووسینەکان، پەرستگای (کنار) دەروازەی ژمارە (7) بەخوای (هومبان) پێشکەشکراوە. لە رۆخی ئەویشەوە دوو پەرستگایتر هەبوون کە هەردووکیان دەکەونە کۆتایی بەشی چەپیەوە و پەرستگایەکیش بۆ خوای (ئیشنیکاراب)، کە لە نێوان ئەم و پەرستگای (هومبان)یش پەرستگایەکیتریش هەبووە کە بۆ خوا (کیریرشیا) دروستکراوە.

(3) بینای گەورەی خریش هەن کە نزیك پلیکانەکانن لە ئەترافی ژەقورەکان لە بەشی دەروازەی شا بڕیار لە دروستکردنیان دراوە، هەر یەکێك لەوانە 4 مەتر کەمەرەکەیەتی و چوار دەڵاقەیان هەیە و لەناو

هەر یەکێك لە ژوورەکانیدا شەش پایە هەن کە نووسینە کۆنەکان ئاماژەیان پێدەدەن کە لەوانە سوودیان بینیوەو پارەکانیش پەیکەری بەرجەستەکراوی پادشا بوون.

پشکنەرێکی فەرەنسی باوەڕی وایە زەقورە لە دوو بەشی جیا لە یەکتری دروستکراون، بەو پێیە بیناکە لە قۆناغی یەکەمدا بەشی دەرەوەی دروستکراوە، نهۆمی یەکەمی بە بەرزی 8 مەترە لەگەڵ دروستکردنی 28 رۆژ کە لە رێگای پلیکانەوە پێیان گەیشتوون،

لە قۆناغی دووەمدا نهۆمەکانی دووەم و سێیەم و چوارەمی زەقورەکە دروستکراون. نهۆمی چوارەم پەرستگا گەورەکەی (ئینشوشیناك)ەو کاشی کراوە، بەڵام ئێستا پاشماوەی نەماوە،

درێژی باڵێکی ئەو چوارگۆشە نهۆمە 35 مەترەو ناوەوەی ماوە. ئەم نهۆمە کە لە بەرزی 42,5 مەتر دروستکراوە بەهۆی ئەو پلیکانانەی کە لە هەر یەکێك لە چوار باڵی زەقورەکەدا دروستکراون بە نهۆمی یەکەمەوە بەستراون یان دەگەنەوە. لەو رووەوە لە بارەی زەقورەکەوە دەڵێن:

هیچ نموونەیەکی بیناسازی عیلامی پێوانە ناکرێت بە (چۆغە زەنبیل) ئەو کاتەی کە عیلام لە ساڵی 538 پ. ز. بەشێك بوو لە شاهەنشای هاخامەنشی و پارسییەکان جێگرەوەی هونەرو شارستانێتیان بوون،

بەر لەوەش پارسییەکان لە عیلامی بەهرەمەندبوون. هەتاکو کۆرش وتوویە: فەرهەنگی خۆی لە دروستکردنی سیاسەت و فەرهەنگی بیناییدا لە توانای عیلام بۆی ماوەتەوە.

## دۆزینەوەی گەنجینەی قۆناغەکانی بەر لە عیلامی و عیلامی نوێ:

لە مانگی مایسی 1966ی زاینی (ئەسفەندی 1345) کاتێك کرێکارەکان سەرقاڵی هەڵکەندنی بیرێکی ئاوبوون لە ناوچەی (جەلیل ئاباد) لە دوری کیلۆمەترێك لە باکووری خۆرهەڵاتی تەختی جەمشید، گۆزەیەکیان لەژێر خاکدا دۆزییەوە کە لە ناویا جامێکی زیو هەبوو و دەگەڕایەوە بۆ قۆناغی بەر لە عیلام.

جامی ناوبراو خاوەنی دوو نەخش بوو کە بەشێوەی چەکوش کاری و قەڵەم هەڵکۆڵرابوون، لەلایەکی جامەکە خوایەك کراسێکی لەبەردایە بە دورو گەوهەر رازاوەتەوە، خوالێخۆشبوو (والتەر هینتس) ئەوی بە پێی نووسینەکەی بە (ناران) خوێندووتەوە یان ناساندوویە، لەلایەکەیتری جامەکە شاژنێك بەشێوەی دانیشتنی چوار مەشقی ئەژنۆی لەسەر زەوی بەرێزەوە نووشتاندوەتەوەو لە حاڵێکدایە شەراب تێئەکات، ئەوی بە (کورنیاهیتی) ناوبردووە. نووسینە

هەڵکۆڵراوەکەش لە تەوقاو تەوقی دەمی جامەکە بە نووسینی بەر لە عیلامی وێنەی هەڵکۆڵراوە کە لەلایەکی سەری خوا (ناران) تیایدا دەرهێنراوە،

بەڵام هێڵە درێژەکانی ئەو بەشەی جامەکەی گرتووە. (ناران) خوای پیرۆزییەو ناوەڕۆکی نووسینەکە بۆ بەر لە عیلامی لەسەر جامە زیوەکە دەگەڕێتەوە واتە پەیوەستە بە 2300 پ. ز. گۆڕینی نووسینەکەش کە بۆ بەر لە عیلامی دەگەڕێتەوە و خوالێخۆشبوو (هینتس) گێڕاویەتەوە بەو شێوەیە نووسراوە: ((ئەی خوا کۆمەك بەمن بکە. من کورىناهیتیم. من ساقی پەرستگای پیرۆزی خواکانم.

خۆت نیشانبدەو نیعمەت و بەرەکەتت زۆر بکەو دەوڵەمەندم بکە من نزای خێر هەمیشە لە رێگای تۆدا دەکەم. جامی تۆتە بەڕووکەو دەگەڕێت. تۆ بەمن ژیانی هەتا هەتاییت بەخشی)).

ئەم جامە لە گەنجینەی مۆزەخانەی میللی ئێران نمایشکراوە.

تیایدا نەخشەو نەخشەسازی بەرجەستەکراوە. خوایەك کە ئێستا لە هەردوو دەستیا شتێکی تۆمارکراوی هەڵگرتووە ئەو، سەری خۆی بە شریتێك پێچاوەو کراسەکەی بە دورو گەوهەر دیارە رازاوەتەوە. قەڵەمکاری و نەخشەسازی هەردوو ژنەکە لە تێڕوانینی هونەرو مەعدەن سازییەوە زۆر لەسەرو ئاساییەوەن.

## 2- گەنجینەی ئارجان (قۆناغی عیلامی نوێ):

لە پاییزی ساڵی 1982ی زاینی (1361ی هەتاوی) لە کاتێکدا بلدۆزەرێك بۆ دروستکردنی بەنداوێك لەسەر رووباری (مارۆن) کە دەکەوێتە (ئارجان)ی (بەهبەهان) سەرقاڵی هەڵکەندن بوو، شوێنێکی قوڵ دەرکەوت، ئەو شوێنە گەنجینەیەك بوو لە زەوی ئارانگایەکدا کە پەیوەستبوو بە قۆناغی عیلامی نوێ، ئارامگاکە تابوتێکی وەرشاوی تیادا بوو هاوشێوەی بانووی حەمام و سەرەکەی داپۆشرابوو. ئامێر و کەلوپەلی مردووە کە لە ناوەوەو دەرەوەی تابوتەکە کە هەبوون بەدەستمان گەیشت.

ئەو شتانەی لەناو تابوتەکەدا بوون پێکهاتبوون لە: ئەڵقەیەکی ئاڵتوون و هەشت قۆپچەی ئاڵتوونی و خەنجەرێك و میلێکی زیو و پشتێنێکی وەرشاو و کۆپێکی وەرشاوی مێژوویی و دەسواڵەتی شێوە لوولەیی و شینییەکی وەرشاو لەگەڵ شەربەیەکی وەرشاو. ئەڵقە ئاڵتوونەکە لە دەستی چەپی مردووەکە دابوو بە شێوەی بازنەیەك لە بەشی دەمەکەیدا پانبوو لە ناو ئەم نەخشەدا درەختی خورماو دوو شێری باڵدار هێرشبەر کە لە بەزمی ململانێدا بوون دەبینرێن.

هاوشێوەی نزیکی هەمان نەخشە لە کێلانی شمشێرەکەی داریۆشی یەکەمدا بەرجەستەکراوە. جانەوەرو درەخت لەبەردەم کێوەکەدا وەستاون و کێوەکەش بەشێوەی ئەڵقە ئەڵقەو جووت بازنەی بچووك نیشاندراوە.

تەواوی ئەو شەربەیەو ململانێی نێوان بە شریتێك قەڵەمکاری جوانکراوە کە پێشتر هاوشێوەکەی لە جامە ئاڵتوونەکەی مار لێکدا دەبینرا.

لە شوێنێك دەستە ئەڵقەیەك و رستەیەکی مێخی عیلامی هەڵکۆڵراوەو بە ئاڵتوون نووسراوە: ((کیدین هوتران کوڕی کورلوش)).

سەرچاوە:

سیف الله کامبخش فرد/ اپار تاریخی ایران
چاپ اول 1380/ لا 117-126
ئازەربایجانی خۆرئاوا

# لەلانکەی شوێنەوار و مێژوودا

مرۆڤە سەرەتاییەکان کە لەم حاکەدا ژیاون خانووی داییمیان نەبووەو کۆمەڵی بچووك بچووك بوون لە ڕۆخی سەرچاوەی رووبارەکان و شوێنەکانیتردا ژیاون و پەرتوبڵاوبوون. ئەم کۆمەڵانە بە چاندنی دانەوێڵە ئاشنا نەبوون بەڵکو لەسەر میوەی درەختەکان و ڕەگ و ریشەی گیاو راوی ئاژەڵ و راوی ئاوی خۆراکیان پەیدا کردووە. لە کاتێکدا هەوای ناوچەکەشیان ساردی کردووە پەنایان بردووتە بەر ئەشکەوتەکان و پەنا بەردینەکان. بەپێی کاری کنەو پشکنینی شوێنەواری کە لەلایەن پرۆفیسۆر (کارلتوون کوون) ئەنجامدراوە لە خۆرئاوای دەریاچەی ورمێ لە ئەشکەوتی (تەمتەمە) بەو هۆیەوە بەڵگەی دەستکەوت لەبارەی مانەوەی مرۆڤ لە ناوچەکەدا کە بۆ چاخی بەردینی کۆن دەگەڕێتەوە.

بەڵگەیتر شوێنەواریش لە خاڵە جیاجیاکانیتری ئازەربایجانی خۆرئاوا کە شوێنی گرنگەکانیان تەپەی (حاجی فەیرۆز) و تەپەی (جلبر) و تەپەی (ئاهرنجان) و (گۆی تەپە) و تەپەی (حەسەنلو) ئەمانە لەگەڵ ئەوانیتردا کۆنی ئەم هەرێمە دەرئەخەن کە لە کۆنەوە مرۆڤ تیایدا دانیشتووەو لە رووی فەرهەنگ و شارسانیەتیشەوە شێوە تایبەتی خۆیان هەبووە لە ناوچەکەدا.

ئەوەی بە دەستگەیشتووە لەو ئاسەوارانە لە کاتی کاری کنەو پشکنینی شوێنەواری نوسینێکە لەم هەرێمەدا نیشاندەدات کۆمەڵگای مرۆڤی دانیشتوو لەم ناوچەیەدا بەدرێژایی هەزارەی دووەم و یەکەمی پێش زایین ئەوە دەگەیەنێت کە دانیشتووانی جیا جیا لە بەرزاییەکانی ئێران و هەتاکو دەرەوەی ئەو بەرزاییەش پەیوەندی نێوانیان کۆیکردوونەتەوە.

بوونی فەرمانڕەوایەتی خورییەکان و لۆلۆییەکان و گوتییەکان لە مێژووی هەرێمەدا نیشانەیە بۆ پێشینەی مێژوویی و شارستانیەتی کۆنی ناوچەکە.

**خورییەکان:** ئەم قەومە لە نێوان کێوەکانی زاگرۆس و دەریاچەی ورمێ ژیاون. لە هەزارەی دووەمی بەر لە زایین بڵاوبوونەتەوە بە باکووری نێوان دوو رووبار و سوریا و تەواوی بەرزاییەکانی ئەرمەنستان و

خۆرئاوای ئازەربایجان. ناوی ئەم قەومانە لە نووسینەکەی (بۆغازکۆی) پێگەیشتووە کە بۆ چاخی پانزەیەمی بەر لە زایین دەگەڕێتەوە.

لۆلۆییەکان: بەشێکی زۆری ئەم قەومە بەشی سەرەوەی رووباری دیالە واتە (سیروان) تاوەکو دەریاچەی ورمیێ رووەو باکووری خۆرئاوا رۆیشتوون و داگیریانکردووە.

قەومی لۆلۆیی لە گەلانی ئاسیایی نەژاد بوون و لە ئیلامییەکانەوە نزیکبوون. لە پادشا ناسراوەکانی ئەم قەومە (ئانۆیانینی)یە (2000پ.ز) کە لە بەردێکی نووسراو لەسەر پێلّی زەهاو هەیە. ئەم قەومە لە ناوچەیەك لە باشووری خۆرئاوای دەریاچەی ورمیێ لە نووسینەکانی ئاشووری کە بەناوی زاموا هاتووە بۆ یادگاری دەسەلاّتیان هەبووە.

**گوتییەکان:** ناونیشانی گوتی، کوتی کە بۆ هەزارەی سێیەم و دووەم دەگەڕێتەوە بەم قەومەیان وتووە کە لە خۆرهەلاّت و باکووری خۆرئاوای لۆلۆییەکان جێگیربوون لەوانەیە لە ئازەربایجان و کوردستانیش ژیابن. ئەوانە لە هەزارەی سێیەمی پێش زایین لە کێوەکانی زاگرۆس دانیشتوون. گوتییەکان لە سالّی 2300ی پێش زایین لەگەلّ فەرمانڕەوایەتی (ئارامسین) پادشای ئەکەدی لەو شوێنە گەورەیە مێژوودا دەرکەوتوون.

خوێندنەوەو لێکۆلّینەوە لە هونەری مادو هاخامەنشی نیشانیدەدات مادەکان بەر لەوانە لەژێر کاریگەریێتی بابل و ئاشووردا بوون. بوونی دوو نەخشی بەرجەستەکراوی ئەم دوو قەومە لە خاکی (ماد)دا بە مانا نەخشی ئانۆبانینی پادشای لۆلۆییەکان لەسەر پێلّی زەهاو و نەخشی بەرجەستەکراوی هۆرێن شێخان لە هەمان ناوچە بەلّگەی راستی ئەم بەدواچوونەیە.

دوای ئەم گەلانە، قەومی (مانا) لەم خاکەدا فەرمانڕەوایەتییانکردووە. ئەمانە لە ناوچەی (زاموا) لە باشووری دەریاچەی ورمێدا جێگیر بوون و دەولّەتی گەورەی خۆیان لە خۆرئاوای ئێرانی ئەمڕۆ دروستکردووە. لە سالّنامەی ئاشوورییەکاندا ئەم قەومە و خاکی ئەوانە ناویان هاتووەو پایتەختەکەشیان شاری (زیرتو) یان (ئیزیرتو) بووە.

(ریس نیا) دەنووسیێ: (مانا) کۆنترین دەولّەتی باوەڕپێکراوە کە لە خاکی ئازەربایجاندا دامەزراوەو لێکۆلّەرانیش تێدەکۆشن بۆ دانانی سنووری رێژەیی قەلّەمڕەوی ئەو دروستکراوە.

ئەو بە گواستنەوەی بڕگەکە لە مامۆستا (سەعید نەفیسی) سنووری دەولّەتی (مانای) دیاریکردووە لە نێوان تەورێزو دەریاچەی ورمیێ لەلایەم، لەلایەکیتریشەوە کرماشانیش سنووردارێکردووە.

به قسەی عەبدولحسین زەرین کوب ناوچەکانی باشووری خۆرهەڵاتی دەریاچەی ورمێ تاوەکو سنووری خۆرئاوای (خەزەر) بەتایبەتی چواردەوری (مەراغە) تا نزیکی شاری (سەقز) و کوێستانەکانی (زیۆیە) کە ئاسەواری چاخی (مانا)ی تیادایە گرتوویەتەوە.

مرۆڤی (ئۆرارتۆ) یان ئارارات قەومێك بوون لە چاخی نۆیەمەوە تاوەکو حەوتەمی پێش زایین لە ئەرمەنستان و بەشێك لە ئەنادۆڵی خۆرهەڵات و ئازەربایجان و قەفقاز فەرمانڕەوایەتیانکردووە. ئۆرارتۆییەکان لەلایەك لەگەڵ قەومی (مانا) و لەلایەکیتر لەگەڵ ئاشوورییەکاندا لە شەڕو ململانێدابوون. سارجۆنی دووەم، پادشای ئاشوور لە ساڵی 713ی پێش زایین شکستییەکی گەورەی بە (ڕۆسای یەکەم) پادشای ئۆرارتو لە ئازەربایجاندا. لەو ڕۆژگارەشدا جارێکیتر گەیشتنەوە لوتکەی تواناو دەسەڵات.

مرۆڤی ئۆرارتۆ بە پێچەوانەی ئاشوورییەکان قەومێکی زیرەك و بەتواناو ئامادە باشبوون لە هەڵکەندنی کەناڵی ئاو و رووبارو کشتوکاڵ و گۆڕینی خاکی دێم بە بەراو. لەسەرو ئەمانەشەوە لە پیشەسازی کانزاییدا زۆر شارەزا بوون لە دنیای کۆندا. نەژادی ئەم قەومەش دیاری نییە. زبانیشیان نە سامییە و نە هیند و ئەوروپایی بەڵکو لە جۆرەکانی زمانەکانی ئاسیاییە بە مانا قەفقازییە و نووسینیشیان مێخییە هاوشێوەی نووسینی مێخی ئاشووری.

دەوڵەتی ئۆرارتۆ تا سنووری چاخێك دوای حکومەتی (ئارگیشتی دووەم) دەوامیکردووە. لە ساڵی 585ی پێش زایین تاوەکو زەمانێك کە لە نێوان کیاکساری پادشای مادو ئالییاتی پادشای لیدی لە کەناری رووباری (هالیس) لە شەڕدابوون ئەوانە مانەوە، دوانزە دەوڵەتی مادیش کەوتە شەڕو هێرش بردن بۆ سەر دەوڵەتی ئۆرارتۆ کە سەرچەنجام سوپای ماد توانی شاری (تشپا)ی پایتەختی ئۆرارتۆ بڕوخێنی و دەوڵەتی ئۆرارتۆش لەناو بەرێت. لە ساڵی 612ی پێش زایین لەکاتی سەرکەوتنی ماد بەسەر ئاسوورییەکاندا خاکی ئۆرارتۆ بەشێك بوو لە هەرێمی ماد.

گەلی ئۆرارتۆ لە ئازەربایجانی خۆرئاوا ئاسەواریان بەجێهێتووە لەوانە کێلێکی نووسراو بەناوی کێلە شین کە بە دوو زمانی ئاشووری و ئۆرارتۆیی نووسراوە، لەگەڵ بەردێکی نووسراویتر بەناوی (موانا) و هەردوو بەردە نووسراوەکەش لە مۆزەخانەی ورمێیە، لەگەڵ ئەمانەشدا ژمارەیەکی زیاد لە تەپەی کۆنیش هەن کە ئاسەواری چاخی ئۆرارتۆیان تیادایە.

کیشوەری ماد بە مادی گەورەو مادی بچووك دابەشبوو. مادی گەورە تەواوی رەی، عێراق و عەجەم تا سنووری کوردستان و کێوەکانی زاگرۆس رۆشتووەو مادی بچووکیش ئازەربایجانی گرتۆتەوە.

لە رۆژگاری داریۆشی سێیەم ((ئاترۆپات خشرەپوان)) مادی بچووك بووە. ئەم گەورە ئێرانییە لە شەڕی ((گوئوکامل)) ((گوگامیل)) کە لە نێوان داریۆشی سێیەم و ئەسکەندەر قەوما لە نزیکی هەولێر بە سەرکەوتنی ئەسکەندەر لەم شەڕەدا کۆتایی بە دەوڵەتی گەورەی هاخامەنشی هات. دوای شەڕەکە (ئاتروپات خشرەپوان) بە بەڵگەی بەهێزی و توانای لە تەرەف ئەسکەندەرەوە حکومەتی (ساتراپ)ی ماد دانراو (ئاترو پات)یش لەو رووەوە سەربەخۆیی راگەیاند.

لەمەوە دەگەینە ئەو ئەنجامە کە ئازەربایجان لە فارسی ناوەندا ((ئاتورپاتکان) بووەو لە ئاسەواری کۆنی فارسیشدا ((ئازەربادگان)) یان ((ئازەربایگان))ەو لە فارسیشدا ئازەربایجانە و لە یۆنانیشدا ((ئاترۆپاتنە)) لە بیزەنتیشدا ((ئازەربیگانوون))ەو لە ئەرمەنیشدا ((ئاتراپاتاکان))ەو لە سوورەییانیشدا ((ئازەربایغان))ەو لە عەرەبیشدا ئازەربایجانە.

ناوچەی ((ئاتورپاتکان)) بەدرێژایی سەردەمی حکومەتی سلوکی هەر سەربەخۆ بووەو یۆنانییەکانی جێنشینانی ئەسکەندەریش نەیانتوانی ئاداب و رێورەسمی شارستانیەتی یۆنانی لەو شوێنەدا بڵاوبکەنەوە. ئازەربایجانیش لەو رۆژگارەدا پەناگای زەردەشتییەکان بووە.

حکومەتی جێنشینانی ((ئاتورپات)) لە ئازەربایجان لە سەردەمی ئاشکانییەکاندا جارێکیتر درێژەیان بە فەرمانڕەوایەتییەکەیانداو ئەم ناوچەیەش توانی سەربەخۆیی خۆی بپارێزێت، سەرئەنجام (ئەردەشێری بابەکان) دامەزرێنەری بنەماڵەی ساسانی کە لە فەرمانڕەوایانی ئازەربایجانی بوو لە سەردەمیدا ئەو ناوچەیە سەربەخۆیی لەدەستدا.

ناوی ئازەربایجان: ئازەربایجان یەکێکە لە ناوە پڕ ئاوازەکان لە مێژووی ئێراندا. ناولێنانەکەی لە کۆنەوە سەرنجی زاناکانی بۆ لای خۆی راکێشاوەو تیۆری جۆراوجۆریان دەربارەی دەرخستنی ناوەکەی گوتووە.

بەپێی داستانەکانی خۆرهەڵات زەردەشت کە لە کتێبی (بەندەهشی ئاوێستا) پێمانگەیشتووە لە ئازەربایجانی خۆرئاوا لە دایکبووە و لەو رۆژگارەشدا بەو سەرزەمینەیان گوتووە ((ئێرانویج)).

ناوێکیتری ئازەربایجان ((ئازەرگوشەسب)) بووە کە ناوەکەی لە پەرستگا پیرۆزەکەی (ئازەرگوشەسب) وەرگیراوە کە دەکەوێتە شاری شیزی پایتەختی سلێمان کە ئاسەوارە مێژووییەکەی لە شاری (تکاب)ی پارێزگای ئازەربایجانی خۆرئاوایە.

ناوی گرنگیتری ئازەربایجان کە رەگ و ریشەی هەبێت ((ئاتورپاتگان))ە کە لە ((ئاتروپاتن)) ((ئاتروپات)) و ((ئازەرپات)) وەرگیراوە کە بە مانای پاسەوانی ئاگر دێت، کە نازناوی یەکێکە لە ساتراپەکانی هاخامەنشی و ناوی یەکێکیشە لە سەردارانی هاخامەنشی. دوای هاتنی ئەسکەندەر بەهۆکاری دوژمنکاری ناوی (ماد) لە شوێنی (ئاتروپاتگان) دانرا. ئازەربایجان لە فەرمانڕەوایەتی حکومەتی پەهلەوی یەکەمدا ساڵی 1311ی هەتاوی بەهۆی بەڵگەی گرنگی سیاسییەوە ناوچەکە دابەشبوو بە دوو یەکەی رامیاری کە یەکێکیان خۆرئاوای ئازەربایجان بوو کە بە ناوی خۆرئاوا ناسرا.

هەرێمی ئازەربایجانی خۆرئاوا خاوەنی چواردە شارو بیست و چوار شارۆچکە و ژمارەیەك گوندەو مەرکەزی هەرێمەکەش ورمێیە.

لە شارەکانی ئەم هەرێمە (شنۆ)، بۆکان)، (پیرانشا)، (تکاب)، (چاڵدێران)، (خوی)، و (سەردەشت)، (سەڵماس)، (شاهێندژ)، (ماکۆ)، (مەهاباد)، (میاندواو) و (نەغەدە).

لە قەڵا مێژووییەکانی هەرێمەکە: قەڵای بەردوك: دەکەوێتە ناوچەی سۆمای برادۆست، قەڵای کازم داشی لە رۆخی دەریاچەی ورمێیە، قەڵای ئیسماعیل ئاغا لە هەژدە کیلۆمەتری باکووری خۆرئاوای شاری ورمێەی، قەڵا شای پوشتو، لە دوورترین خاڵەکانی ئازەربایجانی خۆرئاوایە، قەڵای کچێ، سەر بە بەشی مەرکەزی شاری (خۆی)یە، قەڵای کۆرئۆغلی لە بەرزی کێوێکدایە دەڕوانێت بەسەر کاروانسەرای قتور، قەڵای کێوی پیر چاوەش لە حەڤدە کیلۆمەتری شاری سەڵماسە، قەڵای تەبت، لە کوێستانەکانی کوردنشینە کە بۆ هەزارەی یەکەمی بەر لە زایین دەگەڕێتەوە، لە باشووری خۆرهەڵاتی شاری بۆکانە، قەڵای ساری قورخان، لە 45 کیلۆمەتری خۆرئاوای شاری تکا بە لە پای کێوێك دروستکراوە، قەڵای کۆنی بستام، یەکێکە لە گەورەترین قەڵای کۆنی ئۆرارتۆییەکان. ئەم قەڵایە بەپێی نووسینەکەی رۆسای دووەمی پادشای ئۆرارتۆ لە نێوان ساڵەکانی 685-645 پێش زایین دروستکراوەو بەدرێژایی فەرمانڕەوایەتی سەلجوقی تاوەکو دەگاتەوە بە سەفەوییەکان سوودی لێبینراوە، تەختی بەڵقیس، لە کێوی بەڵقیس لە بەرزی دوو لوتکەی 3200 مەتری دروستکراوە،

دەکەوێتە دووری حەوت کیلۆمەتر و نیوی باکووری خۆرهەڵاتی تەختی سلێمان کە بۆ سەردەمی فەرمانڕەوایەتی ساسانییەکان دەگەڕێتەوە.

## لە گردە شوێنەوارییەکانی هەرێمەکە:

تەپەی حەسەنلو، لە رۆخی گوندێکدایە بەهەمان ناو، مێژووەکەی لە هەزارەی شەشەمی بەر لە زایینەوە دەستێدەکات هەتاکو دەگاتەوە دەربەندی سلدوز لە دوو کیلۆمەتری باشووری خۆرهەلاتی تەپەی (حەسەنلو)وە، کە بۆ هەزارەی شەشەمی بەر لە زایین دەگەرێتەوە، تەپەی دالما، ئەم تەپەیە دەکەوێتە باشووری خۆرئاوای دەریاچەی ورمێ کە مێژووەکەی پەیوەستە بە هەزارەی پێنجەم و چوارەمی پێش زایین، گۆی تەپە، دەکەوێتە سنووری شەش کیلۆمەتری باشووری خۆرهەلاتی شاری ورمێ، لەناو دەربەندێکدایە بە هەمان ناو، مێژووەکەی بۆ چاخی هەشتەمی پێش زایین دەگەرێتەوە، تەپەی هەفتوان، گەورەترینی تەپەکانی ناوچەکەیە، دەکەوێتە دووری (15) کیلۆمەتری باکووری خۆرئاوای دەریاچەی ورمێ، مێژووەکەی لە هەزارەی سێیەمی پێش زایین دەست پێدەکات تا دەگاتەوە بە چاخی ساسانی، تەپەی دێرینی قەلایچە، دەکەوێتە دووری دوانزە کیلۆمەتری باکووری حۆرهەلاتی شاری بۆکان، پاشماوەکانی بۆ هەزارەی یەکەمی بەر لە زایین دەگەرێتەوە.

لە تەپەکانیتری ئەم شارە (پیزدلی) کە بۆ هەزارەی چوارەم و سێیەمی پێش زایین دەگەرێتەوە، هەروەها تەپەی (دین خوا)، کە بۆ هەزارەی دووەم و یەکەمی پێش زایین دەگەرێتەوە، تەپەی (کورد لەر) کە بۆ هەزارەی چوارەم تا کۆتایی هەزارەی یەکەم دەگەرێتەوە، کۆمەلەی مێژوویی تەختی سلێمان، ئەم کۆمەلە ئاسەوارە دێرینە یەکێکە لە گرنگترین و ناودارترین مەرکەزەکانی مێژوو و شارستانیەتی ئێران و جیهان. تەختی سلێمان دەکەوێتە دووری 45 کیلۆمەتری باکووری خۆرهەلاتی (تکاب) لە شاری میاندواو. لای مێژوونووسان و لێکۆلەران پاشماوەکانی بۆ سەردەمەکانی ئەشکانی و ساسانی و ئیسلام دەگەرێتەوە شورای مێژوویيە کێوی زیندانی سلێمان،

ئەم پاشماوەیە دەکەوێتە دووری 5 کیلۆمەترلا تەختی سلێمان کە ئاسەواری بیناسازی هەزارەی یەکەمی پێش زایین لە خۆگرتووە، لەم کێوەدا سەرچاوەکانی ئاوی کانزایی بەرچاو دەکەون. شوورای مێژوویی (بەردەکونتە)، ئەم پاشماوەیە دەکەوێتە دووری 7 کیلۆمەتری شاری مەهاباد وادیارە گۆرستانێکی بەردین بوو بێت کە بۆ رۆژگاری (مانایی) بگەرێتەوە لە هەزارەی یەکەمی پێش زایین. جگە لەو شوێنەوارانەش لەناوچەکەدا کۆمەلێك بەردی نووسراو لە کێوەکان دۆزراونەتەوە کە بۆ سەردەمی دێرینەکان دەگەرێنەوە لەوانە: بەردە نووسراوەکەی (بستام)،

ئەم پاشماوەیە لە بالای قەلای بستامی شاری (خۆی) هەلکۆلراوەو نووسینی ئۆرارتۆیی لەسەرە کە بۆ (رۆسای کورى ئارگێشتی دووەم دەگەرێتەوە کە یەکێکە لە پادشاکانی ئەو قەومە: بەردە نووسراوەکەی

کێلە شین کە لە سەرە ڕێگای ڕواندز دانراوەو ئێستا لە مۆزەخانەی شنۆیە کە نووسینی مێخی ئاشووری و ئۆرارتۆیی لەسەرە. نووسینەکەی (عەینروم) ئەم پاشماوەیە دەکەوێتە دەربەندی قاسملو لە باشووری خۆرئاوای ورمی، یادگاری ناسراوی ئۆرارتۆییەکانە، نزیك ئاویَ:ە لە گوندی ئاق بلاّغ. نووسینەکەی پەیوەستە بە (منوا) (810-780پ.ز)، کوڕی ئیشپوونی (825-810 پ.ز)، نووسینەکە بەهۆی ئاو و سەرماوە بەشێکی کوژاوەتەوە. نووسینەکەی مەحموود ئاباد، ئەم پاشماوەیە دەکەوێتە نزیك شاری ورمیَ بۆ چاخی ئۆرارتۆ دەگەڕێتەوە، سەردەمی (ڕۆسا)ی پادشا. تەپەی موانا، ئەم پاشماوەیە دەکەوێتە بەشی (سیلوانا) لە دووری 35 کیلۆمەتری خۆرئاوای ورمیَ کە پەیوەستە بە هەزارەی یەکەمی پێش زایین،

لە نزیکی ئەم گردەوە بەردێکی نووسراو هەیە نووسینی مێخی ئۆرارتۆیی و ئاشووری لەسەرە کە پەیوەستە بە (ئورزانا)ی پادشای خاکی (مەساسیر)، بەردەکە نووسراوە کە ئێستا لە مۆزەخانەی ورمێیە. بەردە نەخشێنراوەکان (خڕەی هەنجیران) ئەم پاشماوەیە دەکەوێتە دووری 28 کیلۆمەتری باشووری شاری مەهاباد لە دەربەندێکدایە بەناوی (خڕەی هەنجیران). توخمی بەردەکان لە جۆری شیزن و لەسەر چەند بەردێك نیگار دەرهێنراوە کە بۆ هەزارەی سێیەمی پێش زایین دەگەڕێنەوەو نەخشەکانیش پێکهاتووە لە ئەسپ سوارو ڕاوی ئاژەڵ. نەخشێکی بەرجەستەکراوی بەردینی ساسانی کە دەکەوێتە دووری 16 کیلۆمەتری شاری سەڵماس، نەخشەکەش لە ڕووی بەردێك هەڵکۆڵراوە لە کێوی (پیرچاوەش)، لە نەخشەکەدا دوو سوار بەرچاو دەکەون، لەوانەیە یەکێکیان ئەردەشێری بابەکان پادشای ناوداری ساسانی بیَ و ئەوێتریان شاپوری یەکەم، هەر لە نەخشەکەدا دوو کەسیتر بەرچاو دەکەون لەوانەیە پادشای ڕەمەنستان و وەزیری گەورەی بێت، تیایدا (ئەردەشێر) ئەڵقەی تواناو دەسەڵات دەدات بە پادشای ئەرمەنستان.

## گۆڕە هەڵکۆڵراوە بەردینەکانی هەرێمەکە:

لە گۆڕە هەڵکۆڵراوە بەردینەکان، گۆڕی هەیوانی فەرهاد، ئەم پاشماوەیە ئۆرارتۆییە لە کێوی بەناو (سنگر) لە دووری 7 کیلۆمەتری شاری ماکۆ هەڵکۆڵراوە کە بۆ چاخی هەزارەی یەکەمی پێش زایین دەگەڕێـەوە. گۆرە بەردینەکەی (قارلیدام)، ئەم پاشماوەیە دەکەوێتە خۆرئاوای شاری ورمیَ لە بەرزاییەکانی خۆرئاوای گوندی (بەند) لە کێوی ناسراو بە (قارلیدا) دەرهێنراوە کە پەیوەستە بە هەزارەی یەکەمی پێش زایین. گۆڕە

بەردینەکەی (سدوك)، ئەم گۆڕە دەکەوێتە دووری 30 کیلۆمەتری باشووری شاری ورمێ، نزیك گوندی (خوڕە مئاباد)، شێوەکە لاکێشییە و لە بەردەمە لە بەرزیدا دەرهێنراوەو مرۆڤ بە گران دەتوانێت بیگاتێ.

گۆڕە بەردینەکەی (فەخریکا) ئەم گۆڕە دەکەوێتە دووری 15 کیلۆمەتری باکووری شاری مەهاباد و باشووری گوندی (ئاگریگاش) (ئیندەرقاش) لای شوێنەوارناسانی وەکو گیریشمەن بۆ ئەوە دەچن کە پەیوەستبێت بە شازادەیەکی (مانایی)، بەڵام (هێرزفیلد) و ئەوانیتر رایان وایە کە بۆ سەردەمی ماد بگەڕێتەوە.

## ئەشکەوتە دێرینەکانی هەرێمەکە:

لەوانە، ئەشکەوتی (قەڵاتاسیان)، دەکەوێتە نێوانی 20 کیلۆمەتری باکووری خۆرئاوای گوندی (قەڵاتاسیان) کە سەر بە شارۆچکەی (سەردەشت)ەو پاشماوەکانی بۆ چاخەکانی پارتی و ساسانی دەگەڕێتەوە.

ئەشکەوتی (تەمتەمە)، ئەم پاشماوە دێرینە دەکەوێتە دووری 18 کیلۆمەتری باشووری خۆرئاوای شاری ورمێ، ساڵی 1949ی زایینی پرۆفیسۆر (کارڵتوون کوون) کاری کنەو پشکنینی تیادا ئەنجامداو ئەو ئاسەوارانەی بەدەستیگەیشتن دەریئەخەن کۆنترینی ئەو شوێنانەیە کە مرۆڤ لە ناوچەی ئازەربایجانی خۆرئاوا تیایدا نیشتەجێ بووە لە چاخی بەردینی کۆندا.

سەرچاوە

لە کتێبی: یۆزربایجان غربی/

گرد اوری رچا حیدری/1988م وەرگیراوە.

# تیشکێك بۆ سەر تەپەی حەسەنلو

ئەم تەپەیە دەکەوێتە دووری 85 کیلۆمەتری باشووری ورمێ، لە ڕۆخی ئەو جادەیە دایە کە لە (ورمێ)وە دەڕوات بۆ (نەغەدە) و (شنۆ)، تەپەکەش لە دووری 3 کیلۆمەتری لای چەپی جادەکەی گرتووەو بەرێژەیەکیش بەرزەو کەوتووەتە ناو دەشتێکی سەوزو فراوان و دڵرفێنەوە. شوێنەواری ناوبراو بەناوی گوندەکەوە ناونراوە کە لە دامێنی (ئاش) دایە و بە (حەسەنلو) ناوی ڕۆشتووە. ئاوایییەکانی گوندی حەسەنلو ئەترافی دەشتی فراوانی ئەو شوێنەیان گرووە کە ئەمڕۆ بەناوی سولدوز ناسراوە، سنووری لای باکووری دەریاپەی (ورمێ) و زنجیرە کێوەکانی خۆرئاوای ئازەربایجانە و لە تەرەفی باشوور و خۆرئاواشیەوە شاخەکانی (لاهیجان) و (مەهاباد) دێن کە هەموویان گرتووەو بەشی خۆرهەڵاتیشی ڕووباری قادرچای گرتوویە لە دەشتی میاندواوی بڕاوی پارچە پارچەکراو بە شێوەیەك کە لە (3) لاوە باکوورو خۆرئاواو باشووری کێوەکانی زاگرۆس و دۆڵ و شێوەکانی دەشتی ناوبراو دەوریان داوە.

تەواوی دەشتی سولدوز ڕووبارێك بەناوی (گوار) ئاوی ئەدات کە لقێکی ڕەسەنە و سەرچاوەکەی لە شاخەکانی خۆرئاوادایە و دوای ئەوەی (شنۆ) و (نەغەدە) و بەشی باشووری (حەسەنلو) جەبڕێت بەرەو باکوور پێچ دەخواو لە ڕۆخی باشوور تێکەڵ بە دەریاچەی (ورمێ) دەبێت.

لە کۆتایی سنووری باکووری دەشتی (سولدوز) و دەریاچەی ورمێ بەرزایییەکان بە ڕێژەیەك کۆتاییان دێت پانییە فراوانەکەی لە چەند کیلۆمەترێك تێپەڕ ناکات. ڕێگای سەرەکی کە ئەم دەشتە بە خاڵەکانی باکوورەوە دەبەستێتەوە بە شاری ورمێ دەستپێدەکات کە دوای بڕینی ڕۆخی دەریاچەی (ورمێ) لە نزیك بەندەری بچکۆڵەی (حەیدەر ئاباد) دەبێت بە دوو بەشەوە.

جادەیەك بەلای چەپدا بەرەو لای باشووری خۆرهەڵات لار ئەبێتەوە بە (مەهاباد) ئەگات و جادەیەکیتریش بەلای ڕاستدا بەرەو لای باشووری خۆرئاوا دەڕوا،

دوای بڕینی بەرزایییەکانی ئاماژە دراو بەرەو دەشتی (سولدوز) بەرەو خوار دەبێتەوە ئەو ساڵە ڕۆشتنا بەردەوام دەبێت هەتاکو دەگاتەوە بە (نەغەدە) و (شنۆ) و خاڵی سنووری (خانە) و لەوێشەوە بەردەوام دەبێت.

دەریاچەی (ورمیٚ) قوڵیەکەی 15 مەترەو بەرزییەکەی لە روو دەریاوە هەزار مەترە، شوێنەکەی بووەتە هۆی گۆڕانکاری لە ئاو و هەوادا و ناوچەکانی (سولْدوز) و شوێنەکانیتری دراوسێی گرتووەتەوە کە کاریگەری ئەسازێنێت، شێکەی کە لە هەڵمی ئاوی دەریاچەکە دروستدەبێت هەواکەی ئەترافەکەی تەواو فێنك دەکاتەوە کە هۆکارە بۆ پێگەیاندنی دانەوێڵە لەو ناوچانەی چواردەوری.

جگە لە دەریاچەی (ورمیٚ) لە دەشتی (سولْدوز)دا، پاشماوەی دەریاچە و ئەستێرکیتریش هەن کە لە ئەترافەوە یەکدەگرنەوە، بەشێکی دەشتەکەش قامیش و زەل دایپۆشیوە،

لە زستانیشدا ئەستێرکیتر پەیدا ئەبن بەهۆی هاتنە خوارەوەی بەفر و باران، بەڵام لە هاویندا پاشماوەیان نامێنیٚ.

لە ئێستادا لە باکووری (حەسەنلو) دەریاچەی بچووك هەن کە درێژی و پانیان بە چەند کیلۆمەترێك دائەنرێن، ئەو دەریاچانە بە یەککگرتنەوەیان لەگەڵ دەریاچەی ورمێدا بەرەو تێکەڵبوونی لەسەرخۆ دەڕۆن، دەریاچەی ناوبراویش بەهۆی ئەوەی سێی تەواوی هەیە، زەویەکانی بۆ سامانی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕو ماڵان بەسوودە، بەو شێوەیە ئەو دەشتە پڕ کشتوکاڵ و لەوەڕگای فراوانە لە ناوچەکەدا بووەتە شوێنی چاوتێبڕینی گەلانی جیاجیای سەردەمە دێرینەکان بۆ ئەوەی دەستی بەسەردا بگرن.

### کورتە مێژوویەکی کنەو پشکنین لە (حەسەنلو) دا:

تەپەی (حەسەنلو) سەرەتا لەلایەن دەزگایەکی بازرگانی ئێرانی لە ساڵی 1313ی هەتاوی کاری کنەو پشکنینی تیایدا کرد هەروەها لە ساڵی 1315 لەلایەن (سێرئۆرل ئاشتین)ی ئینگلیزی چەندین کاری کنەو پشکنینی تیایدا کرد کە بە هۆیەوە بڕێیك پاشماوەی ئاسەواری دەستکەوت. لە ساڵی 1326 پکشنەرێکیتری بازرگان بە هاوکاری ئاغای (فەرهادی) کاری هەڵکۆڵینیان تیایدا ئەنجامدا، لەم کارەیاندا ئاغای مەحموودی کە موفەتیشی کارگێڕی و هونەری بوو هاوبەشی تیایدا کرد.

لە ساڵی 1338 لەلایەن بەڕێوەبەرێتی گشتی شوێنەوار بە سەرۆکایەتی ئاغای ئەندازیار عەلی حاکمی بەڕێ:ەوتن لەگەڵ ئاغای مەحموود مەئمووری هەڵکۆڵینی زانستی پێشوو لەم تەپە دێرینەدا دەستیان کردەوە بەکاری کنەو پشکنین بەو هۆیەوە هەندێك

کەلوپەلی ئاسەوارییان دۆزییەوە کە لە رۆژگاری ئەمرۆماندا لە هۆی مۆزەخانەی ئێرانی کۆن لە تاران دانراون. لە ساڵی 1334ی هەتاوی دەزگایەکی هاوبەشی ئێرانی و ئەمەریکایی بە سەرۆکایەتی (دایسۆن) لە تەپەی ناوبراودا سەرقاڵی کنەو پشکنین بوون، ئەم کارە بەردەوامی پێدرا هەتاکو دوو وەرزی هاوینی ساڵانی 49 و 51 کە شێوەیەکی زانستی لەخۆ گرت. سەرەتا کنەو پشکنینەکە لە بەشی سەرەوەی تەپەکەدا دەستی پێکرد لە چوار گۆشەیەکی 5x5 مەتر، دواتر بەهۆی خشتەیەکی ژمارەوە لەگەڵ پیتی ئەلف و بێی ئینگلیزی سوودیان لێ بینین بۆ کاری کنەو پشکنینەکە،

ئەوە بوو 26 پیتی ئینگایزی بۆ 26 شوێنی دیاریکراو لە کنەو پشکنینەکەدا دانران. بۆ جاری دووەمیش واتە لە دوو وەرزکەی دواوە ئەم پیتانە لە شوێنەکانیانا دووبارە بوونەوە، وەکو ئەلف ئەلف و ب ب و د د هەر یەکێکیش لەمانە بۆ چینێکی دەرهێنراو سەرچاوەی سوود وەرگرتن بوون. ئەمانە وردەکاری کنەو پشکنینەکە بوون بە هۆیانەوە لە هەر شوێنێك بووبێت دیاریکراوە. لە ساڵی یەکەمی کنەو پشکنینەکەدا دەگای هاوبەشەکەی ئێرانی و ئەمەریکایی لەو شوێنانەی کنەو پشکنینیان تیایدا کردبوو شوێ‌ی گونجاویان بەپێی بەرنامەیەك دانا بۆ ساڵەکانی داهاتوو، هەر لەو ساڵەشدا بوو کە بینایەکی سووتاو لە چینی چوارەمدا دەرکەوت کە لە رۆژگاری خۆیدا تیایدا نیشتەجێ بوون ئەمەش بەهۆی ئەو ئاگرەوە، بووە قۆناغێکی چەسپاو بۆ دیاریکردنی مێژووی چینەکە.

بۆ دیاریکردنی قۆناغەکانی نیشتەجێبوون لە تەپەی (حەسەنلو)دا دەزگای ناوبراو ناچار بە هەڵکەندنی بیرێك بوو لە بەشی خوارەوەی تەپەکەدا ئەوە بوو شوێنی هەڵکەندنی بیرەکە سەنتەری تەپەکەی گرتەوە کە قوڵیەکەی گەیشتە 17.5 مەتر کە پیتی (ب و د)ی بۆ دانراو لە هەڵکەندنەکەدا گەیشتنە زەوی رەقەنی و ئاوی تیادا دەرکەوت، سەرئەنجامی گشتی ئەوەی لەم کارەدا بەدەستهات:

1- **دە، چینی نیشتەجێبوونی جیاجیا دەرکەوتوو دیاریکرا.**

2- **گەورەیی لاکانی هەر چینێك لە ئەنجامی بەرزی تەپەکەدا زانرا هەتا خاکی رەقەنی دەرکەوت.**

3- **گۆزەو گڵێنە شارستانیەتەکانی هەر سەدەمێك دەستنیشانکران و ناسران.**

## شتە دیارەکاکانی تەپەکانی حەسەنلو:

بەپێی هێماکان و ئەو کنەو پشکنینانەی چەند جارێك لەم شوێنەوارانەدا کران ئەوە زانرا کە تەپەی مەرکەزی قەڵایەکی رەسەنەو کەوتووەتە ناوەڕاستی شارەکە و تەپەکانی دراوسێشی بەگشتی هەر لەو ناوچەیەدا بوون کە شوێنی نیشتەجێبوون بوون.

لەلایەکیترەوە هەتاکو ئێستاش لە ئەنجامی کاری کنەو پشکنین و گەڕان لەو ناوچەیەدا هێمای نووسین نەدۆزرایەوە تاوەکو بەهۆیەوە بزانین ناوی شوێنەواری ناوبراو و مێژووەکەی بە چەند سەردەمدا رۆشتووە بۆ ئەوەی لە دامێنی تەپەی (حەسەنلو) هەڵکەنرا ئەنجامی خۆی وەرنەگرت تاوەکو بتوانین بەهۆیەوە بنەماکانی بینا لە سەردەمە جیاجیاکاندا دیاریبکەین.

بەڵام بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین دەشتی (حەسەنلو) لە ناوەڕاستی هەزارەی دووەمی بەر لە زایینەوە گەلان بەرەو ناوچەکە کۆچیانکردووە و تیایدا نیشتەجێبوون و هەتاکو سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زایین ماونەتەوە کە هاوکاتە لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتی ماد، ئەو شوێنەش واتە (حەسەنلو) لە دانیشتوان چۆڵ نەبووە بەپێی ئەو پاشماوانەی کە دۆزراونەتەوە، وەکو وەرشاو و ئاسن و گۆزەو گلێنەی بۆیەکراو هەموو ئەو دۆزراوانەش هاوسەردەمی ئەو رۆژگارەن کە ئەنجامی کنەو پشکنینەکە هۆکارە بۆ بوونی بینای گەورە بۆیە ئەوە زانراوەو روون بووەتەوە کە ئەم شارە لە رێگای گەلانی هێرشبەر بۆ سەر ناوچەکە وێرانبووە کە لەوانەیە ئاشوورییەکان بووبن یان گەلانیتر کە ماوەیەك لە ئەترافی تەپەی مەرکەزی دانیشتبن و بەو بەردە چاك کراوانەش کاریان مەیسەر بوویێت و هەتاکو لەو نەخش و نیگارە بەرجەستەکراوانەش کە لە تەپەی مەرکەزی و تەپەکانی دەوروبەری دۆزارنەوە لەوانەیە سوودیان لێدیبێن.

تەپەی مەرکەزی کە قەڵایەکی لەسەر دروستکراوە هەتاکو بەرزاییەکی دیاریکراوی بە (موور) (قوڕ) دیوارەکانی بەرزکراون و لەسەر شێوەیەکی خڕ هاتوونەتەوەو پاشماوەی هێمایەکیش کە لە رووە سافەکەی دەرەوەیدا بەرچاو دەکەوێت بەمجۆرەیە: قەڵاکە لە ناوەڕاستی تەپەکەدایە و شێوەیەکی گەورەی وەرگرتووەو بە چوار لایا چوار قولەیتر هەن بچووکترن و دروستکراون دابەشبوون لە شوێنی جیاجیادا، ئەمانە لە قەڵاکە بەرێژەیەك نزمترن کە دیاریکراون. پاشماوەیەك کە لێرەدا بەرچاو دەکەوێت پێکهاتووە لە تەختە بەردی گەورە کە لە ژێر خاکدا ماونەتەوەو بەرچاو دەکەون، لای باشووری ڕاڕەوی قەڵاکەی گرتووە بە

پانی نیو مەتر ئەوانەی لە پاشماوەی دوو تەپەی سەرەوەدا لە ئەنجامی کنەو پشکنیندا دەرکەوتن دیواربوون بە خشتی گەورەی شەش پالّووی لاکێشی دروستکرابوون کە بالّ'کانی لە سنووری (30x16x10) سانتیمەتر بوون و بەستنەوەی خشتەکانیش بەگیراوی گلّ و لم و کابوو. شوێنی قەلاّکەش لە ناوەڕاستی تەپەکەدا بەگشتی دەرکەوت کە زووتر نزماییەك بووە و بە گلّ پڕکراوەتەوەو دواتر چواردەورەکەی چوار تەپەیتری دراوسێی لێکەوتووەتەوە.

لە رووی پاشماوەی ئاسەواری و کەلوپەلێك کە لە چینە جیاجیاکانیدا لە (حەسەنلو) دۆزرابنەوەو کۆکرابنەوە دەتوانین بەهۆیانەوە (3) سەردەم لەو شوێنەوارەدا دیاریبکەین.

1- سەردەمێك کە تەپەی مەرکەزی نەبووەو گەلانێك کە لەویّ نیشتەجیبّوون خاوەنی شارستانیەتێکی بەرزبوون.

2- سەردەمێك کە تەپەی مەرکەزی ئاوەدان بووەو کۆمەلّگای پێشتری بەخۆوە دیوەو یەکێك بووە لە خالّە ئاوەدانەکانی ئەو سەردەمە کە لەو شوێنەدا دامەزراوەو شارستانیەتێکی ئاوەدانی مرۆڤ بووە لە ناوچەکەداو ئەو سەردەمەش تەپەکە بەرزتر بووە کە گەلانی دانیشتووی سەرتایی بینایان تیایدا کردووە.

3- ئەو شوێنەی کە بینای رەسەنی شارو تەپەی مەرکەزییەکەی لێیە، سەرئەنجام هێرشی گەلانیتر کە لەوانەیە ئاشوورییەکان یان سکاکان بووبن رووخاندوویانە و وێرانیان کردووە، بەلاّم ئەوەی لێرە لەناوچووە، لە تەپەکانی دراوسێیدا تاماوەیەك دانیشتن بەردەوامی هەبووەو دانیشتنەکەش پەیوەندی بە چوار تەپەی دراوسێیەوە هەبووە کە دەتوانین بلّێین ئەمە ئەو گومانە دەڕەوێنێتەوە کە چوار تەپەی بچکۆلّە لەسەر وێرانەی چوار قولەی گۆشەکانی قەلاّکە دروستبووبن بۆ دانانی شوێنی رەسەنی کە لە ئەنجامدا وێران بووەو بە رۆیشتنی رۆژگارەکەش بە دەرنەبووە لە هەلّکەندن.

دوو تەپەی ئەلف و بیّ کە، لە لانا سەرەکییەکانیایە بە مانا باکووری خۆرئاوای و باشووری خۆرئاوای بڕیاری لە دروستکردنیان دراوە بۆ کردنەوەی شوێنی دوو قولەیتر ئەوەش لە رێگای تیرێك بووەە کە بەرەو رووی نەخشەکە بووەتەوەو بەهۆیەوە دەتوانین سنووری شوێنەکەی دیاریبکەین. لە پاشماوەی ئاسەواری دەرکەوتووی ناوبراوی سەرەوەدا دەتوانین بەو جۆرە ئەنجام وەربگرین کە شوێنی تەپەی مەرکەزی نزمبووەو دیواری قەلاّکە و تەپەکانی ئەترافیشی لەو چوار قولەیەی کە قەلاّکەی لەخۆ گرتووە لە شوێنە نزمەکەیەوە بۆ ئاوەکە چوون کە سەرچاوەیەکی پێویستی دانیشتوانەکە بووە بێئەوەی بیری ئاو هەلّبکەنن، جارێکیتریش ئەو

خشتانەی کە لە ئەترافی تەپەی مەرکەزی بەرچاو دەکەون و بەشێوەیەکی جوان ڕێکخراون لەوانەیە پاشماوەی ڕەسەنی دیواری بیناکەی سەرەوە بووبن.

### قۆناغەکانی نیشتەجێبوون لە (حەسەنلو)دا:

بە باوەڕی دکتۆر دایسۆن سەرۆکی تیمی هاوبەشی ئێرانی و ئەمەریکایی، دە سردەمی نیشتەجێبوونی جیاجیا لە تەپەی حەسەنلودا لە کۆنەوە بۆ نوێ هەبوون بە مانا سەردەمی دەیەم کە هەر کۆنەکەیەتی دەسپێکردنی یەکەمەو دوا سەردەمیشی یەکەمە و کۆتایی دێت بە مانا لە کۆنەوە بۆ نوێ سەردەمەکان هاتوونەتەوە.

(دایسۆن) مێژەی مەزەندەی نیشتەجێبوون کە لە قۆناغی دەیەمەوە دایناوە دەیباتەوە بۆ (6) هەزار ساڵ و (3) هەزار ساڵ پێش زایین دایناون. لێرەدا وانیشانیداوە لەسەر (3) سەردەمی دەیەم و نۆیەم و هەشتەم زانیاری تەواوی لەسەریان نییە، بەڵام بۆ سەردەمەکانی حەوتەم تاوەکو یەکەم زانیاری پێشووتری لەسەریان هەبووە. لەم سەردەمانەدا بیناکانیان لە خشت و قوڕ و بەرد دروستکراون. لە ئەنجامی کنەو پشکنینەکانی ساڵانی 1349 و 1351 ئەوە دەرکەوت لە سەردەمی چوارەمدا نیشتەجێ بوون لە(حەسەنلو) هاوکات بووە لەگەڵ ڕوودانی کەوتنەوەی ئاگرە گەورەکە تاوەکو سەردەمی حەوتەم واتە (2200 ساڵ بەر لە ئاگرکەوتنەوەکە). بەو پێیە سەردەمی حەوتەم لە نێوان (2500 تا 3000 پێش زایین) بووە کە سوودیان بینیوە لە ئامێرەکانی ئاسن، سەردەمی شەشەمیش لە نێوان (2000) تاوەکو (2500) بەر لە زایینەو سەردەمی پێنجەمیش دەتوانین بە (1300) ساڵی بەر لە زایین دایبنێین. لە سەردەمی پێنجەمدا نیشتەجێبوون لە (حەسەنلو)دا قاپ و قاپاخی گڵێنەیی ڕەنگ خۆڵەمێشی دەرخست، بەڵام ئەو گەلانەی کە ئەوانەیان دروستکردووە نەزانراوە کێن یان لە کام ناوچەوە هاتوون.

لە سەردەمی پێنجەمدا ئەوانەی نیشتەجێبوون لە حەسەنلودا بیناکانیان لە خشت و قوڕ دروستکردوە. لە سەردەمی چوارەمیشدا کە بۆ نێوان 1300 تا 800ی پێش زایین دەڕوات بە مانا هەمان سەردەمی ئاگرکەوتنەوە گەورەکەیە کە لاکانی سووتاوە، بە مەزندەش ماوەی (500) ساڵ ئەوانەی نیشتەجێبوون تیایدا ماونەتەوە.

سەردەمی سێیەمی نیشتەجێبوونیش لە تەپەی حەسەنلودا سەردەمی مادەکان و کەمێك بەر لەوانیشەوە جارێکیتر ئەم سەردەمە نیوەی دەچێتەوە ناو سەردەمی فەرمانڕەوایەتی هاخامەنشییەکان، سەردەمەکەش دەبێت بە دوو بەشەوە 3A و 3B، یەکەمیان کۆنترە لە سەردەمی 3B. سەردەمی دووەم نیوەی هاوکاتە لەگەڵ دەسەڵاتی هاخامەنشی و پارتی و نیوەکەیتریشی دەچێتوە ناو سەردەمی ساسانی. سەردەمی یەکەم کە

لە ناوەڕۆکدا بەزۆری لاوازە هەمووی کۆتایی ڕۆژگاری دەسەڵاتی ساسانی و سەرەتای دەرکەوتنی ئیسلام دەگرێتەوە بۆ ئەوەش پاشماوەیەك لەبەردەستدا نییە و بەگشتی پاشماوەی ئەو ڕۆژگارەش لەناوچووە.

گرنگترین سەردەمی نیشتەجێبوون هەمان سەردەمی چوارەمەو ئەوەی کە هەیە لە بینا لەم سەردەمەدا توێژینەوەی لەسەر ئەکەین: بەگشتی ئەو بینایانەی کە هەم لە حەسەنلو و بە بەرد دروستکراون پەیوەستن بە سەردەمی نیشتەجێبوونی چوارەم (ئەگەر چ کەمێکیش لەوانەی سەردەمی پێنجەمیش تیایاندایە بەرد لە دروستکردنیانا بەکارهێنرابێت) تیمی کنەو پشکنینەکە لە ساڵ'کانی دواییدا توانییان ژووری زۆرو هۆڵی گەورە لە مەرکەزی تەپەکەدا بدۆزنەوە، لەگەڵ دۆزینەوەی دیواری بەرگری قەڵا نیزامییەکە کە دژێکی تووندو قایمی شارەکە بووەو لەژێر خاك دەریان هێناوە. دەرکەوتووەکانی ئەم دواییەی شوێنەوارەکە کە لە بەردەستدان بە (3) پەریتگای گەورەی کۆڵەکەدار دیاریکراون کە حەتمەن ڕێوڕەسمی مەزەبی لە هەر یەکێك لەوانەدا کراوە. ئەوەی لەبەرچاوە ئەم (3) بینا کۆڵەکەدارە گەورەیەی باشوور و خۆرئاوایە کە دروستکراون وادیارن بۆ گەنجینەی ئازوقەبووبن یا وەکو بۆ تەویلەی ئەسپەکان، دواتری گۆڕیویانن دوای ئەوەی هۆڵی سێیەمی خۆرئاوای کۆڵەکەداریان دروستکردووە لە هاوشێوەی ئەوانیتر.

بەڵگەکان بۆ ئەوە دەچن بەپێی ئەنجامی کنەو پشکنین کە لەبەردەستدان کە هەر (3) بینای کۆڵ'کەداری ناوبراو مەرکەزێکی مەزەبی بووبن یان پەرستگایەك کە بۆ تەشریفاتی تایبەتی دروستیانکردبن.

دەروازەو دیواری بەرگری قەڵای حەسەنلو: دیواری قەڵا بە ئەستووری 3 مەتر و بەرزی 7 مەتر دروستکراوەو لە کۆتایی ئەم دیوارانەدا قولە چوارگۆشە لە نێوانی 30 مەتری دیوارەکاندا بە درێژی 10*10 مەتر دروستکراون. بەرزی قولەکان تەواو نەزانراوە کە چەند مەتر بووە، بەڵام لەوانەشە لە (7) مەتر بڵندتر بووبن، لە دیواری قەڵاکەدا و بە ئەژمارکردنی هەر 30 مەترێك قولەیەك بە مەزندە هەبووە، شوێنی حەوت قولەش رووی دیواری بەرگرییەکەی داپۆشیوە.

قولەکان لە ناوەوە (3) مەتر پانییا هەبووەو لە دەرەوەدا بوونەتە (5) مەترو دروستکراون. ئەم قولانە بۆ پارێزگاری لە قەڵاکە سوودیان لێبینیون.

لە هەڵکۆڵینی بەشێك لە دیواری قەڵاو چەند قولەیەکیدا ئەتوانین ئەنجامەکەی بەو جۆرە وەربگرین کە دیواری قەڵاکەو قولەکانی لە قۆناغی سێیەمی نیشتەجێبووندا دروستکراون، بەڵام ئەو دروستکراوانە لەگەڵ قۆناغی چوارەمدا دیاوازییان هەبووە، بەڵام

دوای سوتاندنی بە ئاگر و روخاندن و وێرانبوون و تێکەڵاوبوونی دیوارەکانی بەشێك لە قولەکانی قەڵاکە، واتە دیوارو قولەکان لە نوێوە دروستکراونەتەوە، بەڵام لە نویَ بوونەوەیاندا دیوارەکان گۆڕانکارییان بەسەردا هاتووە.

## حەوشەی مەرکەزی و بیناکانی چواردەوری:

لەناو ئەم قەڵایەدا حەوشەیەکی مەرکەزی گەورە هەیە بە درێژی 29 مەترو پانی 19 مەتر. هەڵبەتە درێژی و پانی ئەم حەشەیە لە هەموو لاکانییەوە یەکسان نەبووەو حەوشەەش بە مەزندە شێوەیەکی ناڕێکی وەرگرتووە. بەشێوەیەك کە لە باکوورترین بەشی پانییەکەیدا دەگاتە 21 مەتر.
لە کۆتایی باشووری حەوشە مەرکەزییەکەدا سەکۆی قوربانی هەیە و چەند کۆڵەکەیەکی بەردینی بڵند بە نێوانی چەند مەترێك لە یەکترەوە دوورن بە بەرزی 3 مەتر یان زیاتر دەوریان داوەو لەوحەی بەردینیش بۆ یادگار بە دیواری باکووری حەوشەکەدا ریزکراون، بەڵام تیایاندا نووسین نەبینراوە.
لە دوو رووی باکوور و خۆرئاوای حەوشەی مەرکەزیدا هەروەکو ئاماژەمدا سەکۆ بەردینەکە بە بەرزی (60) تا (70) سانتیمەتر بە مەزندەو پانی (120) تا (230) سانتیمەتر دروستکراوەو بە بەردی تەختیش فەرشکراوە. دوور بە دوور لەناو دیوارەکانی مەرکەزیدا ژووری بچکۆڵە و گەورەو بینای کۆڵەکەدار هەن بۆ دانیشتوانی ناوخۆی دروستکراون. هەموو ئەوانەش پێدەچێت هاوتەمەنی قولەکان بن کە لە شوێنی خۆیاندا دەبینرێن.

## بیناکانی لای خۆرهەڵاتی حەوشەی مەرکەزی:

لە باشووری خۆرهەڵاتی حەوشەی مەرکەزیدا تەلارێکی گەورە لەگەڵ چەند مەخزەنێك هەن. لەم تەلارەدا بڕێکی زیاد لە کوپەی گەورەی تیایدایە بۆ سەرچاوەی سوودوەرگرتن لەمانە نەزانراوە کە ئایە بۆ کۆکردنەوەی ئابوون یان شەڕاب، بەڵام بەهۆی ئەوەی کە ئەم قەڵایە دژێکی سەربازی بووە لەوانەیە بۆ کۆکردنەوەی ئاو بووبن کە رۆژانە پێویستیان هەبووە نەوەکو قەڵاکە گەمارۆ بدرێت.

لە باکووری هەمان ئەم مەخزەنانەوە، کۆنترین و یەکەمین تەلاری گەورەی کۆڵەکەدار شوێنی خۆی گرتووە. کە دەچێتە ناو ئەم تەلارە گەورە کۆڵەکەدارەوە هەمان ئەو مەخزەنانە جارێکیتر لە ناو حەوشەی مەرکەزییەکەیدا هەن. ئەم تەلارە درێژی و پانی 16*4 مەترە، بەڵام بەشی باشووری خۆرهەڵاتی هەڵکۆڵینی تەواوی تیادا نەکراوە، لەناو ئەم تەلارەدا دوو ریز کۆڵەکە هەن کە نێوانی کۆڵەکەیەك بۆ ئەویتر (5) مەترە. لە رۆخی دیوارەکەدا جارێکیتر شوێنی کۆڵەکەی تەختە لەجیاتی کۆڵەکەی بەرد ئەبینرێت.

لە باشووری هەمان ئەم تەلارەدا شوێنی میحراب یان (موبد) دیارە. لەناو یا ئێسکبەندی (2) ئەسپ بەرچاو دەکەون کە (5) سانتیمەتر لە یەکترەوە دوورن و کەوتوونەتە لای خۆرهەڵاتی مەرکەزی تەلارەکە. ئەم تەلارە دوای تەلاری دووەمی کۆڵەکە دار دێت کە باشووری مەرکەزی گرتووە، بەڵام سوودی لێنەبینراوە. بەڵکو بۆ لایەنی پاسەوانی ئەسپەکان بووە، کە دەچنەوە ناو ژوورەکان، وادروستکراون رێگایان هەبێ بچنەوە ناو یەکتری، لێرەشدا چەند ژوورێکی بچووك و گەورەش دۆزرایەوە کە بەشی باکووری خۆرهەڵاتی حەوشەی مەرکەزیان گرتووە.

بیناکانی باشووری حەوشەی مەرکەزی: لە باشووری حەوشەی مەرکەزیدا بینایەکی گەورە هەیە ژوورەو باڵەخانەی زۆری تیادا کۆبووەتەوەو بەهۆی کاری کنەو پشکنینەوە دەرکەوت، بینای گرنگی ئەم بەشەیە کە لە ناو ئەم تەلارە کۆڵەکەدارە گەورەدایە و ناونیشانی پەرستگایان داوەتێ بە مانا دوای بەجێهێشتنی یەکەمین و کۆنترین تەلاری کۆڵەکەداری خۆرهەڵات بۆ ئەوە سوودیان لێ بینیووە.

ئەم تەلارە گەورەیە باڵەکانی 30.24*18.5 مەتر بووەو (8) کۆڵەکەی هەبووە لە ناوەڕاستدا کۆڵەکەیتریش لە ئەترافی تەلارەکەداو لە رۆخی دیوارەکانیا هەبووە.

هەموو ئەو کۆڵەکانەش تەختە بوون و بنمیچی ئەو تەلارەیان راگرتووە کە لە تەختە بووە بۆ ئەوەی نەکەوێت. ئەم تەلارە لەکاتی خۆیدا یەك نهۆم نەبووەو بەرزییەکەی لە تەختی زەوییەکەیەوە تاوەکو بنمیچەکەی (7) مەتر بووە، لەکاتێکدا بیناکانی ئەترافی ئەم تەلارە دوو نهۆم بوون و بڵندی ئەویان بۆ بنمیچەکەی 3.5 مەتر بووە. ئەم تەلارەش پشتی داوە بە ژوورەکانی ئەترافییەوەو لە رووبەرێکی یەکساندا شێوە دیاری خۆی وەرگرتووە. لەناو ئەم تەلارە کۆڵەکەدارەدا پەرستگایەکی گەورە هەیە لە دووری 3.5 مەتر دایە و دەکەوێتە باکووریەوەو باڵی سەکۆکەی 3*2 مەتری بۆ

دانراوە. لەسەر سەکۆکەی شەمعەدان و چرا داگیرساون بۆ رووناك کردنەوەی پەرستگاکە دانراون. بەڵگەش بۆ ئەمە قوربانییە کە لەسەر ئەو سەکۆیە کراوەو دابەشکراوە. لە تەرەفی باشووری تەلارەکەدا کە بە تەواوی ناوەڕاستی باڵی باشووری گرتووە، شوێنێك هەیە هاوشێوەی میحرابە کە بەڵگەیە بۆ شوێنی دانیشتنی (موبد)ی گەورە کە رێگایەکی هەبووە گەیاندوویەتی بە ژوورە بچکۆڵەکانی پشتی پەرستگاکەوە (لە باڵی باشووری). پێدەچێت هەمان ئەو ژوورە بچکۆلانە شوێنی گۆڕینی جلکی رۆحانییە (موبدەکە) بووبێت یان شوێنی تایبەتی خۆی بووە.

لە بەشی باکووری خۆرهەڵاتی پەرستگاکەدا شوێنی ئاگری پیرۆز هەیە کە لەکاتی رێوڕەسمدا پێدەچێت ئاگرەکە ناو پەرستگاکەی رووناك کردبێتەوە. لە گۆشەی باشووری خۆرئاوای پەرستگاکەشدا سەرچاوەی ئاگریتر هەن کە پێکهاتوون لە وەجاخی شێوە لاکێشی.

لەنێوان کۆڵەکەکانی ئەم تەلارەداو لە بەشی باکووری خۆرئاوایدا لەکاتی هاتنە ناوەوەدا رێگا هەیە بە پانی 1.20 مەترەو دەگاتەوە بە ژوورەکانی ئەترافی تەلارەکە. لای باکووری پەرستگاکە و لە دوولای دەروازەی باکووری، کۆشکێکی گەورەی کۆڵەکەدار هەیە کە لە دوو تەلاریتر نوێترە. ژوورەکانی بەباشی رووبەڕووی یەکتر بوونەتەوە کە جامی ئاڵتوون تیایانا دۆزرایەوە.

### بیناکانی خۆرئاوای حەوشەی مەرکەزی:

لە گۆشەی باشووری خۆرئاوای حەوشەی مەرکەزی نزیك بە سەکۆی قوربانی رێگایەك هەیە دەگاتەوە بە پێشەوەی تەلارە گەورە کۆڵەکەدارەکە (پەرستگا) و جارێکیتر، لە نزیك هەمان ئەو رێگایەوە راڕەوێکی بڵند و باریك دەبینین کە کۆتایی دێت بە سێیەمین تەلاری کۆڵەکەداری خۆرئاوا (نوێترین تەلار). لە باڵی باکووری هەمان ئەو راڕەوەدا نزیك بە سێیەمین تەلاری کۆڵەکەدار لە ژوورێکی بچکۆڵەدا جامی ئاڵتوونی حەسەنلو لە 1338 دۆزرایەوە، لە بەشی خۆرئاوای حەوشەی مەرکەزیدا رێگایەکی گەورە هەیە لەناوەوە دەگاتەوە بە ژوورەکانی خۆرئاوای حەوشەی مەرکەزی و تەلارە گەورەکان کە ژووری زۆر تیادایە و ئەوەی هەیە جارێکیتر لەگەڵیانا یەکدەگرێتەوە. ئەمانە لە 15 ژووری بچکۆڵە و گەورە پێکهاتوون و لەسەر ئەو رێگایەن و پەیوەندییان بە یەکترەوە هەیە یەکێك لەو بینایانە رووی لە خۆرئاوای قەڵاوەیەو لە باشووریشەوە بە رێگایەکی باریکەوەو لە باکووریشەوە بە رێگایەکیترەوە دەیبینین. ئەم قەڵایە لەکاتی ئاوەدانیدا رێگاکەی لەوێوە رۆشتووەو تاك رێگای ناوەوەش بووە بۆ لای خۆرئاوای قەڵاو دەروازەی بەرگرییەکەی رۆشتووە.

یەکێك لەو بینایانە کە بەرووی باکووردایە خاوەنی ڕێگایەکی گەورەی ناوەوەیە کە بە ڕێگای پلیکانەی درێژ ناوزەد کراوە بە درێژی 9 تاوەکو 11 مەتر کە بە ناو ڕاڕەوە بڵندەکەدا دەڕوات،

درێژی 22 و پانی 9 مەترە و ڕێگاکە دەگاتەوە بە بیناکەی ناوەوە. ئەم ڕاڕەوە خاوەنی دوو دەروازەی خۆرئاواو خۆرهەلات بووە کە نێوانی هەردوو دەروازەکە 16.5 مەترە. ڕێگایەکیتر لە تەرەفی باشووری کە ڕاڕەوێکی باریکە لەگەڵ بنغەیەکی بچووکدا لە خۆرئاوادا یەکدەگرێتەوە کە درێژییەکەی 14.60 و پانی 3.40 مەترەو ئەمەش ڕێگایەکە لە ناوەوە دەگاتەوە بە تەلاری گەورەی کۆڵەکەداری خۆرئاوای سێیەم کە پانییەکەی 2 مەترە.

سێیەمین تەلاری کۆڵەکەداری خۆرئاوا کە لە باکووری خۆرئاوای تەلاری گەورەی دووەمی باشوور دایە نێوانێکیان هەیە. لە ڕاستیدا ئەم تەلارە شێوەکەی دەچێتەوە سەر بیناکانی سەردەمی ماد یان هاخامەنشی چونکە کۆڵەکەکانی یەکپارچەن و لە بەرد دروستکراون، تەلاری ناوبراویش باڵەکانی 15.60*15 مەترەو شێوەکەی چوارگۆشەیە. پانی دەروازەکەی بە سنووری 2 مەترەو نێوانی ئەم تەلارە تاوەکو دیواری بەرگری قەڵا 3.90 مەترەو لە بەشی باکووری خۆرهەڵاتی یا پەرستگایەکی ئاگر هەیە کە شوێنی ئەنجامدانی مەراسیمی مەزەبی یان شوێنی (موبد) بووەو کەوتووەتە چەقی تەلارەکەوە.

## بیناکانی باکووری حەوشەی مەرکەزی:

لە بەشی باکووری حەوشەی مەرکەزیدا بینایتر هەن. کۆمەڵێك ژوورن کە پانزە دەرگایان هەیە پێدەچێت شوێنی پاسەوانی گەورە ژنانی کۆشك بووبن کە خاوەنی کەنیزەو خزمەتکار بوون لەناو قەڵادا.

ئەوەی کە باسمانکرد دەتوانین بە مەزندە لە مێژووی بیناسازیدا چینەکانی (3) ئەلف و (4)ی حەسەنلوی لە نەخشەکەدا بۆ دابنێین: بینا رووخاوەکانیش لەم شوێنەدا سەرلەنوێ لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەین کە نوێترین سەردەم ئاسنە بۆی کە لە (1500) ساڵی پێش زایین دەستی پێکردووەو لە هەمان سەردەمی حەسەنلوی (5) کە لە ژێر بینا شوێنەواریەکاندایە شوێنی خۆیگرتووەو سەردەمەکەی لە سەدەی دوانزەوە تا نۆی پێش زایین ڕۆیشتووە کە بە سەردەمی (6) ناسراوە. دوا وەرزی کنەو پشکنین لە حەسەنلو دەریئەخات کە چینی (6) دەتوانین دابەشیبکەین بەسەر سەردەمی (6 – 5) کە پەیوەستە بە چاخی 12ی پێش زایین، ئەو قۆناغەش بە سەدەی 11 و 9 مێژووەکەی

تەواودەبێت کە مێژووی سەردەمی (2)ی شوێنەوارەکەیە و کۆتایی هاتن و سووتاندنیەتی بە ئاگرەکە.

دوای ئەو سەردەمەی (6ب) دێ کە بیناکانی بۆ کۆتایی سەدەی 9ی پێش زایین دەگەڕێتەوە، لە سەردەمی (6ئەلف)یشدا ژمارەیەکی کەم لە دانیشتوانی تیادابووەو ماوەتەوە تا ئەو کاتەی گەیشتووەتە دەستی ئۆرارتۆییەکان لە سەدەی هەشتەمی پێش زایین کە خاکی ئەترافی دەریاچەی ورمێ و بەشی خۆرهەڵاتی ئاسیای بچکۆڵەیان داگیرکردووەو شوێنەواری ناوبراویشیان سووتاندووەو لەناوچووە.

**تەلارسازی سەردەمی ماد:**

دوای دامەزراندنی ئیمپڕاتۆریەتی مادو دەرکەوتنی سیستەمی فەرمانڕەوایەتیان حکومەتەکەیان کە لە راستیدا بە یەککگرتنی هەموو عەشیرەتەکانی خاکی ژێر نفووسی مادەکان هاتە گۆڕێ. لێرەوە فراوانی و پێشکەوتنێك لەسەر چاوەکەدا لە هەموو بوارەکانی هونەردا بەتایبەتی هونەری بیناسازی و هەڵکۆڵینی گۆڕە بەردینەکانیا نو ئارامگاکانیاندا لە دامێنی کێوەکانداو گابەردەکاندا دروست بووە دەتوانین چاومان پێیان بکەوێت.

ئەو گۆڕە هەڵکۆڵراوە بەردینەی کە لە باکووری خۆرئاوای ئێرانە بەتایبەتی ئەوەی لە کوردستان و ئازەربایجانی ئەمڕۆ و سلێمانییە لە رێگای (هێرزفیلد)ەوە لەژێر ناونیشانی ئارمگای مادی بناسن شارەزایەتی ئەدەن.

**کاری لە زەڕەنگەری ئێرانی کۆنی بەر لە مێژوودا :**

هەڵکۆڵین یان قەڵەمکاری لەسەر بەدەنی جامێکی ئاڵتوون یان زیو بەر لە (3) هەزار ساڵ لە رێگای گەلانی مانایی و مادی و ماردی و سکایی یان ئیلامی بە ئێمە گەیشتووە ئەمە وایکرد لە زووەوە ئاشنای فەرهەنگی ئەو پەومانە بی لە داستان و چیرۆك و ئەفسانەکانیان و بەهۆیانەوە شارەزایی لەسەریان پەیدا بکەین، دواتریش ئەو کاڵایانە بە رێگای گۆڕینەوەی بازرگانی کەوتوونەتە بەردەست جگە لەوەش ئەو

ئاسەوارە هونەرییەگەلییانەش لە ڕێگای دەربەند و ڕێگاکانی ئاساییترەوە تێکەڵاوی ئابووری داگیرکەران بوون هەروەها لە سەردەمانێکی کۆکراونەتەوەو دراون بە سوپای سەرکەوتوو.

ڕۆژگارێکیش ئەم گەنجینانە لە ڕێگای پێشکەشکردنیان بۆ خواکان بەدیاری وەقفی پەرستگاکان کراون ئەمانە کە تاڵانی شەڕ بوون بە ئەمانەت دانراون کە سامانی پادشاکان و دادوەرەکان بوون. ئەم دروستکراوانە هەندێکجار لە مەعدەنی بەنرخ بوون و بەشێوەیەکی هونەری بە فەرمانێك لەلایەن خاوەن دەسەڵاتەوە داڕێژراون هونەرمەندەکەش پشت ئەستوور بووە بە دەسەڵاتی ساماندارەکەی ناو کۆمەڵگا بۆیە هەستاوە دروستیکردون.

کارەگەرەکان لە هەر پۆلێك یان تیرەی قەومێك بووبن گرووپێکی کۆمەڵایەتی پیشەوەرییان پێکهێناوەو لەلایەن چینی دەسەڵاتدارەوە پارێزگارییان لێکراوە لە هەمات کاتیشدا کەرەسەی سەرەتایی بۆ دروستکردنی بابەتە هونەریەکانیان لەبەردەستدا بووە بێ ئەوەی خۆیان بە خاوەنی بزانن. ئەم هونەرمەندانە لە دوولاوە پێوەی بەستراوەنەتەوە لەلایەك لە هەوڵیانا بۆ ژیانیان بووە بۆیە ویستوویانە پیشەسازییەکەیان بەرەو پێشبەرن و تیایدا سەرکەوتووبن. لەلایەکی تریشەوە بۆ ئەوەی نرخی دروستکراوەکانیان لەبەرزیدا بمێنێتەوەو بەهای نەگۆڕێ لەکاتی تەواوکردنی کارەکەدا.

دروستکردنی ئاسەوارێکی هونەری جوانیش وەکو جامی ئاڵتوونی (حەسەنلو) پەیوەندی تەواوی بە تێگەیشتنی مانای نەخش و نیگارەکانییەوە هەیە، لای لایەتی بە قووڵی دەرهێنراون و ئاسەوارەکەش بە خڕی دروستکراوە لەگەڵ دەرهێنانی مرۆڤ و ڕەگەزەکانیتر، لەسەرو ئەمانەشەوە شێوە هونەرییەکە لەناو ئەو پیرۆزانەدا لەبەرچاو گیراوەکە شوێنی بایەخ پێدانن لە پێشکەشکردنیانا.

هەموو ئەو دیمەنانەش هونەرمەندەکەی کردووەتە حیکایەتخوان و خەڵقی دوو هێزی یەزدانی و ئەهریمەنی بەپێی ئەو زانیاریانەی لەبەردەستیا بووە لە داستانێکدا کردووە بەوەش ببە قەڵەمکارییەکەی توانیویە لە مانای نەخشەکانی لەوحە ئاڵتوونە ناسکەکەی هەڵیکەندووەو تیایدا نەخشەکانی نیشانداوە. ئەمە ڕاستییەکە لەناو جامێکی ئاڵتووندا دەرهێنراون و چیرۆکەکانی ئەفسانەی سەرسووڕهێنەری بەر لە (3) هەزار ساڵ باسکردووە. لەناو نەخشە دۆزراوەکاندا کوندە پەپوویەك لەسەر وەرەقەیەکی مس دەرهێنراوە، هەڵکۆڵینەکەی قەڵەمکاری بۆ کراوە کە بۆ ئەمڕۆ شوێنی قسە لەسەرکردنە.

لە سەردەمەکانی کۆنیشدا نەخشی ئەفسانەیی چ لە ڕووی سواڵەت دەرهێنرابێت یان جامی ئاڵتوونی دیمەنی ئافرەتی سکپڕی بەگشتی لەخۆگرتووەو وێنەکانیش دەربڕینی لێکردووە.

دیمەنەکان بە تێگەیشتن لێیان و کردنەوەی هێماکانیان دەربڕین لە سەرچاوەیەك ئەکەن کە بڕیاردانەکە لەسەر گرنگی بابەتە هونەرییەکە لە رووی داستانەکەوە کە هەست بزوێنەو دەربڕینی لێکردووەو لە قالبێکدا دارێژراوە کە تیایدا ناوەڕۆك خراوەتەڕوو تاوەکو هونەرمەندەکە بتوانێت جێگای هەریەکێك لەو توخمانە لەسەر نەخشەکە لە شوێنی گونجاوی خۆیدا دابنێت. لای زەڕەنگەرەکەش یان ئەوەی کانزاکە دەتوێنێتەوە حەکایەتخوانەکە لای لەو رۆژگارەدا رۆڵی نەبووە،

هەروەها لە دروستکردنی ئاسەوارو نەخشی هەڵکۆڵراوی لاسایکەرەوەی نمایشکراویشدا هەر بەو جۆرە بووە، بۆیە هەر یەکێك لە بەشەکان و توخمەکانی خاوەنی ماناو روونکردنەوەی جیاجیای تایبەت بە خۆیان هەبووە. هونەرمەندەکەش تێکۆشاوە بەشەکانی سۆزو مەزەبی بە شێوەیەکی تەجریدی ئاوێتەی یەکتریان بکات بۆ نیشاندانیان، مارو دیمەنی ئەسپ و گای باڵدار و هەڵۆ و شێر و ئاژەڵی لە یەکدراوی ئەفسانەیی داستان پێکدەهێنن بەدەستە،

بەڵام شاخ و زەوی و ئاو و گیا لەم تێڕوانینانەدا مانای پیرۆزی خۆیان هەیە ئاو لە رواندنی گیای زەویدا خاوەنی نەخشەی دەروونی و بزوێنەریەتی، لە ئەنجامی ئەم جوڵەیەدا بە نهێنی توانای بوونی خۆی لەناو گیادا دیاریدەکات بەو شێوەیەی کە هێزێکە لە سەرو سروشتەوەیە،

یان خوایە. بزنی کێوی و ئاژەڵی شاخدار توانای هەتا هەتاییان هەیە واتە نەمرن چونکە شاخی ئەوانە سەرچاوەی ئاوەو ئاویش سەرچاوەی ژیان و مانەوەیە بەو پێیە دیمەنی بزنی کێوی توانای ژیانی بە دەستەوەیە،

بەپێی عەقیدەی داستانەکان (گا) لەلایەن ئەهریمەنەوە بە کوشتچووە، بەڵام لە ئەنجامی هاتنە خوارەوەی خوێنەکەی بۆ تەواوی گژوگیا و رووەکەکانیتر بەسوود بووە. بەهەر حاڵ بزون و بیری دەروونی هونەرمەندەکە نەخشی ئاژەڵێکی راوکردووی یان راوی لە سووڕانەوەی تەوپاو تەوقی جامە ئاڵتوونەکە یان سواڵەتەکەی دەرهێناوەو بە دووبارەکردنەوەی وێنەکەی بە شێوەیەکی ئاسۆیی یان ستوونی گرتووە. بۆ نموونە وێنەی تەورێك لە سووڕانەوەکەدا چەندین جار دەورانی بە هاوشێوەی خۆی پێکراوە یان بزنێکی کێوی، یان بەشێوەیەکی سروشتی بێگیان یان گیان و جوڵەی پێبەخشیوە.

وێنەکانی ناو داستانەکانی جامە ئاڵتوونەکەو مشت و مڕو شەڕەکان لە نێوان دوو هێزی خراپە و چاکەدا شەڕی بەردەوامی خستووەتەوەو بە باشیش رێکخراون، هەتاکو ژیانیش لەناو کۆمەڵگای شوانکارەدا بمێنێ ئەو ململانێیە بەردەوامی دەبێت. بڕێك لە هەویر بۆ دروستکردنی ئەم شەڕە خەیاڵیانە لەنێوان شێرو گادا بە ئەفسانەی رەشدا هەمان ئەو

ئاژەڵانە بەرچاو دەکەون کە لە جامە ئاڵتوونەکەدا دەبینرێن. شێر بەتوانایە و نوێنەری خۆرەو راوچییەو (گا)ش نوێنەری مانگ و ئاسمانە لەسەر زەوی و راوکراوە.

راوکراو و راوچی بۆ مانەوەی هەتا هەتاییان و بەردەوامی ژیانیان شەڕی نێوانیان مێژووییە وبەردەوامە، ئەم شەڕانە لە چیرۆکەکانیشدا وێنەکانیانکێشراون. وێنەکانیشلای سەرکەوتووەکان ناوەڕۆك و رازی ئەم چیرۆکانە دەرئەخەن لەمەوە دەتوانین بڵێین وەکو سەرتا فەرهەنگی حەسەنلو و وێنەی ئەفسانەکانی سەر جامە ئاڵتوونییەکان و زیویەکان کە لە گۆڕستانی مارلیك دۆزراونەتەوە بەردەوامییە بۆ نەخشەکان و حیکایەتی داستانی ئاژەڵە لە یەکدراوەکان ئەمانە لە چاوی فەرهەنگی (مارلێك)دا ماناو روونکردنەوەی تایبەتی دەروونیان هەیە و پێویستە لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکرێ. لەناو ئەمانەدا ئەگەر بە نیگایەك بە خەیاڵ و باوەڕی مرۆڤدا گوزەر بکەین ئەمانە لەو سەرچاوانەن کە داستانەکانی شانامەی مامۆستا (تووس) باسیان دەکاو شایەتی ئەوە ئەدەن کە رەگ و ریشەیان هەیە.

## کۆچەریەکان خاوەنی ئەفسانە و زەڕەنگەرین:

لە نیوەی هەزارەی دووەمی پێش زایین هیندو ئارياييەکان (ئێران) خاوەنی ناوەڕۆکی هەستبزوێنی پەرتوکی ئەدەبی رێگویداو دواتر ئاوێستا بوون کە دیمەنێکی گەورەی رۆشناییان لە کۆمەڵگایەکی ئاژەڵ بەخێوکەری وابەستە بە (گا) وە لە شوێنی دانا.

خەزەر لەوەڕگایەکی فراوانیان هەبوو بۆ لەوەڕاندنی ئاژەڵەکانیان، ئەم مرۆڤانە لە یەککگرتنی گەلانی (سیت) و (سکایی) پێکهاتبوون و بە ئەدەبیاتی ئەفسانەیی خۆیان رەنگێکی واقیعییان بەخۆ بەخشیبوو ئەوەی لەناویانا بەباشی دانرابوو ئاسمان بوو لەگەڵ دانانی مانگاو ئەسپ و بزن و مرۆڤ بوو کە بەلایانەوە باڵدارن و پەرستوویانن و زەویشیان بە (گا) کێڵاوەو لە شوێنی خوای خێرو چاکە دانراوە. ئەوانەش کە هەن و خوای شەڕن و خوێن خۆرن واتە مرۆڤی پیسن و بەچکەی دێون و سوودیان وەرگرتووەو پلەو پایەیان هەیە و پیس و سەپێنراون لە دیمەنە قۆقزەکاندا ئەوەی هەیە لە ئەفسانەی باش و خراپ لە رووی جامە ئاڵتوونەکان زیو و برۆنزەکاندا هەڵکۆڵراون یان نەخشێنراون ئەمانە سەرقاڵی شەڕو ململانێ بوون ئەم شەڕانەش لە نێوان چاکەو خراپەدا هەردەم بوونی هەبووە.

لە کۆتایی هەزارەی دووەمی پێش زایین کۆمەڵگای هیندو ئارییاییەکان سەرکەوتوو بوون و ئەسپ و ئێستر و کەرو حوشتریان مالیکردووەو وردە وردە ئەو ئاژەڵانەش بوونەتە هۆکار بۆ راکێشانی گالێسکەکان کە سوودیان لێ بینیون بۆ کۆچکردن بە کۆمەڵ بۆ خاکی دوورترو دراوسێی گەلانیتر و دەستدرێژ کردن بۆ سەریان، ئەم دوو قەومە بەر لە هەزاران ساڵ خزمبوون و بە یەکەوە ژیاون و بە ئاژەڵداریيەدا دابەشبوونیان بووە لە سوپاکەیاندا بە (3) چینی سەربازی و رۆحانی و شوانکارە کە بە پەروەرکردنی ئەسپ و ئێستر و حوشتر سەرقاڵبوون یان ئەوانەی کە مرۆڤ دەستیکەوتووەو بۆی تێکۆشاوە لە گالێسکەکەیاندا بە کەلوپەلەکانیانەوە کۆچیانکردووەو کۆچی ئەم دوو قەومەش خۆیان و لەگەڵ ئاژەڵەکانیان بە کۆمەڵ لەگەڵ ژن و منداڵەکانیان لەگەڕانیاندا بەدوای لەوەڕگادا رۆشتوون و بۆ بەرژوەندییان دەستیان بە سەرياگرتووە.

هیندییەکان لە گۆشەی باکووری خۆرهەڵاتی ئێران کە بە دەربەندی (سەند) و (گەنگ) ناسراون رێگەیان بڕیوەو ئارییاییە ئێرانییەکانیش لە دوو لقی باکووری خۆرهەڵاتی و باکووری خۆرئاوای هاتوونەتە بەرزاییەکانی ناوەند. هەروەها عێلەکانیتریش لە باشووری رووسیا کە ناونیشانی (سیت)یان بووە بەدوای یکادا هاتوون. (سیت) و (سکا) هاوڕیشەن و بە قەومێك دائەنرێن، بە هەر حاڵ ئەم هێزە گەورەیەی گەڕۆکی بیابان لەو شوێنەدا ماونەتەوە، فەرهەنگی ئەم گەلانە ئەسپ سوارییە کە لە تەواوی دەشتەکانا باڵادەستبوون پارێزگارییان لە گەورەییان کردووە، لەناو ئەمانەدا تەنیا مەغۆڵەکان و تورکەکانی خۆرهەڵاتی دوور بوو کە بەهێزی شمشێر لە سەدەکانی ناوەڕاستدا توانیان دژی ئارياييەکان ئێران لە بەرزاییەکانی ئەو وڵاتەدا بجەنگن و ئەو خاکە داگیر بکەن.

کاسییەکان و لۆلۆییەکان و گوتییەکان لە گەلانی قەفقازی بوون، ئەمانە بە قەومێك دائەنرێن کە لە ئازەربایجان و دەربەندەکانی زاگرۆسدا ژیاون، هۆرییەکان و میتانییەکانیش کە لەو گەلانەی دانیشتووی دراوسێی (کاسپین) (دەریای خەزەر بوون بۆ سوریا و ئەنازۆڵ کۆچیانکردووە. رۆژگار ئەوانەی نیشانداوە کە لە لقەکانی ئاریایی بوون و لەژێر دەسەڵاتی هیندو ئێرانییەکاندا بوون و لەوانەوە سوودیان لە ماڵیکردنی ئەسپ دیوەو هەتاکو ناوی بەشێك لە خواکانی هیندو ئاریایی (ئێرانی) لە نووسینەکانیانا یادگاری ئەو خزمایەتییەی پێوە هەبووە. کاتێك کە ئاژەڵدارەکانی ئێرانی لە ژیانی دەشتیانەوە بەرەو بەرزاییەکان بەر لە دوو هەزار ساڵ رۆیشتن بەوە فەرهەنگی شارنشینی لە ئێراندا شێوەیەکی نوێی بەخۆوە گرت. کشتوکاڵ و ئاودێری لە قۆناغی نیشتەجێبووندا بڕیاری لێدرا. شارستانیەتە ژیاوەکان لە باشووری

خۆرهەڵاتی ئێران و شوورانی دامغان و رەی و سیالکی کاشان و گیان و گوردین تەپە لە باکووری خۆرهەڵات و خۆرئاواو دەشتی خۆزستان لە باشووری خۆرئاوابوونە سەرەتا بۆ قۆناغی ئەدەبیات و شارنشینی پارێزگاریلێکراو. زنجیرەی پادشاکانی ئیلامی نێوان شووش و چغارە نبیل و حەوت تەپە گەیشتنە ئەوپەڕی توانیان لە تاقیکردنەوەکانیاندا و چەندین شاریش گەیشتنە تەواوی و کۆمەڵگایان سی هەزار کەس بوون بە مانا ئەوانەی کە هەبوون وەکو بابل و ئاشوور و شووش. پیشەسازییان شووشەو قوماش و کەلوپەلی کانزایی و تەختەو شەراب و رۆن بوون لەم شارانەدا،

لە (باکتان) و (پاپیرۆس) ئاڵتوون و ئێسپانی فیل و مس و کەتیرە ئاڵوگۆڕ دەکران. لە هەمان رۆژگاریشدا لە دەربەندی (سەند)و (گەنگ) لەگەڵ نێوان دوو رووبار لە رێگای دەریاوە ئاڵوگۆڕی بازرگانی دەکراو ئێسقانی فیل و دەرمان و لۆکە بۆ شارەکانی ئاشوور و بابل نێردراون.

دۆزینەوەی یەکەمین کانزاو گۆڕینی لەلایەن مرۆڤەوە خودی بابەتەکە باسێکی قورسەکە بەو جۆرەیە: دوای پەیدابوونی سواڵەت لە چاخی بەردینی نوێ و گۆڕینی شێوەکەی بە کەمێك ئاگر لەوانەیە بە سوودفە کەرەسەی رەق لەناو گڵەکەیدا بووبێت بە ئاگرەکە ئەو ئۆکسیدە کانزاییە توابێتەوە. دوای ئەوەی چەندان هەزار ساڵ درێژەی کێشا مرۆڤ بە ئاگاو بێئاگا بەردی مسی دۆزییەوە کە بووە سەرەتایەك بۆ چاخی کانزا. پیشەوەران لە سەرەتای لە کوورەی سواڵەت سوورکردنەوەی توانیان ئەو کانی کانزایانە بەدەست بهێنن و بە ساردی بە چەکوش تا مێرو کەلوپەلی ئاڵتوون و زیو دروست بکەن. لە دۆزینەوەی ئەو ئامێرانەدا کس لە (شووش) و (سیالك) بە دەستگەیشتوون، لەناویانا لە 92٪ی مس بووەو ئەویتریان نیکل بووە، مرۆڤی میسر و نێوان دوو رووبارو ئێران لە ئاڵتوون و زیو سوودی گەورەیان دیوەو سۆمەریەکانیش بە رێگای توانەوەی ئەو کانزایانە ئاشنایەتی تەواویان لە دەستابووە. کەلوپەلی ئاڵتوونی لە گۆڕستانی ئورو ئاسەواری ئاڵتوونی فیرعەونەکان لە نیوەی هەزارەی دووەمی پێش زایین بەڵگەن کە بەدەستەوەن بۆ پیشەسازی زەڕەنگەری کە لە ئاسیای خۆرئاوادا پێشکەوتوو بووە.

لە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زایین کانی کانزای جیاجیان دەرهێناوەو دانیشتوانەکەی ئەو سەر زەمینانەش ئەوەی لەو کانزایانە هەیانبووە دوای توانەوەیان گۆڕیویانن بە هەمەجۆر ئامێری دروستکراو، لەوانە ئاسن و ئاڵتوون و مس و زیو. بەو جۆرە هونەری زەڕەنگەری و مسگەری بە رێگای چەکوشکاری و لە حیمکاری و قەڵەمگاری و

نەخشەسازی و جوانکاری هاتووەتە بەرهەم تەجروبەی زەڕەنگەرە کۆنەکانیش وابووە کە ڕەوشتیان بۆ دروستکراوەکانیان ڕێگای داوە کە باشبێت بۆ ئەوەی بە نەمری بمێنێتەوە.

لە هەزارەی یەکەمی پێش زایین فەرهەنگ و فەلسەفەی یۆنانی کاریگەری دوولایەنەی هەبووە لە پیشە دەستییەکانی ئاسیای خۆرئاواداو لە ئەسکەندەرییە کیمیاگەری شوێنی خۆیگرت. کیمیاگەرەکان بۆ چاککردنی کەرەسەکانیان،

بەهرەیان وەرگرت لەکاری کانزاسازی میسری دەربارەی ئەو کەرەسانەی شارەزاییانەی بەتیۆر لە سەریان هەبووە. لەو کتێبانەی بەدەستگەیشتوون لە ئەسکەندەرییە کەمترین زانیاری دەربارەی کیمیای دلۆپین و بە هەڵم بوون نە نووسراوە.

بەهەر حاڵ گۆڕینی فلزە ساناکانی وەکو ئاسن و قوڕقوشم بە کانزایەکیتری وەکو ئاڵتوون گرنگترین بابەتی نووسراوی سەرچاوەکانە کە زاناکانی کیمیاگەری سەرنجیان لێداوە.

ئەگەر بە مێژووی کۆن و پەیوەندییەکانی جەنگی و بازرگانی بڕوانین و سەیر بکەین دەبینین لە نیوەی دووەمی سەدەی هەشتەمی پێش زایین لە دەسەڵاتی تاگلات پلاسەری سێیەمدا (745-728 پ.ز) ئاشوور سنوورەکانی ئیمپڕاتۆریەتی خی فراوانکرد و بابل و سووریاش کەوتنە ژێر دەسەڵاتی. لە کۆتایی ئەو سەدەیەدا، سیمریەکان کە لە شەڕی ئەسپ سواریدا هاوشێوەی سیتەکان بوون لە جەنگدا لە باشووری قەفقاز هێرشیان بردە سەر ئۆرارتۆییەکان و شکستیان بە دەسەڵاتیاندا. شکستی ئۆرارتۆ بە سوودی ئاشوورییەك تەواو بوو، لەبەر ئەوەی بەردەوام دژی ئاشوورییەکان اە هێرشدا بوون بۆیە ئاسوور بانیپاڵ ناچار دوای ڕێکەوتن لە میسر کشایەوەو توانی هێرش بەریتە سەر عیلام و بیکاتە پاشکۆی ئاشوور.

بەر لە ساڵی 621ی پێش زایین مادەکان توانیان شکست بە (سیتەکان) بدەن، بەڵام دواتر یەکیەتییەك لە نێوان (سیت) و (بابل) دروستبوو و ئیمپڕاتۆریەتی ئاشووریش لەو ساڵەدا لێبدراو کۆتایی هات، ئەوەش بەهۆی یەکگرتنی (مانا) و (ماد) هاتە گۆڕێ. بەخۆی ئاژەڵدارییەوە ئارییایە ڕەسەنەکان لە دەشتەکانی ئاسیای ناوەند و قەفقاز مانەوە، (ماناکان) و (مادەکان)یش بۆ ئازەربایجان و کوردستان کۆچیانکردو کاردۆسییەکان و گێلەکان و ئامارەدەکان و دەیلەمەکان و تپورەکان و هێرکانییەکانیش بەرەو ڕۆخەکانی باشووری دەریای کاسپین ڕۆشتن و سیمرپەکانیش بۆ لوڕستان. لەناو ئەمانەدا ئاڵوگۆڕی پیشەسازی کانزاییشیان لەگەڵ عیلام و باشووری خۆرئاوای ئێراندا هەبوو، هەروەها بابەتی هونەری زەڕەنگەریش لەنێو عیلەکانی سیمری و سیت و ئێرانی حەسەنلوی ئورمییە و زێویە و سەقزو ماردلیکی

گەیلان و کلاردەشتی مازندەران و ئەملەشی گەیلان و ئارجامی ئیلام ئالوگۆڕ دەکران بەتایبەتی ئەوانەی لە دەستیانا بوو لە شێوەی جامە ئاڵتوونییەکان و زیویەکان کە جوانکرا بوون بە نەخشی جانەوەری ئەفسانەیی کە وەکو خونچە دەمیان کردبۆوەو کۆببوونەوە.

دوای دۆزینەوەی جامی ئاڵتوونی جەسەنلو لە نەغەدەی ورمێ و دۆزینەوەی گەنجینەی (زڕین) و (سمین)ی مارلیك لە سەرچاوەی ئارجانی ئیلام بەهۆیانەوە ئەو گەلانە لای شوێنەوارناسان ناویانگیان پەیدا کرد لە رووی فەرهەنگ و شارستانییەتیان بۆیە هەستان بە لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو پاشماوانە کە بە نەخش و نیگار رازێنرابوونەوەو شێوەیەکی پێشکەوتوویان لە خۆیان گرتبوو لە رووی کاری زەڕەنگەرییەوە، بەڵام ئەو شوێنەوارناسانە نەیانتوانیبوو لە مانای نەخشەکان و کاری دەروونییان و ئەفسانەکانیان شتێك بڵێن،

یان بنووسن. پاشماوە دۆزراوەکانی گەنجینەی زێویە بەهۆی بازرگانەکانەوە ئەوانەی لە ئاڵتوون و زیو دروستکرابوون ساڵی 1323 بە دەستگەیشتن، هەروەها جارێکیتریش لە ساڵی 1313ی هەتاوی بەهۆی بازرگانەکانی فەڕەنسییەوە ئەوانەی لە (گودالی) تەپەی هەکمەتانە دۆزرابوونەوە بە دەستگەیشتن. گەنجینەی کلاردەشت بەپێی رێککەوتنێك کە کەوتبووە ژێر کۆشکی ئەستەخری کوێستانی رەزاشا بەهۆی ئەندازیارێکی تەلارسازی ئەڵمانییەوە دەرکەوت.

گۆڕەپانە کۆنەکانی ئەملەشی لوڕستانیش بە چەند ساڵێك دوای ئەوانە لەلایەن کنەکەرانییەوە بێ مۆڵەت پاشماوە ئاسەوارییە دۆزراوەکانیان دزرا ئەمەش بووە هۆی ئەوەی مێژووی شوێنەوارناسی ئەو ناوەندانەش ژێر پۆشکران و لە گومانا ماونەتەوە.

ئاخاوتنەکانی سەربەخۆی هەیئەی ئەمەریکی لەسەر دۆزینەوەی جاکی ئاڵتوونی حەسەنلو هەتاکو ئێستا کە چاپ نەکراوە، بەڵام گۆڕستانی کۆنی (مارلیك) (چراخعەلی تەپە) لە پاییزی ساڵی 1340 بووە سەرچاوە بۆ لێکۆڵینەوەکانیان و بڕیاردان لەسەری بەوەش کنەو پشکنینەکانی کۆنینەناسی تیایدا تەواو بوو. نووسینەوەی ئەم چەند دێڕە لەسەر ئاسەواری ئەم گۆڕستانە بە سەرپەرشتی پشکنەر دکتۆر (عیزەتوڵڵای نیگەهبان) بوو کە توانی ئەو گەنجینەیە لە ژێر خاکدا دەربهێنێ کە بەشێك بوو لە کەلوپەلی مردووە کە لە تەنیشتییەوە دانرابوو، لەگەڵ ئەوەشدا کەلوپەلیتریش دەرکەوتن هەموو ئەو کەلوپەلانەش میراتی مردووەکان بوو کە لە گەڵیانا دانرابوون، تەواوی ئەو ئامێرو کەلوپەلانەش فلزی و کانزایی بوون کە لێکۆڵینەوەیان لەسەرکران. لەکاتی دانانی مردووەکەدا دەتوانین بەپێی ئەو کەلوپەلانەی بۆیان داناوە پێناسەی بۆ بکەین. قاپ و قاچاخی فلزی (مارلیك) لەگەڵ هەموو ئەو کۆکراوانەیتر کە لەژێر دەستی

مردووەکەدا بووە هاوشێوەی کەلوپەلی حەسەنلو و زێویە و کلاردەشت بووە واتە لەناو هەنوویاندا زەڕەنگەری هونەرمەند ماناو تێگەیشتنەکانی دەروونی داستانەکان و گاو جانەوەرەکان و باڵداری لێکدراو بە دەرەوەی جامە ئاڵتوونییەکان و زیویەکان هەڵکۆڵراون.

**سەرچاوە**

**سیف الله کامبخش فرد/ ێپار تاریخی ایران**

**چاپ اول 1380، لا13-18**

# شوێنەوارەکانی دەوروبەری شاخی بێستوون

پاشماوە مێژووییە دەوردراوەکانی بێستوون دەکەونە دووری (30) کیلۆمەتری باکووری خۆرهەڵاتی کرماشان لەسەر هێڵی درێژی جوگرافی (42) پلەو (27) چرکە و هێڵی پانی (34) پلە و (24) چرکە، بەرزییەکەشی لە رووی دەریاوە (132) مەترە. بەڵگەکانی شوێنەوارناسی نیشانیدەدات کە ئەم پاشماوە دەوردراوانە لە قۆناغە کۆنەکانی چاخی بەردینەوە دەستپێدەکات تاککو دەگاتەوە بە ئێستا کە بەردەوام مرۆڤ تیایاندا دانیشتووەو ئاسەواری ئەو سەردەمانەش بەزەوی ناوچەکەوە لە قۆناغە جیاجیاکانی مێژوودا دیارە.

### ئەشکەوت و بەردە رتووشکراوەکان

**ئەشکەوتی مەرخەرەل:** ئەم ئەشکەوتە دەکەوێتە نێوان (500) مەتری خانووی دانیشتووانەکان و دامێنی کێوی بێستوون، ساڵی (1965)ی زایینی (فلیپ ئاسمیت) کاری کنەو پشکنینی تیادا کردو ئەم ئاسەوارانەی تیادا دۆزییەوە کە لەم جۆرانەی خوارەوە پێکهاتووە:

1- بەردە رتووشکراوەکان و دەمە چەقۆی گەورە کە بۆ قۆناغەکانی چاخی بەردینی کۆن و نوێ دەگەڕێنەوە واتە لە چل هەزار ساڵ بەر لە ئێستا.

2- قەلەمی رتووشکراوی کڕاندن و تیغی پشتکۆڵی قۆناغی بەردینی نوێ.

3- ئامێرە بەردینە وردەکانی پەیوەست بە چاخی دوای بەردینی کۆن.

پاشماوەی ئاسەواری سەرەەو قۆناغەکانی ناسراو بە بەردینی نوێ بێ سواڵەتەو هەیشە لەگەڵ سواڵەتدایە، سواڵەتەکان هەموویان زبرن و قووڕەکەی وردەکای تیادایە

که بە سواڵەتی تەنك و سووك ناوبانگی دەرکردووە، نوێترینی ئاسەواری دەرکەوتووی ئەم ئەشکەوتە پەیوەستە بە چاخی ساسانی.

ئەشکەوتی هەردودەر: ئەم ئەشکەوتە دەکەوێتە دامێنی کێوی بێستوون لە بەشی باکووری خۆرهەڵاتی ئەشکەوتی (شکارچیان)ە، ئەو ئامێررە ناسراوانەی کە پەیوەستن بەم ئەشکەوتەوە بۆ قۆناغی (مستێری) و (زەرزی)) دەگەرێنەوە، کە پێکهاتوون لە: ئامێری رتووشکراوی بەردینی دایك، کە لە دوولاوە تاشراوە واتە هاوشانن یان نزیکن لە یەکەوە یان تاشینی لێوارەکانی سەرەوەی یان شێوە ددانەی کونکراو؟

ئەشکەوتی شکارچییان: ئەم ئەشکەوتە لە دامێنی کێوی بێستوون دایە و لە پەیکەری (هەرکووك)ەوە نزیکە، کاری کنەو پشکنین، لەم ئەشکەوتەدا ساڵی (1949) ئەنجامدراوە، تیایدا لە سنووری (22) هەزار پاشماوەی ئاسەواری جۆراوجۆر دۆزرانەوە، لەونە زۆرینەیان سواڵەت و ئامێری بەردین و پارچەی ئێسقانی ئاژەڵی کێوین، وەکو (ماگای کێوی و ئاسك و گای کێوی و پڵنگ و رێوی و بەراز و رێوی سوور و بەشێك لە ئێسقانی مەچەکی مرۆڤی نیاندەرتال)یش بەدەستگەیشتووە، دوو پارچە لەو سواڵەتانەی دۆزراونەتەوە بۆ چاخی ئاشووری دەگەرێنەوەو ئەوانیتر لله جۆری سواڵەتی هاخامەنشین، جگە لەمانەش ئامێری بەردین دۆزراوەتەوە لە جۆری چەقۆ کە بۆ قۆناغی بەردینی نوێ دەگەرێتەوە.

ئەشکەوتی مەرتاریك و نزرگای مادی

ئەشکەوتی مەرتاریك: ئەم ئەشکەوتە دەکەوێتە دامێنی کێوی بێستوون لە بەشی باکووری حۆرئاوای ئەشکەوتی (مەرخەرل)ە، ئەو شتومەکانەی کە ناسراون و لەم ئەشکەوتەدا دۆزراونەتەوە، زووتر لە بەشی دواوەیدا بەدەستگەیشتوون زۆرینەی بەردی چاککراو و بەردی دایکەو بەردی کونکراوە، لە جۆری درەوشەو ئامێری دەسکدارو دەمەمشاری بەردن کە پەروەستن بە چاخی مستێری.

ئەشکەوتی مەرئافتاب: ئەم ئەشکەوتە دەکەوێتە دامێنی کێوی بێستوونەوە هاوسنووری ئەشکەوتەکانی (مەرتاریك) و (مەردودەر) شوێنی خۆیانگرتووە، ئامێرە بەردینەکانی ئەم ئەشکەوتە لە حۆیی (چرت) و (زاب)ە،

کە زووتر بەشێوە تاشینی ساکار و لێدرلو و بەردی دایکە بەرچاوکەوتوون، ئامێرە بەردینە ئامادەکراوەکانی ئەم ئەشکەوتە زۆرینەیان بەردی رنراو و کونکراون، جگە لە پیشەسازی

بەردین لە دەمی ئەشکەوتەکەدا ئامێری سێگۆشەی ئێسقان دۆزرایەوە، ئامێرە بەردینەکانی ئەم ئەشکەوتە پەیوەستن بە چاخی مستێری.

نزرگا مادی: لەژێر نووسین و نەخشە بەرجەستەکراوەکەی داریۆشی یەکەمدا ریزێك دیوار بە بڵندی مەترو نیویێك بەرچاو دەکەوێت، کە بە شێوەی وشکەکەلەك دانراوەو بەردەکانی چاك نەکراون، ڕاڕەوێکی تیادایە بە پانی مەترو نیویێك و درێژییەکەی حەوت مەترە،

ئەو ریزە بەردە دابەشکراوە بە دوو بەش، لە کۆتایی ئەو ڕاڕەوەدا ژوورێك هەیە، باڵەکانی (6.5*3.5) مەترەو دوولای ئەم ڕاڕەوە شکاون و دەلاقەیان تیادایە و لە کۆتایی ئەو ڕاڕەوەدا دیوارێك دێت پانییەکەی لە شێوە سواڵەتەکانی مادی (گودین تەپە)ی (کەنگاوەر) و (نۆشیجان)ی مەلایەرە، بۆیە دەتوانین بڵێین پاشماوەی بیناکە بۆ چاخی فەرمانڕەوایەتی (ماد) دەگەڕێتەوە، جگە لەوەش کۆمسیۆنێکی ئەڵمانیش بینای ناوبراوی بە نزرگایەکی سەردەمی ماد ناوزەدکردووە.

## نەخشە بەرجەستەکراوەکان

نەخشی بەرجەستەکراوی داریۆشی یەکەم و نووسینەکەی: ئەم نەخشە بەرجەستەکراوەی سەردەمی هاخامەنشی بەنرخترین یادگاری ئەدەبی و مێژوویی ئێرانن، کە کەوتووەتە دامێنی کێوی بێستوون، دیمەنە بەردینەکەی داریۆشی یەکەم درێژییەکەی (6) مەترەو پانییەکەی (3.50) مەترە، لای چەپی یادگاری وێنەی داریۆشی لەخۆ گرتووە، بە بەرزی (1.78) مەترە، داریۆش تاجێکی لەسەردایە لێوارەکانی لەسەریا دەرکەوتووەو کراسەکەشی لەبەریا لە بڵندیا دیارەو ریشی لوول و چوارگۆشەیە، دەستی راستی بە هێمای رێزگرتن بەرکردووەتەوەو بەدەستی چەپیشی کەوانێکی گرتووەو قاچی چەپیشی خستووەتە سەر سنگی (گاوماتەی موغ) لە پشتی سەری داریۆشەوە (وێندەفرەنە)ی خاوەنی کەوان و (گنوبروە)ی نیزەدار هەن، لەوانەن دژی (گاوماتە) هاوبەشیان کردووە. لەژێر پێی چەپی داریۆشدا (گاوماتەی موغ) بە پشتا کەوتووەو هێمای خۆبەدەستەوەدانی بەرزکردنەوەی دەستەکانیەتی، لە پشتی سەرییەوە ریزێك دیل دێن ملیان و دەستیان دەبینرێنچ لە دواوە بەستراونەتەوە،

لە دامێنی دیلی سێیەمدا ناو و نەخشی پادشاو شۆڕشگێڕان و شوێنیان واتە لەو شوێنانەی شۆڕشیان کردووە نووسراوەو باشیانکراوە، لە سەرەوەی دیلەکان دیمەنی ئاهۆرامزدا بەرچاو دەکەوێت، کە ئەڵقەی تواناو هێز پێشکەش بە داریۆش دەکات، داریۆش جارێکیتر بڵندکردنی دەستی راستی نیشانەی نزاکردنە بۆ ئاهۆرامزدا، ئەم دیمەنە بەدرێژایی سەدەمەکەی تەواو کراوە، لە سەرەتادا داریۆش تەنیا نەخشەکانی سەرەوەو بەشێك لە نەخشی (سکۆنخا)ی کۆتایی پێهێناوە، لەو رۆژگارەشدا تەنیا بە هەڵکۆڵینی نووسینە عیلامییەکە لەو بۆشاییەی سەرەوەی خۆیدا فەرمانیداوە،

لەم نووسینەدا داریۆش خۆی و بنەماڵەکەی دەناسێنی و بەو کارەشی مەشروعیەتی خۆی رادەگەیەنێت، دوای ئەو شەرخە ئەو شوێنانەی دایگرکردوون بە نووسینی عیلامی لای راستی بەردەکە وێنەی دەرهێناون و بە نووسینی مێخی بابلیش لای چەپ لەبەردەکە نیگارەکانی هەڵکۆڵیوون، لە قۆناغە کۆتاییشدا لەژێر نەخشە بەرجەستەکراوەکاندا باسی ئەو شوێنانەی داگیریکردوون بە نووسینی مێخی و بە زمانی فارسی هەڵکۆڵیون، وادیارە بەنگ تەراشەکانی هاخامەنشی لە کاتی هەڵکۆڵینی هێلە گەیانراوەکاندا لە شوێنی کارەکەیان لە شاخدا بوون، کە دووبارە سکاکان گەڕاونەتەوە بۆ سەرپێچیکردن.

## بەردە نووسراوەکانی داریوش

داریوش لە ساڵی (519)ی پێش زاین شکستی بە (سکۆتی)ی شاری (سکاکان) داو ئەو رووداوەشی خستە ناو بەردە نووسراوەکەی، بۆ ئەمە دەپرسین چۆن شوێنی کردووەتەوە، وادیارە داریوش دەستووری داوە بەشێك لە نووسینە عیلامییەکە لابەرن، واتە لای چەپی ناوەڕۆکە فارسییە نوێکە هەڵبکەین و لە شوێنی وێنەی (سکونخا) دەربهێنن. لەو بەردە نووسراوەدا داریوش وەکو لە سەرەتادا ئاماژەمان پێدا خۆی و بنەماڵەکەیان پێدەناسێنێت و دوایی دێتە سەر رووداوی کوشتنی گاماتەی موغ، کە دوای مردنی (کەمبوجییە) فەرمانڕەوایەتی بۆ خۆی بردووەو باسی دەکات، دوای ئەوانە باسی شەڕەکانی دەکات لەگەڵ گەورە پیاوان میرانی یاخی بوو، لە کۆتاییەکەیدا دەڵێ: هەر کەسێك ئە نووسینە بەهارداره بکوژێنێتەوە نەفرەتی لێبێت. نەخشی بەرجەستەی هەر کۆل: ئەم نەخشە بەرجەستەکراوەی سەردەمی ئاشکانی ساڵی (1337)ی هەتاوی لەکات دروستکردنی رێگای (هەمەدان-کرماشان) خۆی بە ئێمە ناساند، پیاوی

بەهێزو دەسەڵاتدار و رووت و بێ جلوبەرگ نیشاندراوەو بە دیمەن لەژێر سایەی درەخت و نەخشی شێردایەو لە پشوودایە، لە پشتی سەری ئەم کەسایەتییەوە نووسین و نەخشە هەڵکۆڵراوەکانی سەر بەرد هەن، ئەم نەخشانە لە شێوەی درەختێکی فراوان و تەواوە کە بە لقێکییەوە کەوان و تیردانەکەی پیایدا هەڵواسیوەو لە لێواری درەختەکەشەوە گورزێکی شێوە تەشی ئەلقەدار نەخشکراوە، نووسینەکە کە بەپیتی یۆنانییە و لە حەوت دێردایە و لەڕووی تابلۆکەشدا هاوشێوە پەرستگاکانی یۆنانی لە ساڵی (164)ی مانگی پانەمووی هەرکۆل، سەرکەوتووی درەوشاوە بەهۆی (هیاکنیتۆس)ی کوڕی (پانتیاخۆس) بە هۆکاری گێڕانەوەی ئاسایش بۆ هەموو فەرماندەکان گشت ئەم ڕێوڕەسمە سازدرا.

## باوەڕپێکراوی پاشا

نەخشی بەرجەستەی مەهردادی دووەم: ئەم نەخشە بەرجەستەکراوی سەردەمی ئاشکانی کە لە خوار نەخشە بەرجەستەکراوەکەی داریوشی یەکەمەوەیە لە کێوی بێستوون، لە سەردەمی مەهردادی دووەم دەرهێنراوەو بە یادگار ماوەتەوە، کە بۆ ساڵەکانی (123) تاوەکو (110)ی پێش زایین دەگەڕێتەوە. لەم نەخشەدا بەرامبەر (مەهردادی دووەم) چوار کەس لە پارێزگارەکانی ناوخۆ بەرێکی و گرنگیدان شوێنی خۆیان لە پشتی سەرییەوە گرتووە، نیوەی وێنەیان بەرەو رووی (مەهرداد)ەو وێنەی بەشی سەرەوەی مەهردادیش روو لەوانە، مەهرداد دەستی راستی بەشێوە رێزلێگرتنیان بەرزکردووەتەوە. کەسی یەکەم، گودەرزی یەکەم پارێزگارێکی لی پارێزگارەکان، ناوی کەسی دووەم تەواو کوژاوەتەوە، کەسی سێیەم (میترادات)ەو نازناوی ئەو لەم نووسینەدا (پەپیس تۆمینۆس)ە بە مانا سەرچاوەی باوەڕپێکراوی پادشایە، لە دەستی ئەودا وێنەی (خوای پیرۆزی چاکە) دەبینرێت کە ئەڵقەی قردێلەدراوی بەدەستەوەیە.

کەسی چوارەم (کوفاساتس) ناویەتی و نازناوی نییە، ئەم نەخشە بەرجەستەکراوە، لە حەقیقەتدا بەجێهێشتنی توانای دەسەڵاتی لای مەهردادە بۆ هەر یەکێك لەو گەورانەو نیشانیداون، بەداخەوە بەشی گرنگی ئەم نەخشە بەرجەستەکراوە لە سەدەی هەژدەیەمی زایینی بەشی نووسینەکان وەقفنامەی شێخ عەلی خانی زەنگەنەی سەدری ئەعزەمی شا سلێمانی سەفەوی، لەسەرەو لە ئێستادا کۆنە نووسینەکە نەماوە،

ناوەڕۆکی ئەم وەقفە دەستکەوتی دوو گوندییەتی، کە دایناوە بۆ خەرجکردن و خزمەتکردنی کاروانسەرای بێستوون.

نەخشی بەرجەستەی گودەرز لە بێستوون: لە بەشی خۆرهەڵاتی نەخشی بەرجەستەکراوی (مەهردادی دووەم) لە رووی هەمان گابەرد نەخشی گودەرزی دووەمی ئاشکانی (51-46) زایینی پێکەوە لەگەڵ نووسینێك بە پیتی یۆنانی لە گابەردەکە دەرهێنراون.

## پەیکەری وەڵخشی شاهەنشا

ئەم نەخشە بەرجەستەکراوە لە رووبەرێکدا بەسەرکەوتنی گودەرزی دووەم بەسەر دوژمنەکەی (مەهرداد) نیشاندەدات (گودەرز) بە سواری ئەسپەو بەنێزەوە هێرش دەبات ب ۆدوژمنەکەی و ئەو لەسەر ئەسپەکەی سەرنگون دەکات، بە باڵای سەری گودەرزەوە خوای چاکە تاجەگوڵینەی بەسەرەوەیە و لە شێوە رفیندایە، لە پشتی سەری ئەو دووانەوە سوارێکی نیزە بەدەست وەستاوە، لە خواریشەوە نیزە بەدەستێکیتر دەبینرێت، ئەم نەخشە بەرجەستەیە خاوەنی نووسینێکە بە پیتی یۆنانی، ناوەڕۆکی نووسینەکە بەمجۆرەیە (مەهردادی پارتی... گودەرزی پادشای پادشاکان کوڕی گیوە).

نەخشی بەرجەستەی بلاش: لە دامێنی کێوی بێستووندا و لە بەشی خۆرهەڵاتیدا نەخشێکی بەرجەستەی (گودەرز) لەسەر تەختە بەردێکی چوارگۆشەی نارێك بەرچاو دەکەوێت، کە لە (3) لاوەی نەخشی لەسەر هەڵکۆڵراوە. نەخشی ناوەڕاستی هی (بلاشی) پاشای ئاشکانییە و دەموچاوی لە شێوەیەکی تەواودا دەرهێنراوەو بەرچاودەکەوێت، گەردنبەندی لە ملدایە و کە مەبەستی بە پشتێن نیشاندراوە، جلکی ئەو لە خوارەوەیدا بە باڵایدا تەنگ و چەسپەو شەڕواڵەکەی کراوەتەوەو لە کەمەریدا بەلاشەکەیەوە بەستراوە. ئەو کەسە کوپێك لە دەستی چەپیدایە و گرتوویەتی و دەستی راستیشی درێژکردووە بۆ سەر ئاگردانەکە، لەڕووی ئاگردانەکەدا نووسینێك هەیە بە پیتی پەهلەوی ئاشکانی بەم ناوەڕۆکە هەڵکۆڵراوە (ئەم پەیکەرەی وەلخشی شاهەنشا کوڕی وەلخشی شاهانشای نوێیە) بەهۆی سڕینەوەی کۆتایی نووسینەکەوە دیار نییە، کە ئەم وێنەیە پەیوەست بێت بە کام (بلاش)ەوە، لە گۆشەیەکیتری

تەختە بەردەکەدا نەخشیتر دەبینرێت، بینەر وا سەیر دەکات کە ئەو کەسە لە حالێکدایە هەنگاو بۆ لای کەسێکی نێوان دەنێت،

ئەو کەسە خاوەنی جلکێکی هاوشێوە پادشای ئاشکانییە، ئەو دەستی راستی بۆ سەرەوە درێژکردووەو شتێکیش لە دەستی چەپیدایە، لای راستیشی نەخشێکی ناوەندیتر هەیە، کە سێیەمین نەخشی هەڵکۆڵراوی بەردینە، ئەم کەسە جارێکیتر لە شێوەی رۆشتندایە بەرەو رووی کەسایەتییەکیتری نێوان، ئەو بەشی سەرەوەی لاشەکەی تا ئەژنۆی دیارەو کەمەربەستیشی بە کەمەرەوە هەیە، دەستی چەپی ئەو نابینرێت، بەڵام شتێك لەدەستی راستیدایە.

### سەنگ تەراشە ساسانییەکان

فەرهاد تەراش: ئەم رووبەرە بە درێژی (200) مەتر و پانی (30) مەتر دەگەڕێتەوە، کە لە دامێنی کێوی بێستوون تاشراوە، لە دامێنی ئەم رووبەرە تاشراوەدا سەکۆی خاکی هەیە، کە لە بەردەم ئەو دیوارەدا بە درێژی (150) مەتر دروستکراوە، ئەم دیوارە بە سوود وەرگرتن لە بلۆکی بەردینی تاشراو و لاشەی بەردین لەگەڵ گیراوە گەچ دروستکراوە، بەڕووی هەندێك لەو بلۆکە بەردینانەوە هێمای سەنگ تەراشەکانی ساسانی کە بەشێوەی جیاجیا دەرهێنراون دیارە، لە دوو لای ئەو رووبەرە تاشراوەدا چەند سەکۆیەکی پلەداری زبر لەبەردەکان هەڵکۆڵراون، کە ئەوانە بە دانیشتن تاشراون و سوودیان لە دیوارەکەش بینیووە لەو رووەوە تاشراوەدا، پاشماوەی قەلەمکاری سەنگ تەراشەکان، هەروەها لە شوێنە قوڵەکانیشدا دیارە بەتایبەتی ئەوانەی لەو پارچە تەختانەیان لە بنکەکانیاندا بۆ داناون بە روونی دیارن، بوونی دیواری نارێك و ئەو سەکۆیانەش کە روویان لە رووبەرەکەیە دیارن بە ناتەواوی ماونەتەوە، بەڵام بەشەکانیتری سەرەوە روویان لە تەواوبوون بووە، لە دامێنی ئەو رووە تاشراوەی سیفەت خاکییەدا ژمارەیەکی زیاد بلۆکی بەردین لە قەدی کۆڵەکەکان و پایە تەواو نەکراوەکان بەرچاو دەکەون، ئەگەرچی خەڵکی ناوچەکە باوەڕیان وایە ئەم رووەتاشراوە کاریگەریی فەرهادی سەنگتەراشی بەسەرەوە بووە، کە بۆ عەشقی شیرین وەکو فیردەوسی و نیزامی دەڵێت: گفتی ئەو تەراسینەی داوە، بەڵام بەڵگەکانی شوێنەوارناسی نیشانیدەدات، کە ئەو کارە پەیوەستە بە رووداوێکی مێژوویی گرنگەوە کە لای خەسرەوی پەروێزی پادشای ساسانی دروستبووە.

## بەنداوی گاماسیاب

بەو جۆرە لە بەردە تاشراوەکان بۆ دروستکردنی بینای وەکو پردی خەسرەو و پردی بێستوون و بەنداوی گاماسیاب لە بێستوون سوودیان بینیووە، بەو جۆرە تەواوی ئەو بینایانەش کە هەن و بە فەرهاد تەراش ناسراون، بەنیوە ناچل ماونەتەوەو تەواو نەکراون.

کۆشکی خەسرەو: ئەم بینایە لاکێشییە و رووەکەی بەلای خۆرهەلات و خۆرئاوادایە و رووبەڕووی (فەرهاد تەراش) دەبێتەوە. بینای ناوبراو لە دوو بەش پێکهاتووە: بەشی خۆرهەلاتی پێوانەکان (85*80) مەترەو بەشی خۆرئاوای پێوانەکانی (55*44) مەترە کە لە رێگای دەرگایەکەوە پەیوەست دەبێت بە بەشی خۆرهەلاتی، ئەم بەشە لە راستیدا بەپێی شێوەی دیوارەکانی وادیارە خەلوەتگا بێ و بە هەموویان شێوە کۆمەلێك دروستدەکەن. رووکاری دیوارەکانی بیناکە بە بلۆکە بەردینە تاشراوەکان داپۆشراون و بەشێکیتری ناوخۆی دیوارەکانیش لاشەکەیان بە بەرد و گیراوەی گەچ دروستکراون. لە دیوارەکانی دەرەوەی ئەم بینایەدا نێوانێکی دیاریکراویان هەیە و دیوار لە پشتی دیوارەوە دروستکراوە، بەشێوە درێژی و مامناوەندی کە (3.10) مەترە. بەڕووی بەشێك لە بلۆکە بەردەکانی ئەم بینایەدا نیشانەی سەنگتەراشەکانی ساسانی بەرچاو دەکەون، کاری کنەو پشکنینی شوێنەواری لەم بینایەدا ئاشنای کردووین و نیشانیداوین کە پاشماوەی ناوبراو بەشێوەی نیوە ناچل وازی لێهێنراوە، تەنیا دیوارەکانی چواردەوری نەبێت دروستکراوە.

پردی خەسرەو: ئەم پردە دەکەێتە دووری (2) کیلۆمەتری باشووری خۆرئاوای شاری بێستوون و لەسەر رووباری (کاماسیاب)ی سەر رێگای بێستوونە بۆ تەختی شیرین، پردەکە (152.80) مەتر درێژەو (7.20) مەتر پانەو (9) پایە و (10) کونی تیادایە، هەریەکێك لەو پایانەی شەش پالووەو لە (3) بەش پێکهاتووە: بەشی ناوەڕاست شکاوەو شێوەکەی سێگۆشەیە و ئاویان پیادا دەڕوات، پایەکانی بۆ گرتنی لاشە بەردینەکەی بە گیراوەی گەچ و بەردی تاشراو بەهێزکراون، ئەم بلۆکە بەردینانە چوار پالووی شێوە لاکێشین بە ئاسن بەیەکترەوە بەستراونەتەوە، پایەکانی پردەکە لە سەرەوەی رووەکەیان رێکخستووەو ناوەکەی بەرد فەرشکراوەو ئاوی رووبارەکەش بەرزە. سەر پردەکەش رێکە و شێوە سەکۆیەکی

سەرتاسەری لێهاتووە، کەوانەی تاقەکانی پردەکە نەماون و لەم ساڵانەی دواییشدا لەسەر پایە بەردینەکانی پردێکی ئاسن بە پانی مەترێك دانراوە،

بۆ رۆیشتنی سەڵتە زەلامی دانیستووانە ناوخۆکەی، پردی ساسانی خەسرەو لەسەر ئەو جادەیەی سەردەمی ساسانی ماوەتەوە، پاشماوەی ئەم جادەیە لە دوولای پردەکەوە بەدرێژی چەند کیلۆمەترێك دیارە، پانی جادەکەش حەوت مەترەو بە قسلّ و بەردو گیراوەی گەچ فەرشکراوە.

## پرد و کاروانسەرا

پردی بێستوون: پردی بێستوون دەکەوێتە رۆخ خۆرهەڵاتی شاری بێستوون لەسەر رووی رووباری دینەوەر دروستکراوە، ئەم پردە بەناوی پردی کۆن و پردی شا عەباس و پردی سەفەوی و پردی نادر ئاباد و پردی دینەوەری ئاو ناسراوە. درێژییەکەی (144) مەترەو پانییەکەی (7.60) مەترەو لە تەرەفی خۆرهەڵات و خۆرئاوایدا پایەکانی بەشێوەی شەش پاڵو دروستکراون، بەشی ناوەوەی پایەکان بە قسلە و لاشە بەردینەکەشی بە گەچە و رووکارەکەی دەرەوەشی بە بەردی تاشراوە، لە رووی بەشێك لەم بەردانە نیشانەی سەنگتەراشەکانی ساسانی بەشێوە جیاجیا بەرچاودەکەون.

پردی بێستوون خاوەنی (5) کون یان (دەمە) کە تەواوی تاقی دەمەکان بەشێکن لەو دەمانە، تاقی چوارەمی لە شێوەی پیتی (V)ی ئینگلیزیدایە یان لە شێوە قۆخدا چنراوە، بەڵگەکان و بۆچوونەکانی شوێنەوارناسان نیشانی دەدەن پایە بەردینەکانی ئەم پردە لە سەردەمی ساسانیدا دروستکراون، هەرچەندە لەو سەردەمەدا نەیانتوانیوە تەواوی بکەن، لەو سەردەمەدا تەنیا تاقی دەمە دووەم و سێیەم و پشتی دیوارە خڕەکانی ماونەتەوە، دوای ئەوە لە سەردەمی حەسنەوییەی رۆژگاری ئێلخانی دەمی پێنجەمی پردەکە کە گەورەترینیانە لەگەڵ پشتی دیوارە سێگۆشەکان دروستکراون، لە سەردەمی سەفەویشدا جارێکیتر دیمەنی پردەکە چاکسازی تیادا کراوە، لە سەردەمی پەهلەویشدا جارێکیتر تاقی چوارەمی پردەکە چاککراوەتەوە.

کاروانسەرای ئێڵخانی: ئەم کاروانسەرایە رووبەرەکەی (85*80) مەترەو لاشەکەی بەردو خشتە و لەگەڵیا گیراوەی گەچ بەکارهاتووە، کە بەکارهێنانی لە پاشماوەی بیناکانی ساسانی ناسراو بە کۆشکی خەسرەو لەبەرچاو بووە، دەرگای هاتنە ناوەوەی لە تەرەفی خۆرهەڵاتیدا بۆی دانراوە کە بە دیواری ناوەندی (مەرکەزی) کۆتایی دێت.

**سەکۆی بەرد**

لە ئەترافی دیوارەکانیدا (64) ژووری لاکێشی بەرچاو دەکەون، لە باڵی خۆرهەڵات و باکووری و باشووریدا هەیوان لە سنووری نێوانی ژوورەکاندا دروستکراون، بەڵام لە باڵی خۆرئاوایدا لە بەردەم هەر ژوورێکدا، هەیوانێکی بچکۆڵە هەیە، لەناو دیواری دەرەوەی مەرکەزی ئەم کاروانسەرایەدا مزگەوتێکی بچکۆڵە دروستکراوە، لە رۆخی مزگەوتەکەشدا سەکۆیەکی بەردینی چوارگۆشەیان داناوە، بە دڵگرانییەوە کاری ئەم سەکۆیە روون نییە.

کاروانسەرای شا عەباس: ئەم کاروانسەرایە لە شوێنی گوندی بێستوونی کۆن دروستکراوە کە دروستکردنەکەی بە چوار هەیوانی ناوزەدکراوەو رووبەرەکەی (83.6*74.50) مەترە. لە چوارگۆشەکانیدا بینای قوڵەی خڕو هەشت پاڵو دروستکراون، دیواری دەوراو دەوری ئەم کاروانسەرایە لە ناوەوەو دەرەوەیدا تاکو ژوورەکان بە بەردی تاشراو و ناوەکەشی بەخشت دروستکراون، دەروازەی هاتنە ناوەوەی کاروانسەری ناوبراو پانییەکەی (3.50) مەترەو لە باڵی باشووریدا و لە هەر لایەکیدا حەوت ژوور هەیە، دوای ئەوە دەروازەی فەزای سەرگیراوی بە تاقێکی شێوەی پیتی (V)ی ئینگلیزییەو لە هەردوو لاوەی بەرچاو دەکەوێت، دوو هەیوانیش بە تاقی کەوانەیی هەن، لە سەرەتای ئەم هەیوانانەوە رێگایەکی پلەدار هەیە دەڕواتە پشتی سەقفەکەی و دروستکراوە.

## هەیوان و تاقی گومەزی

ئەم فەزا سەرگیراوە بە فەزایەکی هەشت قاڵو بە تاقێکی گومەزی کۆتایی دێت، لە هەردوولای فەزای هەشت پاڵووەکەدا، دوو هەیوان هەن کە هەر یەکێکیان (3) دەرگای تیادایە، ئەم فەزای گومەزدارە دەچێتەوە سەر دیواری رێگای کاروانسەرا، لە هەر یەکێك لە باڵ'کانی کاروانسەرادا شەش تاقی چوار باڵی هەیە، کە لە پێشەوەی هەر یەکێك لەو تاقانە هەیوانێکی بەرد فەرشکراو دەبینرێت، لە چوارگۆشەی دیوارەکاندا جارێکیتر چوار هەیوانی شەش پاڵو دێت لە بەرامبەر هەر باڵێکدا دەرگایەك دەچێتەوە سەر کاروانسەراکەن بۆ دانیشتنی شا دروستکراوە، لە پشتی تاقەکانی کاروانسەراوە تەوێلە درێژەکان دروستکراون، ئەم کاروانسەرایە بە فەرمانی شا عەباسی سەفەوی دروستکراوە.

بە سەیرکردنی نووسینێك کە لە پادشای سلێمانی سەفەوی (1077-1105) کۆچی قەمەری لێرەدا ماوەتەوە، بە سەیرکردنی دەردەکەوێت ئەم کاروانسەرایە لە سەردەمی پادشا سلێمان و سەدری ئەعزەم شێخ عەلی خان زەنگەنە تەواوبووەو لە بەردەستدابووە. ئەم شوێنە لە سەردەمی نەسرەدین شای قاجاردا چاککراوەتەوە.

سەرچاوە

محوگه تاریخی بیستون

نوینده یوسف مرادی

گهوارتمدن-اردیبهشت 1384

# تیشكێك بۆ سەر كۆچی گەلانی هیند و ئەوروپی و ناوچەی نیشتەجێبوونیان

بەشەكانی باشووری خۆرئاوای كیشوەری ئاسیا شانۆی جموجۆڵی مرۆڤی پێشكەوتوو بوو لە هەزارەی چوارەمی پێش زایین لەمەدا كوردستانی باشووریش لەو شوێنە دەركەوتووانە بوو كە ئەو كۆچانە نەگرێتەوە.

لەناوەڕاستی هەزارەی سێیەمی پێش زایین بەشەكانی خۆرئاوای كیشوەری ئاسیا سەرەتای هاتنی شەپۆڵی و مرۆڤی تیادا دەركەوت كە لە دەشتەكانی ناوەڕاستی ئاسیاوە هاتبوو كە پێدەچێت لە ناوچەی (ئێران ویچ)وە بووبێت كە دەكەوێتە نێوان رووباری سەیحوون و جەیحوون، ئەو ناوچەیەی كە شارەكانی (خوارزم) و ((سەمەرقەند)ی تیادا هەن.

ئەم گەلانە بە ناوی جیاجیا ناسراون كە زۆرینەیان نازناوی ئەوانەش گەلانی هێندو ئەوروپی یان هیندو ئاریین و یان ئاری و ئێرانین، بەڵام لایتر هەیە كە ناوچەی هێلەكانی هیندو ئەوروپی بە قەفقاس دادەنێت و لە یەكەم جاریشدا لە چواردەوری گۆلاوی ورمیٚ جێگربوون، ئەوسا لەوێوە بەرەو باشووری ناوچەكانی دراوسێی رۆیشتوون، لە دەركەوتووترینی ئەو عێلانەش مادو فارسە.

### سیٚ كۆچی سەرەكی

كاریگەرێتی ئەم گەلانە دەستیانكرد بە دەركەوتن لە رووداوەكانی مێژوویی و شارستانێتی دنیای خۆرهەڵاتی كۆندا لە ناوەڕاستی هەزارەی دووەمی پێش زایین ئەوەش لە رێگای دەوڵەتی میتانییەوە بوو لە سنووری ناوەڕاستی هەزارەی یەكەمی پێش زایین ئەم گەلانە توانیان سەركەوتن بەدەستبهێنن و سەركردایەتی دنیای خۆرهەڵاتی دەوری كۆن بكەەن لە رووی رامیاری و شارستانییەتەكەوە. ئێمە لە ئێستادا 3 كۆچی سەرەكی ئەو گەلانە دەزانین كە لە رووی كات و شوێنەوە دابەشبوون بەشێوەی جیاجیا. كۆنترین كۆچ لە رووی سەردەمەوە هی میتایەكانە كە توانیان سەركەوتووبن لە دامەزراندنی دەوڵەتێكی بەهێز كە ناوچەكانی

ناوەڕاست و باکووری زاگرۆسی گرتەوەو دەسەڵاتی درێژ بۆوە هەتاکو گەیشتە خۆرئاوای فورات، هەروەها کۆمەڵێکیتریش لە بەرزاییەکانی ئانازرۆل جێگربوون و دەسەڵاتیان بەسەر دانیشتوانی ناوچە رەسەنەکەدا رۆشت کە وڵاتەکەیان بەناوی (خاتی) یان (حاتی) ناسرا بوو، کە توانیان لە سنووری چاخی (13) پێش زایین دەوڵەتێك دروستبکەن کە لەو دەوڵەتە گەورانە بوو لە خۆرهەڵاتی کۆندا بەناوی ئیمپڕاتۆریەتی (هیتی) نەشونمای دەوڵەتەکەش لە رووی رامساری و سەربازییەوە دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی فەرمانڕەوایەتی دەوڵەتی (میتانی) لە سنووری چاخی (14) پێش زایین لەوانەشە لەگەڵ ئەم دوو شەپۆڵەدا کۆمەڵانیتریش هاتبن، بەڵام لە ناوچە دوورەکاندا بڵاوبوونەتەوەو لە یەکتریشەوە دووربوون، لەناو رووداوە رامیارییە گەورەکانیشدا رۆڵیان نەبووە کە لە ناوچەکانیانا لە قۆناغەکانی مێژووی داوتردا دروستبووە.

شەپۆڵی یەکەمی گەلانی هیندو ئەوروپی دەخرێنە پاڵ کاشییەکان کە توانیان لە وڵاتی میسۆپۆتامیا دەسەڵاتی سیاسی وەربگرن لە سنووری چاخی 17ی پێش زایین کە بەردەوام فەرمانڕەوایەتیانکرد هەتاکو چاخی 13 پێش زایین هەتاکو ئەو کاتەی دەوڵەتی ئاشووری توانی کۆتایی بە دەسەڵاتیان بهێنی و دەوڵەتێکی یەکگرتوو بە سەرۆکایەتی ئاشوورییەکان دابمەزرێنێت.

## مێژووی ئەسپ و سوارچاکی

دەرکەوتووترین خاڵی هاوبەش لە نێوان کاشییەکان و میتانییەکان و هیتییەکاندا بنەچەی هاوبەشیانە لە پەرستنی خوای هاوبەشیانە لە پەرستنی خوای هاوبەشیاندا بەناوی (میترا) و (ڤارۆنا) و (ئاندرا) هەروەها مێژووی ئەسپ و سوارچاکیش لە خۆرهەڵاتی دووری کۆن پەیوەستە بە دەرکەوتنی ئەم گەلانە و بڵاوبوونەوەیان و دروستبوونی مەملەکەتەکانیان ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوانەی لە پشتی هێنانی ئەسپەوە بوون و زۆری بەکارهێنانی لە ناوچەکەدا هەروەها سەروەری بەکارهێنانی ئاسن و چەکی و ئاسنیش هەر بۆ ئەوان دەگەڕێتەوە، هەر ئەو هۆیانەشبوون وەکو بەکارهێنانی ئەسپ و چەکی ئاسن سەرکەوتنیان بەدەستهێنا لە گۆڕەپانی شەڕەکاندا، بەڵام شتی هاوبەش لە نێوان کۆمەڵەی گەلانی ئاری بەپێی نیشتمانی رەسەنیان هەرێمی (ئێرنویج) یان گەلانی هیندی ئێرانی بەپێی ناوی ئەو دوو هەرێمەی لێوەی

هاتوون ئەم گەلانە کە ئێران و هیندەیان گەلانی هیندو ئەورووپی بەپێی دوورترینی ئەو هەرێمانەی کۆچی ئەم گەلانە پێیگەیشتوون کە هیندو ئەوروپاییە، هەر ئەومانەش بنەچەیەکی هاوبەشی زمانیان هەیە کە لە خێزانێکی گەورەی زماندا کۆبوونەتەوە کە ناسراوە بەناوی بنەماڵەی زمان هیندو ئەورووپییەکان یان هیندو ئێرانی. هەروەها هەندێك لە لقەکانی ئەو کۆچانەش سوودمەندوون لەو زمانانەی کە لە مەرکەزە شارستانییەتەکاندا هەبوون و ئەمان کۆچیان بۆ کرد، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی زمانەکەی خۆیان لەبیر بچێتەوەو بە زمانە نوێکە قسە بکەن و بنووسن کە هی مەرکەزە شارستانییەتەکەیە و دەسەڵاتی هەبووە لە ناوچەکەدا، لەوانە میتانییەکان کە بە خوری قسەیانکردووە، ئەو زمانەی کە کاریگەرێتی بابلی بەسەرەوەیە بەشێوەی بزماریش نووسیویانە.

## ناوی بابلییان لە خۆیان ناوە

هەروەها کاشییەکان کە زمان و شارستانێتی نێوان دوو رووباریان وەرگرتووەو کاتێکیش گەیشتوونەت ئەو پایەیەی ناوی باوك و باپیریان لەبیرچووە ناوی بابلییان لەخۆیانەوە ناوە، بەڵام هەندێك لەم گەلانە بەشێك لە ئاسەواری زمانیان بۆ دراوسێکانیان جێهێشت نموونەش بۆ ئەمە هەندێك وشەی میتانییە لەناو فەرهەنگی ئاشوورییەکاندا.

لە بەشی خێزانەکانی زمانە هیندو ئەورووپی و هیندو ئێرانیدا کە زۆرینەی زمانەکانی ئەم دوو هەرێمە کۆن و نوێیە لقی لێبۆتەوە کە لقەکانی هێتی و ئەرمەنی و هیلیینیە واتە زمانی ئەغریق و سلافی ئیتاڵی و حەرمەنیە. ئەم زمانانە لەناوەی ژیانیاندا زنجیرەیەك گۆڕانکاری زۆریان بەسەرداهاتووە ئەوەش بەهۆی بارودۆخی نوێیان و چۆنیەتی هەرێمەکان دروستبووە کە کۆچیان بۆیکردووەو چۆنێتی ژیان لەو هەرێمانەشدا کە نیشتمانێکی نوێ بووە بۆ ئەو کۆچەریانەی کە هاتوون دەوری بووە.

بەڵام لەبارەی کۆچی ئەو گەلانەوە وەڵامێکی دیاریکراومان بەدەستەوە نییە لەبەر ئەوەی ناوچەی دانیشتنی رەسەنیان لەناوچە بە پیت و بەرەکەتەکانە و پڕە لە فەڕ ئەگەر لە پشتی هەرێمی رووبار یان قەفقاس بوویێت، هەروەها کۆچی بزواتی ئەم گەلانەش بە پیت و فەڕبوون و تاوانیان نەشونما بکەن و

ناوبانگی مێژوویان بڕوات، لە دەرکەوتووترین ئەو شوێنانەی ڕۆخەکانی دەریای قەزوینە، ئەمەش بەڵگەی کەمی خۆراك لە هۆکاری کۆچەکاندا لاواز دەکات کە هەندێك لە لێکۆڵەران راسن لەسەرلا وایە بۆیە باشتر وایە بڵێین کۆمەڵێك هۆکار بڵێین کۆمەڵێك هۆکار ئەوەی جولاندووەو پاڵی بەو گەلانەوە ناوە بۆ کۆچکردنیان لەوانەیە یەکێکیان بارودۆخی کتوپڕی جوگرافی بوویێت کە کاریگەرێتی هەبووە لەسەر گەلانی شوانکارە بەزۆری کە بەو هۆیەوە پاڵی پێوە ناون و گەڕاون بەدوای لەوەڕگاو شوێنی بە پیت و فەڕی نوێ. بەهۆی ئەو هۆکارانە ململانێی لەگەڵ گەلانیتریشدا دەستپێکرد، بەو هۆیەوە لە ڕۆشتنیان فشاریان خستووەتە سەریان بەرەو ئەو شوێنانەی کە بۆی ڕۆیشتوون لەلای خۆرهەلاتەوە،

ئەمانە کۆمەڵەی عێلە کۆچەرییەکان بوون کە بەردەوام فشاریان بۆ سەر وڵاتی پشتی ڕووبار هەبووە لە سەردەمی کۆرشی هاخامەنشی کە بەو هۆیەوە کۆمەڵێك قەڵای دروستکرد لەسەر ڕۆخی ڕووباری سەیحوونی باشووری بۆ پاراستنی ناوچەکە لە هێرشی عێلەکانی سکایی لە هۆکارەکانیتریش کە پێویستە لێی بە ئاگابین و پاڵی ناوە بەو عێلانەی هیندو ئەورووپی کە بەرەو خۆرئاواو باشووری ناوچەکانی شارستانیەت کۆچبکەن ماوەتەوە چەسپاوە ئەوەش هۆکارێك بووە کە بەردەوام کۆچەرییەکان و شارستانیەکان لە ململانێدا بژین بۆیە نامۆ نییە گەلانی ئاری بەرەو مەرکەزە شارستانیەتەکان ڕۆشتبن، ئەو گەلانەش کە لەسەر شێوە خۆیان ماونەتەوە بەردەوام لە کۆچکردنا بوون هەتاکو سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زایین هەواڵی ئەمانەش لە ڕێگای نووسینەکانی ئاشووری بەدەستمان گەیشتووە لەکاتی بەگژداچوونەوەیاندا دژی عێلەکانی مادو فارس. کۆمەڵەی شەپۆلی یەکەمی ئەوانی بەرەو خۆرئاوا بوونەتەوەو لەوێشەوە بەرەو باشوور و ڕێگای (بۆلان)یان بڕیوە لە شاخەکانی هیند کۆش ئەمەشیان بۆ ئەوو بووەو لە ناوچەکانی هیند بە گشتی و خەوزی سەند بەتایبەتی بمێننەوە. ئەمانە تەمسیلی لقی هیندی ئەکەن و لەو شەپۆلانەی گەلانی (هیندی ئەورووپی)یشن.

حەوزی سەند شاریتانیەتێکی پێشکەوتووی بینیوە لە هەزارەی سێیەمی پێش زایین لە ڕووی هونەری تەلارسازی و سیستەمی ئاودان و جموجۆڵی بازرگانی کە گەیشتووەتە شوێنە دوورەکانی وەکو میۆپۆتامیا، بەڵام مەرکەزە داگیرکەرەو هیندییەکان بوو لە سنووری چاخی 17ی پێش زایین کە توانیان کۆتایی بە دەسەڵاتی مەملەکەتی شارەکانی (سەندی) کۆن بهێنن.

لەگەڵچ ئەم شەپۆلانەدا کە هەزارەی دووەمی پێش زایین هێنای شەپۆلی عیلەکانی ئێرانی دەرکەوتوون کە دەرکەوتنیان بە ڕوونی لە هەزارەی یەکەمی پێش زایین بینراوە. کە پاشماوەی

شوێنەوارییەکانیان لە گۆڕە لە (تەپەی سیالك) نزیك تاران دۆزراونەتەوە هەروەها دەقەکانی ئاشووری لەسەر مادو فارس بەڵگەی سەلمێنەرن.

## شانۆیەکی سەرەکی بووە

دوای شەپۆلی گەلانی ئاری هێلەکانی سکایە کە رووەو خۆرئاوای نیشتمانی رەسەنیان رۆیشتوون لە سنووری چاخی 2ی پێش زایین ئەو کاتەی (میتریداتس)ی یەکەم توانی ئیمپڕاتۆریەتی ئارشاکی دابمەزرێنێ و ئەو عێلانەش لەناو عێلەکانی دەوڵەتی نوێدا توانەوە.

وڵاتی ئێران شانۆیەکی سەرەکی بووە بۆ کۆچی گەلانی ئاری کە هەندێکیان لە دروستکردنی ئیمپڕاتۆریەتی گەورەیاندا سەرکەوتن کە هەموو ناوچەکانی خۆرهەڵاتی دووری کۆنی گرتەوە کە دەوڵەتی ماد یەکێکە لە کۆنترین ئەوانە، دوای ئەویش دەوڵەتی هاخامەنشی و ئارشاکی و ساسانی بەدوای یەکتردا دێن.

**سەرچاوە**

**علی اکبر سرفراز، بهمن فیروز**

**مندی/ مجموعه دروس باستان شناسی و**

**هنر دوران تاریخی/ چاپ اول 1373، ل20-2**

# تیشکێك بۆ سەر مێژووی ئیلامییەکان

ئێرانییەکان، ئیلامییەکانیان بە ناوی (خوجەو) (ئوجە) ناسیووەو (خوجستان) و (خوزستان)یش ناوی پارسی ئەو سەرزەمینەن.

سۆمەرییەکان، ئیلامیان بە هێمای کورتکراوەی (نیم) دیاریکردووەو ئەم واژەیەش لە سۆمەریدا بە مانای بالاّ دێت. ناوی شوش و ئیلام بەو شێوەیە هاتووە کە دوو سەرزەمینی کیشوەرێکی گەورەن. لە تابلۆ نووسراوەکاندا کە بەدەستگەیشتوون لە رۆژگاری (گودیای لەگش) کە یەکێکە لە پادشا ناودارەکانی سۆمەر و بابل لە سنووری 2400ی پێش زایین.

لە تابلۆیەکدا کە بە زمانی ئیلامی نووسراوە، بۆ پادشایەکیان دەگەڕێتەوە کە لە حەوت تەپەی خۆزستان بەدەستگەیشتووە، پەیوەستە بە 1500ی پێش زایین ناوی خوزستانی تیادا تۆمارکراوە هەروەها ناوی خوای (ئینشۆسیناك)یش هەیە. وشەی شوشەن بە زمانی عیبرانی بە مانای گوڵە زەنبەق دێ و شوێنەکەش شارێکە لە یۆنانیەکان بە سوسای ئیلام ناویان بردووەو ئیلامییەکانیش هەر بەو جۆرە سوسیانا ناویان بردووە. شوشەن یان شوشان وێنەیەکیتری ناوی شوشە و ئەم وشەشە لە نووسینەکەی ئاشوور پانیپاڵدا دەربارەی هێرشەکانی بۆ سەر ئیلام بەدەستگەیشتووە. گوتراوە کە یەکێك لە پادشاکانی (کیش) لە نێوان دوو رووبار سەرزەمینی ئیلامیان داگیرکردووە، بەڵام بۆ ئەم داوایە بەڵگەی مێژوویی نییە. ئەم نەتەوەیە لەگەڵ گەلانیتری دامێنەکانی زاگرۆس و وەکو لۆلۆیی و کاسیی و گوتی پەیوەندی نزیکیان بە یەکەوە هەبووە بۆیە دەتوانین بڵێین نێوان هەموو ئەو مرۆڤانەی دانیشتووان خۆرئاوای ئێران لە رووی نەژادو فەرهەنگییەوە پتەو و بەهێزبووە لە هەزارەی دووەمی پێش زایین لە هەزارەی دووەمی پێش زایین زنجیرەیەکی نوێ لە فەرمانڕەوایان هاتنە سەر کورسی دەسەڵات و پادشاکان ناوی خۆیان بە پەیامبەری خوانا، واتە باوك و شا، لە ئانزان و شوش.

قەواڵەکانی ئابووری بە زمانی ئەکەدی و پەیوەست بەم چاخە نیشانی دەدات کە بارودۆخی ئابووری روو لە چاکبوون بووە لە هەزارەی دووەمی پێش زایین ئیلامییەکان هێرشیان بردە سەر نێوان دوو رووبار و بابلیان داگیر کردو تالاّنیەکی زۆریشیان برد کە لە نێوانیاندا یادگاری یاساکانی

حامۆرابی بۆ (سوس)، بەڵام دوای حامۆرابی کاری فراوانخوازی ئیلام پێشی لێگیرا. هەر لەم رۆژگارەشدا بوو کە ناوی ئیلام لە ساڵنامەکاندا کوژایەوە، بەڵام دوای چاخێك سەری هەڵدایەوە لە رۆژگاری فەرمانڕەوایەتی (کوتیرناخوتنە)ی شاری ئیلام ناویان دەرکەوتەوە.

لە رووی سەرچاوەی نەژادی ئیلامیەکانەوە ناتوانین بە ئاسانی نیشانی بدەین کە لەچی نەژادێکن، بەڵام دەتوانین رابدەین کە تێکەڵاون، وەکو دەریشدەکەوێت هەتاکو ئێستا نەتوانراوە هیچ جۆرە پەیوەندییەك لە بارەیانەوە دروست بکرێت تاوەکو نیشانی بدەین کە یەکێکن لە گەلە ناسراوەکان، بەڵام لەوانەیە لەگەڵ گەلانی کوێستان نشینی زاگرۆس پەیوەندی نزیکیان هەبووبێت. دیوارەکانی کۆشکی وێرانەی داریۆش لە شوش کە لە سنووری 500ی پێش زایین بیناکراوە نەژادناسان و وێنەی 3 جۆر مرۆڤیان دیاریکردووە. هەندێکی لەوانە سپی پێشتن و لە رواڵەتدا وەکو دەردەکەون ئارياین، کۆمەڵەیەکیتر بە رەنگ قاوەیین، بەڵام ئەوانیتر رەشن. هەتاکو ئەمڕۆش کەسانی رەش پێشت لە خوزستان دەبینرێن، بەڵام بە هیچ شێوەیەك ناچنەوە سەر رەش پێستەکانی ئەفریقی. لەوانەیە کۆمەڵگای ئیلامی کۆن تێکەڵاو بووبێت و یەکەمین دانیشتووی رەش پێستیش لەو ناوچەیە هەبووبێتز لەلایەکیتر پاسەوانەکان قاوەیی پێستن و وێنەکانیان بە دیوارەکانی کۆسکی شووشەوە دیارەو نەخشکراون. ئیلامییەکان بەڵگە بەدەستەوەیە کە کێونشینن و بە دیمەن دەچنەوە سەر تایەفەی لوڕو بەردەوامیان داوە بە مانەوەیان. پێشتریش لوڕەکان لە کێوەکاندا ژیاون و خاوەنی داوبونەریتی خۆیان بوون و لە دەشت دانیشتوون و لە باڵادا لەوانیتر بڵندتر بوون. دەربارەی پێستی رەشی ئەمانە لە چ رۆژگارێکدا یەکەمین مێژووی کۆچکردنیان دەستی پێکردووەو وەکو دەریش دەکەوێت لقێك لەمانە لە ئەفریقاوە کۆچیانکردووە بۆ عەرەبستان و لە رێگەی دەربەندی هورمزەوە بەرەو بەرزاییەکانی باشوور رۆیشتوون و لەوێدا ماونەتەوە. کۆمەڵێك لەمانەش لە بەرزاییەکانەوە بەرەو کیشوەری هیند کۆچیانکردووەو بەوانە نازناوی نگریتۆیان داوە بە مانا رەش پێست.

دواتر لە باشوورەوە کۆمەڵێکیتر بەرەو میدیترانە و بەرزاییەکانی قەفقاز چوونەتە ناوەوەو لەوێدا جێگیربوون. ئەم حاڵەتە لای مرۆڤناسەکان دژواریەکی دروستکرد بەهۆی ئەوەی دانیشتووانی ئەمڕۆی ئێران بەو سەیرکردنەیان ناتوانێت نەتەوەی خۆی بناسێ و بزانێت بۆچی بنەماڵەیەك دەگەڕێتەوە. لەبەر ئەوەی لە رۆژگاری کۆندا بەرزاییەکانی ئێران هێرشی زۆری دوولایەنی کراوەتە سەرو ئێرانیش لە راستیدا وەکو پردێك وابووە کەوتۆتە نێوان خۆرهەڵاتی دوور و وڵاتی نێوان دوو رووبار. بەو هۆیەوە بەشی باشووری ئێران لە رووی نەتەوایەتی و

زمانەوە چەند جۆرو جیاوازی بووە. مرۆڤناسەکان کە لێکۆڵینەوەی تایبەتیان لەسەر ئێسکەندی گەلان کردووە دڵنیایان داوە کە نێوان دوو رووبار هێڵی سنووری خۆرهەڵاتی هاوشێوەکانی سامی بوون،

ئەو سامیانەش بەناونیشانی گەلانی میدیترانەیی بە قاوەیی پێست دەناسرێن کە لە عەرەبستانەوە بۆ نێوان دوو رووبار هێرشیان بردووە، بەڵام لە رۆژگارە کۆنەکاندا لە ئێراندا نەنیشتوون بۆیە پێدەچێت ئەوەی زانراوەو دەرکەوتووە زاراوەی جوگرافی و فەرهەنگی شایەتی لەسەر ئەوە دەدەن مرۆڤی نەژاد رەش لە رۆژگارێکدا بەرەو باختەر رۆشتووە نیوە دورگەی ئەو کیشوەرەی بەو رێگایەدا بڕیوە بە درێژایی رۆخی کەنداوی فارس. نووسەرانی یۆنانیش حەبەشەکانی باشووری خۆرهەڵاتی ئێرانیان کە لە ئاخاوتنەکانیاندا جیاوازیان لەگەڵ سپی پێستەکاندا هەیە ئەوانەیان هەرگیز بە عونسوری گرنگ یان گەورەیان کۆمەڵگای بانەکاندا دانەناوە. عونسورە دیاریکراوەکانی زمانی ئیلامیش لە کۆمەڵەی زمانی ئەمڕۆدا تەنیا بە ناوچەی قەفقازدا دەردەکەوێت کە هەبووە، بەڵام ئەو بەشەی زمانی ئیلامی و زمانەکانی تامیلی و دراویدی باشووری هەر وەکو دەبینرێت لە یەکتری دەچن. هەروەها ئەو لە یەکچوونەش بەزۆری لەناو عونسورەکانی زمانی ئیلامی لەناو زمانی گۆتیەکان و لۆلۆییەکانی دانیشتووی دامێنەکانی زاگرۆس و خالدییەکانی دانیشتووی کێوەکانی ئەرمەنستانی کۆن و هۆرییەکانی دانیشتووی پێچاو پێچی فوراتی گەورەو بەشێك لە گەلانی ئاسیای بچکۆڵە وەکو هیتییە کۆنەکان و لۆکیاییەکان و لۆدییەکان دەبینرێت ئەم شێوە لە یەکچوونانەیان هاوشێوانە ناتوانن هاوبەشی بکەن لە دروستکردنی زمانی زانستیدا،

بۆیە سوڵتەی ئێرانییەکانی خستە سەر ئەوەی کە بڵێین لوڕەکانی ئیلامی لە چاخەکانی ناوەڕاست و بەدواوە بە زمانی پارتی قسە و گفتوگۆیان کردووە، بەڵام لە سنووری 1000ی زاینیدا جوگراقی ناسانی عەرەبی جارێکیتر لە خاڵە جیاجیاکاندا خۆزستان بە زمانێکی تێنەگەیشتوو لە قەڵەم دەدەن کە قسەیان پێکردووە ئەویش زمانی (خوزی)یەکە بە زمانی ئیلامی ناسراوە.

ناوی خوزی لە قۆناغەکانی ئێرانی کۆندا هەر بەو شێوەیە هاتووە هەتاکو داریۆشی گەورەش لە ئیلامی قسەی پێکردووەو لە هۆزەکەی خۆشیدا ناو بردووەو هۆزەکەشی لە هەمان نەژادی ئیلامی بووەو دوای ئەسکەندەریش رێزیان لە فەرمانڕەوایانی یۆنانی گرتووە. لێرەدا پێویستە بپرسین ئایا ئیلامییەکان لە کام نەتەوە بوون؟ جوگرافی ناسانی عەرەب لە سەرەتای

ئیسلامدا له وەسفی خۆزییەکاندا به کەسانی شێوە ناشیرین و زبرو شەرکەریان داناون. هەزاران ساڵیش بەر له ئێستا ئاشوورییەکان و بابلییەکان هەمیشه ئیلامییەکانیان به شەڕەنگێز ناوبردووە، بەڵام ئەوان بۆ بەرچاوی دوژمنانیان ترس و لەرزیان بۆ هێناون،

هەروەها به قورسیش سەرچاوەی خراپەکاری بوون بۆ دراوسێکانیان له نێوان دوو رووبار، بەڵام ئیلام لەبەر چاوی دوژمنیانیاندا به وڵاتی جادوگەران و رۆحه پیسەکان دانراون.

ئەگەرچی ئەو هەستکردنەی سۆمەرییەکان و ئاشوورییەکان له سەرچاوەکانیان شوێنی گومانه، چونکه لەو دڵەو هاتووە که نووسین و زمانی ئیلامی بەر له 3 هەزار ساڵ پێش زایین دەرکەوت، بەڵام بەر لەوان سۆمەرییەکان نووسینی وێنەیان دۆزییەوە تاوەکو بتوانن حساباتی خۆیانی پێ بنووسن. ئەم دۆزینەوەیه دوایی بووە سەرچاوەی سوود لێوەرگرتنی لەلایەن ئیلامییەکانەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا که له شته بچکۆڵەکاندا جیاوازییان هەبە، بەڵام نووسینی ئیلامی له بنەمادا لەسەر تەرزی سۆمەری دروستبووە بۆ ئەوەی له رێگاکانی بازرگانیدا بەخێرایی سەرچاوەی سوود لێوەرگرتن بێت.

نووسینی ئیلامی کۆن لەوانەیه له 150 پیت درویت بوو بێت به رێگای جولانەوەی لێو قسەی پێکرابێت.

سەرەتای ئەم نووسینه بۆ 2900ی پێش زایین دەگەڕێتەوە که به شێوەی ساکار دەرکەوتووەو سوودی تەواویشی له زمانی سۆمەری وەرگرتووە له رووی رێکخستنییەوە بەو شتانەی لەبەرچاون یان دەردەکەون، هەردوو لاش کاریگەریەتیان بەسەر یەکترەوە هەبووە.

ئەم دوو نووسینه تەنیا کاری بازرگانیان پێ جێبەجێنەکراوە، بەڵکو کاری شەخسی و سیاسی و مێژوویی و بۆ مەزەبیش سوودیان لێ بینراوە.

نووسینی ئیلامی وردەو وردە هێماکانی کەمبۆتەوەو بووەته خاوەنی هەستا هێماو هەروەکو ئاماژەماندا به شێوە ستوونی نووسراوە. له پاشماوەکانی ئەم نووسینه بەردە نووسراوێکه به نووسینی ستوونی ئیلامی نووسراوەتەوەو بۆ پادشایەك دەگەڕێتەوە که له سنووری 2250ی پێش زایین فەرمانڕەوایەتی کردووە ساڵی 1961 لەلایەن (بۆرك) 3 هێمای له 55 هێما خوێندۆتەوەو ئاشکرای کردووە که ئەمە بەردێکی نووسراوی بابلییە، دواتر کێشەی هێماکانیتر زانایانیتر توانیان شیان بکەنەوە.

نووسینی ستوونی ئیلامی له 2230 پێش زایین به مردنی (کوتیك ئینشو شیناك) کۆتایی هات، له ئەنجامدا نووسینی سۆمەر-بابلی (ئەکەدی) شوێنی گرتەوە.

کاریگەریەتی ئەم نووسینه له چاخی 25 یان 24ی پێش زایین بەردەوامی هەبوو.

نووسینی مێخی ئەکەدی بەشێوەی ئیلامی سەرچاوەی گۆڕانکاری و لێکۆڵینەوە بوو، تاوەکو سنووریکیش ئەلفبای بەرەو پێش برد. لە نووری 250ی پێش زایین نووسەرانی ئارامی بەو زانیاریانەی لایان هەبوو نووسینی مێخی فارسی کۆنیان دۆزییەوە کە بۆ داریۆش نێردرا. ئەم نووسینە بۆ نێوانی نووسینی مێخی و نووسینی ئەلفبا دانا کە دۆزرایەوە.

پێشەوایانی چاخی نۆزدەیەم کە هەستاون بە دۆزینەوەی نووسینی مێخی ئیلامی پێکهاتوون لە (ویستەرگارد)، (هینیکس)، (راولەنسۆن)، (نوریس)، (ئۆپەرت)، (وایسباخ) ئەمانە لەو رۆژگارەیاندا کاریان تیایدا کردوو هەتاکو ئێستاش ئەو کارکردنە بەردەوامە و توانیان چەند هێمایەکی جیاجیای تایبەت لە تابلۆکانی گەنجینەی داریۆشدا بدۆزنەوە.

باسی مێژووی ئیلامی ناتوانین بیگەیەنینە ئەنجام لەبەر ئەوەی لە نەمادا ئەو مێژووە لە تابلێتەکانی مێخی ئەکەدیانە نووسراوە، بۆیە باسکردنی کورت دەهێنێ. جگە لەوە ئیلامییەکان لەگەڵ حکومەتەکانی نێوان دوو رووبار لە جەنگدا بوون بەهۆی ئەوەی پەیوەندیتر لە نێوانیانا نەبوو.

ژنان لە کۆمەڵگای ئیلامی کۆندا بەرێژەی پیاوەکان گرنگیان پێدراوەو مافی گەیشتنیان بە دەسەڵات وەکو میسر هەبوو کە لە رێگای دایکەوە گوێزراوەتەوە. لە ناویانا شوکردن بە مەحرەم رێگا پێدراو بووەو هاخامەنیشینەکانیش ئەو مەزەبەیان لەوانەوە پێگەیشتووە.

ئیلامییەکان زووتر لە گەلانی ناوخۆیی لە بەرزاییەکاندا دەرکەوتوون لە رۆژگاری دایکسالاریدا و لە رۆژگاری باوك سالاریشدا ژنی ئیسلامی مافەکانی بەر لە هەموو گەلانی ئاسیایی وەرگرتووەو مامەڵەی بازرگانی و قەواڵەکانی ئامادە کردووەو وەکو پیاویش لە میراتدا بەشی خۆی بردووە هەروەها لە ماڵی خۆیدا وەسیەتنامەی رێکخستووەو توانیویەتی خۆی بکاتە خاوەنی و زۆرجاریش گەیشتووە بە دەسەڵات لە رێگای بنەمای دایکایەتییەوە.

ئایینی ئیلامی لە بنەمادا کەسایەتییەکەی لە فرە خوایەتییەوە دروستبووەو بیناکراوە لەسەر رێزگرتنی فراوانی دایکان و مارەکان کە رەگ و ریشەی سیحر و جادووە. لە راستیدا خاڵەکانی پەیوەست بە مارەوە لە بزووتنەوەی پێشکەوتنی شارستانێتی ئیلامیدا دەبینرێت. شێوەی مار رووی قاپ قاچاخە گلێنەییەکانی داپۆشیووەو بەناونیشانی پارێزگاری لە دەروازەکان بەکاریان دەهێنن. لە بەردە نەخشکراوەکانی پادشاکانی کۆن، وێنەی مار لە چواردەوری درەختی ژیان و دیمەنی بەردایەویەتی و وێنەی مارەکە تاوەکو میسر رۆشتووە. خواکانی هاوشێوە وەك (پینیکر) و (کیریشا) هەبوون و دایکیش خوا بووەو پادشاکان و شازادەکانی ئیلامی پەرستگایان بۆ ئەوانە داناوە. لە هەزارەی دووەمی پێش زایین کە دایکسالاری جێگای

خۆیداوە بە باوکسالاری ئەو خوایانە لە پایەی خۆیاندا وازیانهێناو خوای کوڕ کە خوای گەورە بوو ناچار بوو جێگای خۆی بە ئەو بدات (هومبان)یش کە ناوی بوو لە سەرتاسەری ئیلامدا بووە سەرچاوەی پەرستن.

بەڵام هەتاو خوایەك بوو بەناوی (ناهونتە)، کە ناوی بە مانای خوای رۆژ دێت، مانگ خوایەکە لە ئیلام هەیە و لە راستیدا بۆ هەموو وێنەکانی ئەستێرەکان و تواناکانی سروشتی و دەریاییە و بەو جۆرە بووەتە سەرچاوەی پەرستن بۆ ئیلامییەکان.

ناوی (مانگ)ی خوا، هەمیشە لە نووسینەکانی ئەکەدییا بە شێوەی (سین) نیشاندراوە. سیفەتی ئەم خوایە درەوشاوە بووەو لەناو ئیلامییەکانیشدا مانگ لە پێشوودا بە باوکی هەتیوەکان ناسراوە. بەرجەستەترین خوای ئیلامی (سیموت) یان (شیموت)ەو لە سەرتاسەری ناوچەکەدا سەرچاوەی پەرستن بووەو ژنەکەی ناوی (مانزات) بووە.

ئیلامییەکان خاوەنی باوەڕێك بوون کە هەموو خواکان خاوەنی هێزی نهێنی خۆیانن بەناوی (کیتن). (کیتن) دەبڕین لە فرە خوایەتی دەکاو بۆ پاراستن بەکاریان هێناوە. پادشاکانی ئیلامیش سوڵتەکەیان لە بنەچەدا لەژێر پاراستنی جادوی (کیتن)دا بووە. لە راستیدا زانیاری تەواومان لەسەر ئایینی ئیلامی لەبەردەستدا نییە. لە رووی یەکێك لە مۆرەکان وێنەی خوایی دەبینرێت و کەسانێك ئەویان لەسەر تەختە رەوانێك هەڵگرتووەو لە پێشەوەی کەسانیتر هەن دانیشتوون و مۆزیقا دەژەنن و لە رۆخی رێگاکەشدا مرۆڤ هەن. پەیمانی پێدەدەن. رۆشتنی ئەم کۆمەڵانە کە بۆ پەرستنی خواکانە و لە رێگاکەاد هەڵیانگرتووە لە سەرتاسەری نێوان دوو رووبار کاری پێکراوە. ئەو شتەش تایبەتە بە ئیلامییەکان. لە پەرستگادا ژمارەیان پەیکەرو سەکۆی قوربانی هەیە و قوربانییەکان لەسەریان پێشکەش دەکرێن. ئەم پەرستگایانە پێشووتر لە جێگای بڵند بووە. پەرتگایەك بە عەزمێکی بەهێزو گەورەو پتەو لە مەرکەزی ئەنشان ماوەو ئەوە لە کێوێکی بەرزدایە کە دەڕوانێت بەسەر رووباری (فەهلیان) و دروستکراوە، نەخشی بەرجەستەکراو لەم جێگایەدا کە هەیەو شایەتی پەیوەستی دەدات بە (2000) ساڵ پێش زایین، تیایدا پیاوانی ئایینی دەردەکەون کە قوربانی پێشکەش دەکەن. لەو شوێنەدا نەخشی دوو خوا لەسەر تەختەکانیان دەبینرێن کە مارەکان بۆیان دروستکردوون. یەکێکی دیکە کە تایبەتە بە پەرستگای ئیلامی کێڵگەی دەغلۆدانی پیرۆزە کە لە بەشێك لە نووسینەکەیدا یادکراوەتەوە. ئاشوور بانیپاڵ لە نووسینەکەی خۆیدا لە ساڵی 636ی پێش زایین لە سەرچاوەی وێرانکردنی شووشەوە دەڵێ: ((پەرستگای ئیلامییەکانم لەگەڵ خاکدا

تەخت کردوو خواکانیانم دا بەدەم باوە. سەربازەکانم چوونە ناو کێڵگەی دەغڵودانی پیرۆزەوە لە کاتێکدا کە هیچ بێگانەیەك نەیتوانیوە قاچ بخاتە ئەو شوێنەوە)).

ئەوەی شیاوبووە لەو پەرستنەداو کاری پێکراوە لەگەڵ مۆسیقادا بە ئەنجامگەیەنراوە. لە رووی نەخشێك کە پەیوەستە بەو سەردەمەو بۆ 2250ی پێش زایین دەگەڕێتەوە (کوتێك ئینشۆ شیناك)، پاشان ئیلام مافی دا بە گۆرانیبێژەکان، کە لە بەرامبەر دەروازەی ئەستی ئەو پەرستگایەی کە دروستی کردووە بۆ خوا ئینشۆ شیناك ئاواز بخوێنن. قوربانی بەو شێوەیە بۆتە بەشێك لە رێوڕەسمی پەرستگای ئیلامی. ئەو داخوازیانە لە تابلۆی بەڵگەی دروستی ئەو فەرمانەیە کە ئەنجامگیربووە، ئەو کارەش پیاوانی ئایینی دیکەن کە پەیوەستە بە پەرستگاکان و شارەزان.

ئەوەی جێگای سەرنجدانە پیاوانی ئایینی ئیلامی بەڕەوتی ئەو رێوڕەسمە ئەنجامدەدەن. لە رووی یەکێك لەو پاشماوە مەعدەنیانە (شیلهاك ئینشۆ شیناك)ی لەسەر کە بۆ نیوەی دووەمی چاخی دوازدەی پێش زایین دەگەڕێتەوە دیاری پێشکەش بە خوایەکی ئیلامی دەکات، نووسینەکەی سەری بە ئەکەدییە و ماناکەی هەڵهاتنی خۆرە کە خودی شتەکە نیشانەی خۆر پەرستییە، (ئەندری پارۆ) دەڵێ: ((هیچ رووداوێکی خواپەرستی لەو پەیکەرە دەرکەوتووتر نییە)). پەرستگاکان لەسەر شێوە زەگوارت دروستکراون و پیاوە ئایینییەکان ئافرەتە ئایینییەکانیش لەو خزمەتەدا هاوبەشی دەکەن، ئەوەی گرنگ و تایبەتیش بێت لەمەدا پەرستگاکانی ئیلامی رووەو خۆر دروستکراون کە پەیوەستن بە هەزارەی سێیەمی پێش زایین ئەوەی بەدەستگەیشتووە لە پەرستگا شاخییەکاندا بەردی نووسراو شاخیش بەشێکی گرنگە لە دروستکردنی پەرستگادا. لەبەر ئەوەی وێنەی خوا لەوێوە دەردەکەوێت، لە راستیدا (شیلهاك ئینشۆ شیناك) لە چاخی دوازدەی پێش زایین شانازی مردووە کە (20) پەرستگای شاخی چاك کردۆتەوە، بەڵام (500) ساڵ دوای خۆی لە هێرشی داگیرکردنی ئاشوور بانیپاڵ بۆ سەر (شووش) رایگەیاند، کە پەرستگا شاخییەکانی دروستکراوی نموونە لە مەعدەن لە زەگوارتەوە شێوەیان وەرگیراوە. لە سەرەتای چاخی بیستەمدا کاتێك شوێنەوار ناسانی فەڕەنسی گۆزەو گلێنە و جامی نەخشێنراویان لە (شووش) دۆزییەوە وایاندەزانی

پاشماوەی چینییەکانن ماونەتەوە، بۆیە نەیانتوانی پێناسەی تەواو بۆ ناسینیان بکەن، لەبەر ئەوەی دواتر دەرکەوت ئەو سواتەتانە بەشێکی گرنگن، کە بۆ هەزارەی چوارەمی پێش زایین دەگەڕێنەوە. لە (چنامیش)یش شوێنەوار ناسان کۆمەڵێك گلێنەی هونەریان لە ناوچەکەدا دۆزییەوە، کە لە ئەنجامی چاخێك بیرکردنەوەو تەجروبەی هونەری دروستکراون و بۆ هەزارەی پێنجەمی پێش زایین دەگەڕێنەوەو هەتا وەکو ئێستاش بۆتە سەرچاوەی لێکۆڵینەوەی هونەری کە لە هەزارەی سێیەمی پێش زایین شێوە تەواویان وەرگرتن و لای شوێنەوارناسانیش. گرنگی تەواو بە پێشکەوتنی فەرهەنگی ئەو نەتەوەیە و شارستانێتی ئاسیایان درا.

**سەرچاوە**


**دکتر رقیه بهزادی اریاهاونا اریاها/ درچشم اندزکهن تاریخ**

**ایران/ چاپ دووەم، پاییز 1383، لا30-36**

# جوگرافیای ئێران و کاریگەرێتی لەسەر مێژووی ناوچەکە

ئێران رووبەرێکی جوگرافی گەورەی هەیە و دەرکەوتووترین شتێك کە لە زەویەکەیدا هەیە دەشتی گەورەیە وەکو دەشتی لووت و دەشتی کافر کە زۆرینەی بەشەکانی ناوەڕاستی وڵاتەکەی گرتووەتەوە، لە هەموو لایەکیشەوە زنجیرە شاخ دەورەی داوە، بەڵام لە بەرزییاندا جیاوازن، لەناو ئەم زنجیرە شاخانەشدا و لە ئەترافەکانی و رۆخەکانیدا مێرگ و دەشت هەن و کە لە کۆنەوە مرۆڤ تیایاندا دانیشتووەو بوونەتە مەرکەزی ئاوەدانی و شارستانیەت لە ئێراندا.

ئێران لە باکوورەوە دەریای قەزوین (دەریای هەرکانیا) دەوریداوەو لە باشووریشدا کەنداوی فارسی واتە دەریای هەڵهاتنی حۆر (هەروەکو ناوی لە دەقە کۆنەکاندا هاتووە)، بەڵام لە خۆرهەڵاتەوە زنجیرە شاخی خۆراسان درێژبووتەوە بۆ ئەفغانستان و بلوچستان کە تەمسیلی هێڵی سنووری جوگرافی بانەکە دەکات هەروەها شاخەکانی زاگرۆسیش کە نووسیاوە بە تۆرۆس لای خۆرئاوای نێوان ئێران و وڵاتی نێوان دوو رووباری گرتووە.

لەگەڵ ئەوەشدا کە ئێران لە هەموو لایەکییەوە بە زنجیرە شاخ دەوردراوەو جیاوازی لە بەرزییاندا هەیە، بەڵام ئەم زنجیرە شاخانەی کە دەوری بانەکەیان داوە نەبوونەتە کۆسپی سروشتی لەبەردەم هاتوچۆی گەلان و عەشیرەت و کەسەکاندا، لەبەر ئەوەی کۆمەڵێك دەربەندیان شوێنی هاتوچۆیان تیادا هەن کە ناوەوەی بانەکە بۆ ناوچەکانی دراوسێی لە پشتی زنجیرە شاخەکانەوە.

شاخی زاگرۆس تەمسیلی سنووری جوگرافی نێوان ئێران و وڵاتی نێوان دوو رووبار دەکات، ناولێنانی زاگرۆسیش ناولێنانێکی گشتی زنجیرە شاخەکەیە کە لە تۆرۆسی جیا دەکاتەوە، باکووری خۆرئاواو و باشووری خۆرهەڵاتی گرتووەو بە شاخەکانی کوردستان ناسراوە، هەندێ لە بەشەکانیشی بەناوی لورستانەوە (لوڕستانیش ئەو ناوچەیەیە کە ژمارەیەکی گرنگی زۆر لە ئاسەواری وەرشاو پێدراوین کە ناسراوە بەوەرشاوی (لورستان) بەشەکانی تریشی بەناوی شاخەکانی بەختیاری ناسراوە. شاخی زاگرۆس زۆر بەرزو قووڵە و لە درێژبوونەوەکەیدا بۆ باکوورو باشوور ژمارەیەکی زۆر شێوی ئاوداری تیادا هەن ئاوەکەی کاتێك

لە شاخەکان یان کانیاوەکان دێنە دەرەوە سوودی زۆری لێدەبینن، بۆیە دەشتەکانی بەناوبانگن و خێرو بێریان زۆرە هەروەها مێژووش شایەتە بۆ زۆر دانیشتوانەکەی.

لە هەندێك لەم شێوانەدا لقی رووبار دروستدەبێت کە دەچنەوە سەر **دیجلە** وەکو زێی گەورەو زێی بچووك و خابوور. خاڵی بەیەکگەیشتن دروستدەکەن لەو زنجیرە شاخانەدا و لەگەڵ مەرکەزی شارستانێتی نێوان دوو رووبار یەکدەگرنەوە.

لە دووری باکووری زنجیرەی زاگرۆس گۆلاوی (وان) هەیە کە ناوچەی گەلانی ئۆرارتۆیە لە کۆنداو ئەمڕۆ درێژبووەتەوە بۆ خۆرهەڵاتی تورکیا، کە هەندێك لەو رووبارانە بەرەو باکوور لە زاگرۆسەوە دەڕۆن ئاوەکانیان دەچنە ناو ئەم گۆلاوە، هەروەها لە خۆرهەڵاتی زنجیرەی زاگرۆس گۆلاوی (ورمێ) هەیە ئەو ئاوانە لەخۆ دەگرێت کە بەرەو خۆرهەڵات دەڕۆن لە شاخەکانی زراگرۆسەوە ورمێ ئەمڕۆ دەکەوێتە ناوچەی ئزەربایجان لە بەشەکانی باکووری خۆرئاوای ئێرانە.

## شاخەکانی زاگرۆس

شاخەکانی زاگرۆس لە باشووری ورمێ بەرەو تەسکبوونەوە دەڕۆن و بەرزییەکانیان کەمدەبێتەوە هەتاکو لە خاڵەکانی (بەدرە) و (جەسان) نامێنن واتە لەسەر سنووری نێوان دوو رووبار و ئێران لەوێشەوە دەشتەکانی (سوسیانا) دەستپێدەکات کە دەشتەکانی وڵاتی (ئیلامە) پێیدەڵێن (سوسانا) یان (سووسە) کە ناوی پایتەختی هەرێمە کۆنەکەی (سووسە) یان (شووشە)یە ئەو ناوچانەش لە رووی سروشتیی و لەگەڵ ئەوەشدا کە لە هەندێك لە بەشەکانی زاگرۆسدا شێوی قووڵ هەیە، بەڵام هەردەم ئەڵقەی پەیوەندی بوون لە نێوان ئەرمینیا و ئەنازۆل و دەشتەکانی ئاشوور و بابل و نێوان ناوچەی قەزوین دەشتەکانی عیلامدا لەناو ئەم زنجیرە شاخەدا زنجیرەی میدی هەیە کە گرنگترین شاری ئەکبەتانەی پایتەخت (هەمەدانی ئێستا) هەمەدان و تەورێزیش لە باکووردا لە گرنگترین شارەکانی ئێرانن لە ناوچەی شاخەکانی زاگرۆسدا شاخەکانی زاگرۆسیش دەربەندی زۆری سروشتی هاتوچۆی وەکو هەڵەبجە و پێنجوێنی تیادایە لە پارێزگاری سلێمانی، بەڵام هەر ئەوەیە لە خانەقینەوە دەستپێدەکات بە کرماشاندا دەڕوات لەوێشەوە دەگاتەوە بە هەمەدان کە دەڕوانێت بەسەر تەپۆڵکەی بەرزاییەکانی ئێراندا، لەوێشەوە رێگاکە لقی لێدەبێتەوە بەرەو باکوور هاوشانی دەریای قەزوێن دەڕوات کە بە شاری (مەڕۆ)ی کۆندا تێپەڕ دەکات یان بە (تاران)ی ئێستا، دەوای بڕینی

دەرگاکانی قەزوێن بەرەو خۆرهەڵات بۆ هەرێمی (بارسوا) (خۆراسان) لەوێشەوە دوای بڕینی شاخەکانی خۆراسان رێگاکە بەرەو وڵاتی پشتی رووبار دەبێتەوە لە خۆرهەڵاتی دوور لە هەمدانیشەوە.

رێگایەك جیادەبێتەوە بەرەو باشوور دەڕواو دەگاتەوە بە هەرێمی ئیلام لەوێشەوە دەگاتەوە بە هەرێمی فارس و کرمان.

رێگایەکیش لە خۆرهەڵاتەوە دەڕوات هەتاکو دەگاتەوە بە (خەیبەر) لە زنجیرە شاخی هیندکۆش کە دەڕوانێت بەسەر نیوە دورگەی هیندی و دۆڵی سەند بەتایبەتی.

بەهۆی گرنگی ئەم رێگا سەرەکییە و زۆری لقەکانی کە سەربەستی هاتوچۆی وشکانی دەدات لەنێوان ناوەڕاستی ئاسیاو خۆرئاوایدا بۆیە زانای ئاسەوا هێرزفیلد ناوی دەرگای ئاسایی لێناوە کە لەوێوە گەلان و عەشیرەتەکان و بازرگانەکان و سوپا بەرەو خۆرهەڵات یان خۆرئاوا رویشتوون کۆرشی دووەم ئەو رێگایەی گرت کاتێك بەرەو بابل هات بۆ داگیرکردنی هەروەها ئەسکەندەری مەقدۆنیش ئەو رێگایی بڕی کە بەردەوام رێگایەکی سەرەکی بووە بۆ هاتوچۆی وشکانی لە نێوان ئێران و خۆرهەڵاتی دەریای سپی ناوەڕاست.

## وێنەی دوژمنەکانی هەڵکۆڵیوە

لەم رێگا شاخاوییەدا و نزیك کرماشان داریۆشی یەکەم رووی شاخی تاشراوی ناسراو بە بێستوونی دانا بۆ ئەوەی نەخشە هەڵکۆڵراوە ناودارەکەی لەسەری بۆ هەڵبکۆڵن کە جگە لە وێنەکەی خۆی و وێنەی ئاهۆرامزدا وێنەی دوژمنەکانیشی لەسەر هەڵکۆڵیوە کە لە شەڕەکاندا شکستیان خواردووە، لە بەردەمیشیان نووسنێك هەیە کە بووەتە بنەما بۆ دۆزینەوەی کردنەوەی هێماکانی مێخی وڵاتی نێوان دوو رووباری کۆن ئەوەش بەهۆی هەوڵ و تێکۆشانی (هەنری رۆڵەنسن) هاتووەتە دی.

## رووەکی سروشتی

شتخەکانی ناوچەی زاگرۆس ناوبانگی زۆر دەرکردووەو ئاویان زۆرەو بۆ کشتوکاڵ بە سوودە، درێژی شیوێك لە نێوان 50-90 کیلۆمەتردایە و پانییەکەی لە نێوان 10-18

کیلۆمەترە. ئەمانە سوودێکی گەورەیان هەیە بۆ کشتوکاڵ و مانەوەی مرۆڤ لە ناوچەکەدا، رۆخی کێوە گەورەکانیش لەوەڕگایەکی باشن بۆ ئاژەڵداری و بەخێوکردنی ئەسپ جگە ەوەش ناوچەکە ناوبانگی گەورەی هەیە لە رووی رووەکی سورشتی و درەختی بەردار، هەروەها لە هەندێ شوێنیشدا جۆری باش لە بەرد و کانزاش هەن.

ناوەڕاستی خۆرئاوای ئێران کە دوای شاخەکانی زاگرۆس دێت لە دەشتێکی فراوان پێکهاتووە کۆمەڵێك رووبارو لقەکانی ئاوی دەدەن کە بەناوبانگترینیان لەم هەرێمەدا ئەم ناوچەیە لە رووی مێژووییەوە بەناوی ولاتی (عیلام) یان (سووسە) و (سۆسیانا) ناسراوە کە ناوی پایتەختەکەیتی بەناوی (شووش) یان (سووسە) ناوچەکەش لە رووی ئاو و هەواو رووەکیەوە لە بەشی خواروی ولاتی نێوان دوو رووبار دەچێت.

جگە لە رووباری کارون ئەو لقانەش کە پێکیان دێنێ بنەچەن بۆ کۆبوونەوەی دانیشتوان و دروستکردنی مەرکەزی شارەکان لە ناوچەکەدا، ناوچەی دەشتەکانیش بە رووبارێکیتریش ئاشنا بووە بەناوی (کەرخە)، ئاوەکەی لە شاخەکانی زاگرۆس وەردەگرێت و بەرەو باشوور دەڕوات و دەشتەکان ئاو دەدات.

## شوێنی لەدایکبوونی بنەماڵەی ساسانییەکانە

بەڵام بەشەکانی باشووری خۆرئاوای ئێران بە هەرێمی فارس ناسراوە کە دەڕوانێت بەسەر رۆخە کەنداوی فارسی کە سەربەستی بۆ هاتوچۆ ناهێڵی لە نێوان رێگاکانی دەریایی و ناوەوەی هەرێمی فارس جگە لە چەند دەلاقەیەکی سروشتی نەبێت کە مەرگەزی مینا سەرەکییەکانە و گرنگەکەیان بەندەر عەباسە کە دەکەوێتە سەر نۆکەندی هورمز و ئەویتریشیان (بوشەهر)ە لە بەشی باکووری کەنداوی فارسە، ئەم زنجیرە شاخەش پێیدەڵێن موکران، هەرێمی فارس شوێنی فارسە ئارياييەکانە دوای ئەوەی کۆچیانکرد بۆ ئێران و یەکەم دەوڵەتی فارسی هاخامەنشینیان تیایدا دامەزراند، هەروەها شارەکانی ئەم هەرێمەش شوێنی لەدایکبوونی بنەماڵەی ساسانییە، لەم هەرێمەدا گرنگترین شارە کۆنەکانی فارسی هەن لەوانە (بازرگادە) و (بەرسەبۆلیس) و (ئەستەخر) لە شارە نوێکانی ئەم هەرێمەش (یەزد) و (کرمان) و (ئەسفەهان) و (بوشەهر) و (بەندەر عەباس)ە، ئەم هەرێمە بارانی کەمە و گەرماش تیایدا

بەهێزە، بەڵام هەندێك لە شارە پێشکەوتووەکانی سوود لە شوێنەکانیان دەبینن بۆ وەرگرتنی هەوای فێنك، وەکو (ئەسفەهان) کە دەکەوێتە بەرزایی (5000) پێ لە رووی دەریاوە، لەبەر ئەوە پادشاکانی هاخامەنشی لە هاویندا لە هەمەدان دانیشتوون (ئەکبەتانە) لە ترسی گەرمای (بەرسەبۆلیس) یان (بازرگادە).

ئەم هەرێمە لەبەر کەمی باران دانیشتوانەکەی لە چاخی هاخامەنشییەوە هەوڵیانداوە سوود لە ئاوی ژێر زەوی وەربگرن کە لە شاخەکانەوە بەرە خوار دەبێتەوەو شارەکانیش لەم هەرێمەدا دەوریانداوە ئەوەش وایکرد لە هەڵکەندنی کارێز، یان کەناڵدا پێش بکەون بەوەش رێڕەوی ئاوی ژێر زەوی بەرەو ناوچە کشتوکاڵییەکان و شوێنی دانیشتنیان بەرن.

## زنجیرە شاخی ئەلبورز

بەڵام ناوچەکانی باکوور لە ئێران زنجیرە شاخی ئەلبورز دەوری داوە کە بەرزترین لونکەی شاخی ئێران-دەماوەندەو بەرزییەکەی دەگاتە (19) هەزار پێ واتە (5654مەتر) کە نزیکە لە تارانەوە، ئەم لوتکە بەرزانەی ئەم زنجیرە شاخە درێژ دەبێتەوە بە رۆخی باشووری دەریای قەزوێن (دەریای هەرکانیا) و لەنێوان ئەو دەریادا ناوچەیەك هەیە کە بەناوبانگترین ناوچەی بە پیت و بەرەکەتەکانی ئێرانە، لە باکووری تارانیش پاشماوەکانی شاری (مەڕۆ)ی کۆن هەیە، کە رێگایەك لەوێوە دەردەچێت زنجیرە شاخی (ئەلبورز) دەبڕێت لەو دەلاقە سورشتییەی کە ناسراوە بە دەرگای قەزوێن و دەتگەیەنێتە دەشتە فراوانەکانی نێوان شاخ و دەریا.

ئازەربایجانی ئێران دەکەوێتە کۆتایی درێژبوونەوەی شاخی ئەلبوورزی خۆرئاوا، ناوچەکەش دانیشتوانێکی زۆری تیادایە بەهۆی خێر و بەرەکەتی کشتوکاڵ و بە پیت و بەرەکەتی زەوییەکانی، گۆلاوی ورمێی خوێیاویش دەکەوێتە ئێرەو هەرێمەکەش مەرکەزی میدییەکان و شوێنی لەدایکبوونی زەردەشتە و دۆڵە بە پیت و بەرەکەتەکانی زۆر لەو گەلە مێژووییانەی دیوە وەکو میدییەکان و کوردو غەیری ئەوان.

هەرێمەکەش کاری هاتوچۆی بەهەر لایەکیدا بڕۆی تیایدا ئاسانە، بۆیە پارێزگاری بەردەبازەکانی ئەم هەرێمە لە کارە گرنگەکانی دادوەرەکانی فارس بووە بۆ ئەوەی نەهێڵن کۆچەرییەکان لە دەشتەکانی قەفقاس و باشووری روسیاوە بێ بێن.

ئازەربایجانیش لە ڕێگای باکوورەوە پەیوەستە بە ئەرمینیاوەو لە ڕێگای خۆرئاواشەوە بەهۆی ناوچەی (ئەرزڕۆم) پەیوەستە بە وڵاتی (ئانازۆل)ەوە، بەڵام لە درێژبوونەوەیدا بەرە خۆرهەڵاتی شاخەکانی ئەلبورز پێیدەڵێن شاخی خوراسان ئەو شاخەی بەرزییەکەی کەمەو ڕۆشتن پیایدا ئاسانە،

لە شاخی هیندکۆش کە دەربەندی سروشتی تیادایە پێیدەڵێن دەرگای خوراسان کە هاتوچۆ تیایدا لەناو شاخەکاندا ئاسانە و زنجیرە شاخی خوراسانیش ناوبانگی بە دۆڵی بەپیت و بەرەکەت دەرکردووە کە بەرهەمێکی زۆری دانەوێڵەی تیادا دێتە بەرهەم جگە لە ترێ و لۆحکەش، ئەم هەرێمە بنەماڵەی دادوەری زۆری تیادا پەیدابووە لە مێژووی ئێراندا وەکو بنەماڵەی ئارشاکی و سەفەوی و قاجاری.

لە باشووری دەرگای خۆراسان شاخی هیندکۆش درێژ دەبێتەوە هەردوو هەرێمی ئەفغانستان و بلوجستان لەخۆ دەگرێت و پێکهاتووە لە زنجیرە شاخێك کە قووڵ و بەرزن و هەتاکو بەرزی هەندێکیان دەگەنە (6) هەزار پێ و بەفر بەردەوام داپیۆشیوون، ئەم زنجیرانە تووشی پچڕاندن هاتوون کە بە ناویانا هەندێك دەربەند دروست بووەو بۆ ڕۆیشتن پیایاندا ناوبانگی مێژوویيان هەیە و ناوەوەی ئێران دەبەستێتەوە بە شێوەی سەند، گرنگەکانیان ڕێگای (بۆلان) و خەیبەرەو ئەوەی دواییان گرنگی زۆری هەیە بەهۆی شوێنەکەیەوە کە نزیکە لە هەرێمی (بنجاب) و (کابولستان) کە دەوڵەمەندن و دانیشتوانیان زۆرە.

## زنجیرە ڕێگا

لە ناوچەی شاخی هیندکۆش زنجیرە ڕێگایتریش تیادایە کە خاڵە پەیوەندییەکانی نێوان تورکستانی چینی و هیندکۆش زنجیرە ڕێگایتریشی تیادایە کە خاڵی پەیوەندییەکانی نێوان تورکستانی چینی و ناوەڕاستی ئاسیاو نێوان هیندو ئێرانە، لێرەوە ڕێگای لە هیندکۆش لە نێوان ئێران و کابولستان، بەتایبەتی ئەو ڕێگایەی کە لەوەوبەر هەردوو شاری قەندەهار و غەزنەی بەناوبانگیان لەسەر دروستکرد، بۆیە لە ڕێگاکانی بۆلان لە بلوجستان و خەیبە لە کابولستان و کۆمەڵە ڕێگامانیتریش لە هیندکۆش لە ئەفغانستان هۆکاری ڕۆشتنی سەرەکین پیایاندا بەرەو هیندو ناوەڕاستی ئاسیا و چین، هەروەها لە ڕوویەکیترەوە ئەو ناوچانەی ئاماژەمانپێدان پەیوەستن بە خۆرئاوای ئاسیاوە.

پوختەی باسەکە ئەوە دەگەیەنێت کە ئێران بەپێی شوێنەکەی مەرکەزێکی ناوەڕاستە دەکەوێتە نێوان ئاسیاو ناوچەکانی قەفقاس و نیوەدورگەی هیندی و ناوچەکانی دەریای سپی ناوەڕاست، دەشتەکانیشی لەبەر ئەوەی بە پیت و بەرەکەتە و دۆڵەکانی ناو شاخەکانی داپۆشراوە بە رووەك بۆیە ئاژەڵی جیاجیای تیادا بڵاوبووەتەوە ئەمانەش بۆ پێشخستنی ژیانی مرۆڤ لە سەردەمەکانی چاخە بەردینە کۆنەکان و نوێییەوە سوودیان لێبینراوە،

بۆیە لەبەر ئەو هۆیانە ناوچەکە لە ناوەڕاستی هەزارەی دووەمی پێش زایین کۆچی مرۆڤ بەشێوەیەکی بەرفراوان گرتوویەتەوە کە بەسەر بەشە جیاجیاکانی وڵاتدا دابەشبوون کە ناوی کۆچی گەلانی ئاری لێنراوە کە هەندێکیان لە ئێرانەوە بەرەو هیند چوون یان ئەنازۆل لە ڕێگای ئەنازۆل و قەفقازیشەوە بەرەو ناوەڕاست و باشووری ئەورووپا چوون.

لەگەڵ ئەوەشدا بارودۆخی سروشتی ئێران گرانە، بەڵام بەهۆی دانانی حکومەتی مەرکەزی بەهێز وەکو لە سەردەمی هاخامەنشی و ساسانیدا توانی سەربکەوێت کە بەو هۆیەوە توانی دەسەڵاتی نەك هەر بەسەر ئێراندا ڕۆشت بەڵکو ناچەیەکی گەورەی لە دنیای کۆن گرت.

کاریگەرێتی ئێران و دەوڵەتە کۆنەکان بەسەر دنیای مرۆڤایەتیدا لە هەزارەی یەکەمی پێش زایین فراوان و گەورەیە چونکە ئێران سەرکەوتووبوو لە سوود وەرگرتن لە کەلەپووری شارستانیەتی کۆن کە پێش ژیانەوەی شاریتانێتی وڵاتی نێوان دوو ڕووبار و سوریا و میسر و ئەنازۆل و یۆنان کەوتبوو هەروەها لە دروستکردنی ماددی و فیکرییەوە سەرکەوتووبوون بۆ گەیاندنی کەلەپوریان بۆ مەرکەزە زۆرەکانی شارستانیەتی سەردەم یان ئەوانەی دوای ئەوان دێت.

سەرچاوە

د. گیرشمن/ وەرگێڕانی محەمەد معین

ایران/ ازاغازنا اسلام

هشتم/1370 لا1-9

# تیشکێك بۆ سەر گۆڕە بەردینەکانی سەردەمی هاخامەنشی

ئارامگا بەردینەکانی سەردەمی هاخامەنشی جگە لەوانەی مادەکان لە شێوەی دیمەنی دەرەوەیاندا هاوشێوە دەوەستنەوە. دیمەنی نیشانکراوی وێنەکەیان لە (3) بەش پێکهاتووە کە لە باڵای بەردەکەدا هەڵکۆڵراوە. لە رواڵەتدا گۆڕەکە بەگشتی شێوە خاجێکی یۆنانی وەرگرتووەو بڵندییەکەی لە 24 مەتر تێپەڕناکات. بەشی ژێرەوەی ئەم ئارامگاینە بەگشتی باڵەکانیان شێوە هاوتەریب تاشراون و هەڵکۆڵینەکانیشیان هیچ شێوەیەکی جوانکارییان لەخۆیان نەگرتووە. دوو بەشەکەیتریشیان دیمەنی دەرکەوتووی کۆشك نیشاندەدەن.

کە بەشی خوارەوەی کۆشکەکەیە لە هەیوانەکەیدا، بەشێوەیکیتر هێڵی ئاسۆیی خاج لە هەیوانی کۆڵەکە دارەکەدا هەڵکۆڵراوەو سەری کۆڵەکەکانیش لە شێوەی باڵا لاشەی دوو گا دایە و پشتیان لە یەکتری نیشاندراون و لە بەرزی ئەوانەدا بنمیچێك لە شێوە سەکۆیەکدا هەڵکۆڵراوە هەڵبەتە بەشی سەرەوەی ستوونی خاجەکە لە بەرزییەکەیدا کراوە بە (2) بەشەوە، لە بەشی باڵایدا ئەو وێنانە بەرچاو دەکەون یان هەڵکۆڵراون کە پادشا رووبەرە سەرەکییەکەی گرتووەو لەسەر سەکۆیەکی پلەدار وەستاوەو بەدەستی چەپی کەوانێکی گرتووەو لەسەر سەکۆیەکی پلەدار وەستاوەو بەدەستی چەپی کەوانێکی گرتووەو کۆتاییەکەی بە هەمان شێوەی نەخشی بەرجەستە کراوی کەوانی گۆڕی قزقەبان یان هاوشێوە کەوانی جامی ئاڵتوونی دۆزراوەی (حەسەنلو)وە کە لەسەر نووکی ئاگرەکە درێژ کردووە، لە بەشی خوارەوەیدا بە دوو ریز 28 پەیکەر هەڵکۆڵراون یەکێکیان باڵاترەو تەختی پادشاش بەسەریانەوەیە ئەوانە لەو کەسایەتیانەن هەروەکو لە نووسینە باڵاکەی ئارامگا بەردینەکەی داریۆش لە تەخشتی رۆستەم پێمانگەیشتووە لە نوێنەرانی پارێزگا جیاجیاکانی ئیمپڕاتۆریەتی هاخامەنشین. ئەوەش لە نووسینەکەدا دەرئەکەوێت کە لە بەشی سەرەوەی ئارامگا یان لەوانەشە هەبوو بێت، بەڵام بەهۆی دووری رۆژگارەکەوە بەگشتی لەناو چووین. لێرەدا ئەوە دیارە کە لە ژێر پێیا حەوت کەس تەختی پادشایان هەڵگرتووە کە ناوی حەوت پارێزگای سەر بە ئیمپڕاتۆریەتن و دەرهێنراون. لەلای راستەوە وێنە ئاهۆرامزدا کە یەکێکە لەوانەی ئاسمانییە و بەشێوەی مانگ

لەناو بازنەیەکدا نیشاندراوە، لەوانەشە خوای خۆر (میترا) (مەهر) خوای رۆژ بێت. (راستییەکەی ئەو هێمایە خواری مانگ (سن)ەو لە نەخشەکەی قزقەبانیشدا هاوشێوە هەیە، کە کەوتووەتە ناوەڕاستی هەیوانەکە و لە بەشی سەرەوەیدا).

ئارامگار بەردینەکانی پێشووی پادشاکانی هاخامەنشی کە لە نەخشی رۆستەم دەرهێنراون کۆنترین نموونەیان ئارامگای داریۆشە کە لە رۆژگاری دواتردا گۆڕی بەردینیتری هاخامەنشی لەسەر شێوە دەرهێنراون واتە لاساییانکردووەتەوە. بنمیچی ژوورەکانیان بەشێوەی شێروانی دەرهێنراون کە لەسەر شێوازی بیناسازی ئارامگای کورش لە (پاسارگادە) و ئارامگای کچ و بنمیچی گۆڕەکانی گۆڕستانی (ب)ی تەپەی سیالك دەریانهێناون ئەمانە لەگەڵ یەکترا بۆ پێوانەکردن دەشێن.

نەخشی رۆستەم لە دووری چەند کیلۆمەترێك لە نەخشی (رەجەب) دوورەو لە بەشی باڵای دامێنی کێوی (حسین) دایە کە تیایدا ئارامگاکانی پادشاکانی هاخامەنشی لە سنگی بەردەکە هەڵکۆڵراون. ئەوانەی ئارامگای سەرەوە پەیوەستن بە داریۆشی یەکەم (521-485 پ.ز.)، خشایارشای یەکەم (485-465پ.ز.)، ئەردەشێری یەکەم (465-424پ.ز.) و داریۆشی دووەم (424-405پ.ز.)، تەواوی ئەو گۆڕانەش لەسەر شێوە نموونەیەك دەرهێنراون.

ئارامگای ئەردەشێری دووەم (405-361پ.ز.) و ئەردەشێری سێیەم (361-338پ.ز.)، ئەمانە گۆڕەکانیلت لە دامێنی باڵای تەختی کێوی (رەحمەت) هەڵۆڵراون. لەناو ژوورێکدایە ئارامگاکەی ئەردەشێری دووەم کە دوو گۆڕی بەردینی تیایدایە و ئارامگاکەی ئەردەشێری سێیەمیش (3) گۆڕی بەردینی لەخۆگرتووە.

لە باشووری تەحتی جەمشیددا ئارامگای داریۆشی سێیەم هەڵکۆڵراوە، بەڵام تەواو نەکراوە بەڵکو تەنیا بەشی سەرەوەی نەخشی پادشا بەرامبەر ئاگردانەکە نیشاندراوە. پاشماوەی ئارامگاکەش بەشێوەیەکی نەتاشراو یان ناتەواو ماوەتەوە. لەوانەیە لەکاتی هەڵکۆڵینی ئارامگاکەدا بووبێت هێرشەکانی ئەسکەندەر بۆ ئێران دەستیپێکردبێت و ئەوەش وایکردبێت لە کاروەستابن. بەو پێیە هەموو گۆڕە بەردینەکانی هاخامەنشی، چ لە رووی شێوەی دەرکەوتووی دەرەوەیان و چ لە رووی شێوی ناوەوەیان، هاوشێوەی یەکتری دەوەستنەوە. بەو پێیە تەنیا یەکێك لەوانە لە لێکۆڵینەوەدا گرنگترینیانە لە جوانیدا کە پەیوەستە بە داریۆسی یەکەم.

## ئارامگای داریۆشی یەکەم لە نەخشی رۆستەم

دوای ئارامگای کۆرش لە (پاسارگاد) ئارامگای داریۆشی یەکەم دێت لە نەخشی رۆستەم کە لە هەموو ئارامگاکانیتر گرنگتر و بەشکۆتر و گەورەترە. ئەم ئارامگایە خاوەنی دوو بەردی نووسراوی درێژ و چەند نووسینێکی مێخی تەواوکراوە. هۆکاری گرنگی ئەم ئارامگایەش بە بەراورد بە ئارامگاکانیتر لە نەخشی رۆستەم و تەختی جەمشید دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی گۆڕانی تیادا کراوە. دیمەنی دەرەوەی و تەرزی بیناسازی چوار ئارامگاکەی نەخشی رۆستەم و دوو ئارامگاکەی تەختی جەمشید یەکسان دەوەستنەوە بەو بیناسازییەی بۆیان کراوە. پانییەکەی 12 مەترەو بڵندی 6 مەترەو پادشای هاخامەنشی تەختی پادشایەتی لە بەرامبەر (3) دیمەنی پیرۆز، فریشتە و هەتاو و ئاگر داناوە، لە حاڵێکدایە دەستی راستی بۆ نزاکردن بڵندکردووەو لە دەستەکەیتریشیان کەوانی پێدەبینرێت. شێوە ملکەچی و سوجدەبردنی پادشای گەورەی هاخامەنشی لەبەر ئەوەیە لە ئازیەتی و رامیاریدا، پشتی فیرعەونەکانی میسر و جەربەزەکانی ئاشوورو بابل و هیتری لە وڵاتانی ئاسیای خۆرئاواو جەزایر و رۆخی دەریای سپی ناوەڕاست لەرزاندووەو لە بەرامبەریشدا چەمانەوەی دیمەنێکە لە بەرامبەر دیاردەی پیرۆزدا کە بە هیچ شێوەیەك نەتوانراوە دەربڕین لە بەشێکی بکرێ جگە لە رووکردن و پشتبەستنی ئەو بە ئاهۆرامزدای خالقی یەکتا، کە بە بوونی قسە لەسەر تەواوی نووسینەکانی خۆی لەسەر ئەو ئیمانە پاك و رووکردنە باوەڕەی لەو نەخشەدا دەکات کە دیمەنێکی دروستکراوە تاوەکو دنیا بزانێت کە مرۆڤ جگە لە مەقامێك کە بەرامبەر بەخۆی دەستی یارمەتی و تۆبەی بۆ ئەبات بە ئومێدی وەڵامدانەوەی درێژخایەن دەیەوێ. داریۆش و خشایارشا و ئەوانیتر لەناو دارانی هاخامەنشی وڵاتەکەی خۆیان بەباشی بە دۆستایەتی خواوەند پەیوەستکردووە، هەروەها وڵاتانیتریشیان لە پەنایاندا ئاگادار کردووە. تەختی پادشایی لە بەرزاییەکدا بە یارمەتی 28 کەس لە نوێنەرانی  کیشوەرەکنی سەربەخۆی بەدوو ریز شێوە خۆی وەرگرتووە، بەو پێیە دانان و گەورەیی حکومەتی هاخامەنشی لە جوانترین روویدا وێنەکەی دانراوە. ئەو (28) نوێنەرەش هەموویان لە نووسینەکەی ئارامگاکەدا نیشاندراون هەروەها بە باڵاشیاندا ناسراون.

لە بەشی دیمەنی خوارەوەی ئارامگاکەو شێوەی هەیوانی کۆشکی پادشایی ئەوە دەرکەوتووە کە بنمیچەکەی بە چوار کۆڵەکە هەڵگیراوەو چوونە ژوورەوەش لەناویا بۆ ناو ئارامگاکە لە ناوەڕاستییەوە دەبێت. ئەترافی ئەم دەرگایە بە دوو ریز گولی دوانزە گەڵاو باڵای سەری کۆڵەکەکانیشی بە شێری وەستاو جوانکراون. پانی ئەم بەشە دوانزە مەترەو بڵندی 7 مەترە. لێواری نێوان باڵاو بەشی خوارەوەی دیمەنی ئارامگای داریۆش شێوەکەی ساکارە، بەڵام ایواری ناوبراو لە ئارامگای تەختی جەمشیددا بە شێری

وەستاو جوانکراوە. پارچەیەك قوماش باڵای داریوٚشی بە هەمان شێوەی نەخشە بەرجەستەکراوەکەی کە لە دەرگاکانی تەختی جەمشید هەڵکۆڵراوی داپۆشیوە.

قاچەکانی تەختی پادشایەتییەکەی بە چوار شێر دامەزراون و لە دوولاوەی تەختەکەش واتە ناوەوەو دەرەوەی بە 03) ریز سەرباز نەخشەکانیان هەڵکۆڵراون و هەر ریزێکیان لە 3 نەفەر، دوو بارسی و میدییەك پێکهاتووە.

لە تەرەفی نیزەداری داریوٚش کە گەورەترین کەسە لە تەنیشت پادشای دانیشتووی کەواندار کە لەم نەخشەدا، نووسینێك بە 3 زمان بە میخی نووسراوەو هەر یەکێکیان (2) دێڕە. کەواندار کە لەم نەخشەدا، کوتەك بەدەستی شەڕەکەری داریوٚشە پاسەوانە بەناوی (ئاسپیچاما) و لە نووسینە مێخییەکەی کەناری نەخشی یادکراویشدا ناوی هاتووە. ناوەوەی ئارامگاکە جێگای (9) گۆڕەو پێکهاتووە لە (3) ریز و رێڕەوێکی درێژی تیادایە بە ئەندازەی 18.7 مەترەو پانایی 2.15 مەتر.

دەربارەی ژمارەی گۆڕەکان جگە لە جێگای لاشەی داریوٚش شوێنی هەشت لاشەیتر هەیە کە دەتوانین بڵێین پەیوەستن بە پادشا ژن و دایك و هەموو هاوسەرانی و کوڕەکانییەوە. هەر یەکێك لەو (9) گۆڕە خاوەنی گەورەیی خۆیەتی بە ئەندازە 1*1.92 مەتر و بڵندی 90 سانتیمەتر کە دوای دانانی لاشەکان، بەردێکی گەورەی قۆقز کە تیرەکەی 25 سانتیمەترەو کەمێك پانترە دەمی گۆڕەکە بە روویا داخراوە تاوەکو دەستی هیچ کەسێك بە لاشەکە نەگات. جگە لەوەش گەیشتن بە دەرگای ئارامگاکەی کەمەری کێوەکە لە رێگای پلیکانەکانییەوە کاری دژوار بۆ خودی ئارامگاکە دروستدەکات بۆیە جارێکیتر بە دەرگایەکی کەوانەیی دەمی گۆڕەکەیان داخستووە کە پانی و بڵندی بۆ چوونە ناوەوەی 1.75*1.45 مەترە.

بۆ پارێزگاری لە لاشەکان لە هاتنە ناوەوەی ئاو و شێ لە کێوەکەوەو گەیشتنی بە ناو گۆڕەکان دووراو دوور بەردی گۆڕەکان جۆگەلەیان بۆ هەڵکۆڵیوون بۆ ئەوەی ئاوە کۆبووەکان بەو جۆگەلانەدا بەرنەدەرەوە. دیداری گۆڕ و رێڕەوی درێژ لیەردەمیا سەرت سووڕدەمێنێ کە بە چ هێزو تێکۆشانێك و هونەرێك و کات بەسەربردن، کێوەکەیان بەو جۆرە هەڵکۆڵیوەو سافکردووەو ئەو نەخشانەیان لە بەردەکەی دەرهێناوەو ناوەکەیان رێکخستووە تاوەکو رێڕەوێکیان بەدرێژی 18.70 مەتر لە دەمی گۆڕەکە دەرهێناوە.

دەربارەی ئەوەی ئایا چەند ماوەی ویستووە بۆ دروستکردن و جوانکردنی ئەم ئارامگایە کە پێویستبووە تاوەکو ئامادە بووە بۆ وەرگرتنی لاشەی پادشا هەروەها بە رووی ناتەواوی ئارامگای داریوٚشی سێیەم دیارە کە لە دەمی باشووری کێوی (رەحمەت) لە تەختی جەمشید

دەبینین کە لە ماوەی شەش ساڵ پادشایەتی ئەودا بە ناتەواوی دیمەنی بەردەکانی دەرەوەی شێوەی خۆی وەرگرتووەو لە تەواوی بوونیدا سەرکەوتوو نەبوون، بۆیە دەتوانین بڵێین پێدەچێت کە هەر یەکێك لەو ئارامگایانە کەمتر لە دە ساڵی نەخایاندبێت هەتاکو تەواو بووە.

لەناو هەر یەکێك لەو گۆڕە هەڵکۆڵراوانەی هاخامەنشیدا، رێگایەکی تەسکی درێژ هەیە کە دوایی بە ژوورێك دێت و لەناو هەریەکێك لەو ژوورانەدا گۆڕی شێوە لاکێشی یان بە هەمان شێوە گۆڕەکانی (ماد)دێن و لەسەر شێوەیەك دەرهێنراون کە شوێنی شاردنەوەی لاشەی پادشاکان بووە. دیواری لاکانی ئەو ژوورانە، لە هەموو ئارامگاکاندا بە ساکاری تاشراون و هیچ نیشانەی نەخش بەرجەستە نەکراوە یان جوانکاری لەناویانا نەکراوە. بەهۆی کاریگەری دووری رۆژگارەکە ئەو ئارامگایانە کراونەتەوە کە لە ناویانا ئێسکبەندییان لەخۆ گرتووە تاوەکو شتومەکە بچکۆڵەکان بەرن کە بەتالانی چوون.

بوونی ئارامگای کۆرش لە (پاسارگاد)، لەوانەیە ئەو شێوە بیناسازییەی تیایدا کراوە کاریگەری زەقورەی (چۆغە زەنبیل)ی لەسەر بووبێت، هەروەها ئارامگای گۆڕی (کچ)یش بە هەمان شێوە لەسەر هەمان تەلارسازی دروستکرابێت، بەڵام هاخامەنشییەکان لە دروستکردنی گۆڕە بەردینەکانیانا بەشێوەیەکی براوە سوودیان لە گۆڕە بەردینەکانی مادی دیوە بەتایبەتی ئەوەی (قزقەپان) و (کوڕ و کچ) هەر ئەوەش وایکردووە لە دروستکردنی ئارامگا بەردینەکانیانا لە تەختی جەمشید و نەخشی رۆستەم سەرکەوتوو بن.


سەرچاوە

علی اکبر سرفرازا، بهمن فیروز فندی

مجموعە دروس باستان شناسی و هنردوران تاریخی

چاپ اول 1373، لا210-214

# تیشکێك بۆ سەر پۆشاکی ماد

بەهۆی لێکۆڵینەوەو بەدواداچوون لەسەر پۆشاکی ماد دەتوانین زانیاری بەدەست بهێنین لەسەر چینە کۆمەڵایەتییەکانیان و پێشکەوتنی پیشەسازییان، بەتایبەتی کاری رستن و چنین. بۆ ئەوەی پێویستە ئاماژە بە نموونەیەك بدەین: مرۆڤێك ئەگەر لەژێر کاریگەریی چواردەورەکەی و ئاو و هەواو کەسایەتییە تایبەتییەکەی خۆی بووبێت لەوانەی سەرەتایین و بەر لە مێژوو تێکۆشاون پۆشاکی خۆیان دروستبکەن، بۆ ئەو دروستکردنە سوودی لە پێستی ئاژەڵ و کەرەسەی رووەکی بینیووە. لە قۆناغەکانی دواتریشدا بەپێی بەڵگە دۆزراوەکان ئەو جۆرە پیشەسازییە بۆ ئەو جۆرە کەلوپەلە هەبووە لە هەما کاتیشدا پۆشاك یان پۆشینیش پێشکەوتووەو گۆڕانکاریی بەسەردا هاتووە. بەو جۆرە پوختەی کاریگەریی هۆکارەکان لەسەر دروستکردنی جلولەرگ پێکهاتووە:

1- **مەرجەکانی جوگرافی و دەوروبەرو ئاو و هەوا.**
2- **بەرەو پێشچوونی ژیان و جێگیربوون و بارودۆخی کۆمەڵایەتی.**
3- **شەڕو بارودۆخی سیاسی و شێوەی حکومەت.**
4- **باوەڕی مەزەبی و ئاداب و رێورەسم.**
5- **سیستەمی چینایەتی لە کۆمەڵگادا.**

زۆرینەی مێژوونووسان لەو باوەڕدان مادەکان و هاخامەنشییەکان بۆ دروستکردنی پۆشاکیان سوودیان لە تاکە سەرچاوەیەك دیوە. بۆ راستی ئەم بۆچوونە (گزەینەفوون) هاوڕێکانی وت: داواتان لێدەکەم بۆ پەرستگا بڕۆن و رێورەسمی قوربانی تیایدا پێشکەش بکەن، یان بەجێی بگەیەنن. ئەنجامدانی ئەم کارە بەکارێکی گەورەو پیرۆز و جوان دەبینم، بەیانی زوو لە دەربار ئامادەبن و بەو خۆ رێکخستنەی (مزولاس)یش رازیین کە بۆیداناون و پەیمانی پێداون کە بەجێی بگەیەنێت و ریزبەندییان بۆ دابنێت. ئەو جلکەی کە رەنگی ئاڵ و والای هەیە وەکو ئەرخەوانی و سووری تۆخ بەخشیویەتی بە سەردارەکان، لەو رووەوە (گزەینە فوون) دەڵێ: کۆرس بۆ نزیکەکانی لەسەر شێوە جلکی ماد پۆشاکی بۆ دروستکردن. باشی ئەم پۆشاکەش لەوەدابوو گیانی کەسەکەی داپۆشیوەو بە هەیلکەلتر و شۆختر هاتووەتە بەرچاو. کەوشی

مادیش هەر بەو شێوەیە مایەوە، بەڵام بڵندتر دروستدەکرا تاوەکو زیاتر دەربکەوێت و سەرنجڕاکێشتر بێت. (هێرۆدۆت) دەربارەی پۆشاکی ماد گەلێك قسە و باسی هەیە هەروەك دەڵێ: بەو شێوەیە ژمارەی سەربازانی شەڕکە بەپێی ناسنامەی قەومیان بەسەر چەند کۆمەڵێکدا دابەشبوون.

## 1- پارسییەکان:

پارسییەکان ئەم جل و چەکانەی هەیانە و لە نەخشەکانیاندا دەرکەوتوون، لە ناویانان کڵاو و پۆشاك بەرچاو دەکەون کە دەستیان لە قوڵی جبەکانیانەوە دەرهێناوە وادیارە پۆشاکە رەنگاو رەنگەکانیان جلکی شەڕ بێ و زرێپۆش و ئەڵقەکانیشی لە ئاسن دروستکرابن و شێوە مانگیان وەرگرتووە و بەلاشەکانیانەوە دیارن. شەرواڵەکەی بەریشیان هەتاکو قولەپێیانی دلپۆشیوەو لەوێدا بەدەرکەوتوویی ماوەتەوە، پێدەچێت بە قولاپ چنرابن. لە پشتی کەسەکانیشەوە تیردان بەرچاو دەکەون کە پێوەیان پەیوەستکراون، هەروەها قەمەی کورت و کەوانی بەرزیش بەلاشان و کەمەریانەوە دیارن. ئەوانەی ناومان هێنان بەلای راستدا بەستراون.

## 2- مادەکان:

ئەو چەکانەی بە کەسەکانن پارسی نین، بەڵکو لە بنەمادا شێوەکانیان دەریئەخەن چەکی مادەکانن نەك پارسی.(ئۆڵمستید) دەنووسێ: دوو وێنەی جیا رووی پەیکەرە بەردە تاشراوەکانی تەختی جەمشیدی نەخشاندووە، تیایاندا مادەکان کە پۆشاکی رەسەنی ئارياييەکانیان پۆشیوە ناسراوتر دەرکەوتوون. لەسەریاندا کڵاوێکی خڕی گوێچکەدار هەیە و کڵاوەکەش لە وێنەکاندا دەرکەوتوون. لە وێنەکاندا کەشی پێیان لە چەرم دروستکراوەو خاوەنەکانیان بەپێی بەشی پێشەوەی پێڵاوەکانیان وادەرئەکەون گەورە پیاو بووبن، یان سوارچاك بووبن، ریشێکی درێژی نووك تیژیان هەیە کە بەسەر گەردەنیاندا شۆڕ بووەتەوەو گوارەو گەردەن بەندییان پۆشیوە. چەکی سەرەکی هێرشبەران کەوانە و تیرەکەشی لەدارێکی سەختە.

(سێرپێرسی سایکس) دەڵێ: جلکی ئەرخەوانی پادشای پارس هەمان پۆشاکی چنراوی بەرزو بە ویقاری مرۆڤی ماد بووە، لەکاتی تاج لەسەرنانی پادشادا لەو شوێنە بڵندەی تیشکی داوەتەوە، ئەو تاجەش تایبەتبووە بە پادشاو لەبەردەکانی تەختی جەمشید هەڵکۆڵراوە.

کڵاوی میدی: لە نەخشە بەردینەکانی تەختی جەمشیددا کەسانێك دەرهێنراون کە جلکی میدییان پۆشیوەو قەمەکانیان بە کەمەریانەوە بەستووەو کەوشیان لە پێدایە کە بە (سۆل) ناسراوە. ئەمانە (5) جۆر کڵاویان لەسەردایە وادیارن لە گەورەکان بن کە لە وێنەکاندا بەرچاو

دەکەون، ئەو کەسانەش لەوانەن لەناو سوپادا بووبن کە پۆشاکی میدییان پۆشیوەو دەرکەوتوون. لێرەدا مادەکان کڵاوی قەومیی خۆیان پاراستووە کە دەربڕین لە عێل و بنەچەی مادەکان دەکات لە دەربار و شوێنەکانیتری دوور لە پایتەخت.

ئەو کڵاوانە لە شێوەی ئەوانەی (سکاییی) و سەغدییەکانن کە لە ناوچەکەدا دەژین. هەرچۆنێك بێت ئەوانە جلك و پۆشاکی نەخشی سەر بەردن، میدین بە کڵاوی جۆراوجۆرەوە دەبینرێن کە دەربڕین لە عێل و بنەچەی مادەکانی دەربار دەکەن. ئەو جۆرە کڵاوانەی لەسەر سەردارەکاندان یان لەسەری کەسانیتردان (5) جۆر کڵاو لە تەختی جەمشید بەرچاو دەکەون:

**جۆری یەکەم:** کڵاوێکی خڕی لبادی ساکارە ئەوەی سەیری دەکات لای جوانە و پشتی سەری کڵاوەکەش لکێکی چنراوی هەیە، درێژی ئەم لکە تاوەکو پشتی ملی دێت.

**جۆرە دووەم:** کڵاوێکی خڕی لبادە، جگە لەو لکەی لە پشتی سەریەوە هەیە، خاوەنی گوێچکە پۆشیشە. ئەم کڵاوە کە مادەکان لە سەریان ناوە دیارییە بۆ گەورەکان هێناویانە.

**جۆری سێیەم:** کڵاوێکی خڕی لبادە لە پشتی سەرییەوە لکێکی درێژی هەیە و لکەکەشی بە کڵاوەکەوە چنراوەو رەنگیان کردووەو دوولای لێواری لە سەرەوەیدا بە قۆقزی دەرکەوتووەو بە نوکێکی تیژ کۆتایی دێت. کڵاوەکەش گوێچکەدارەو ژێر چەناگەی کەسەکەی داپۆشیوە.

**جۆری چوارەم:** کڵاوێکە لە لباد دروستکراوەو لکی نییە و دوو گوێپۆشی هەیە، بەشی سەرەوەی نوکێکی تیژ و بڵندی هەیە و کڵاوەکەش لەژێر چەناگەوە دەبەسترێت، ئەم کڵاوە لە کڵاوە قوچەکانی زووە هەروەکو دەڵێن دانیشتوانی (سەغد) لەسەری دەکەن.

جۆری پێنجەم:کڵاوێکی بڵندە و سەرەوەی قووچە و نووك تیژە. کڵاوەکەش لە شێوەی سێیەمە و با پۆشە بەهۆی ئەوەی هەموو سەرو دەموچاو دەگرێتەوەو دەبەسترێت. کڵاوەکەش لەژێرەوە دەگاتەوە بە ژژێر چەناگە و شێوەکەشی لە هێمایەکی لە یەکدراو دەچێت. سەردارەکانی ماد ئەم کڵاوەیان لەسەر کردووەو لەلایەن کەسێکی تریکیانەوە پێشکەشیان کراوە.

جگە لەو کڵاوانەش کە لە بەردەکانی تەختی جەمشید هەڵکۆڵراون لە هەموو پاشماوەو ئاسەوارەکانیتری پەیوەست بە ماد لە جۆریتریش بەرچاو دەکەون وەکو کڵاوی کەسی کە بەدەست دروستکراوەو شێوەکەی لە کڵاوی جۆری چوارەم و پێنجەم دەچێت لە شێوەی ئەوەی لەسەر گۆڕە بەردینەکەی (دوکان داود) دەرهێنراوە کە خاوەنەکەی جلکی موغی لەبەردایە، جگە لەوەش ئەو کڵاوە لە شێوەی کڵاوی نەخشە بەرجەستەکراوەکەی بەردەمی سەرجۆنی دووەمیش دەچێت کە کەسایەتییەکی مادە.

کراسی مادەکان: (ئۆڵمستید) چەند جارێم نیشانیداوە مادەکان کراسی چەرمیان لەبەرکردووە. نەخشەکانی تەختی جەمشیدیش لە بنەمادا ئەوەمان بیردەخاتەوە بەر لەوەی بڕۆینە سەرباسی شتەکانیتر. هەروەکو باسمانکرد کراسی میدی لە چەرم دروستکراوە کە بەلایانەوە جوان بووەو لە شێوەدا ساکارو تەسك بووە کە بەڵگەیە بۆ ئەوەی گرنگی زۆری پێنەدراوە بەوشێوەیەی کە لەیەش رووی بەردەکان هەڵکۆڵراون و بەرچاو دەکەون. لەناو هەموو ئەو نەخشانەی کە لە تەختی جەمشید دەرهێنراون و بۆ مادەکان دەگەڕێنەوە (2) یان (3) هێڵ بەرچاو دەکەون ئەمانە بۆ نیشاندانی هاتنەوەو گرژبوونی قوماشەکە و لوول بوونی کراسەکەن. ئەوانەش نیشانەن کە نەخشەسازی لە کراسەکەدا کراوە، بەڵام بەشێوەیەکی سەرەتایی کە ئەمانەن:

1- نەخشێکی بەرجەستەکراوی (داریۆش)ی یەکەم کە لە مۆزەخانەی ئێرانی کۆن هەیە و کەسێکی میدی تیایدا لەبەردەمیا دەبینرێت کە لە شێوەی رێزگرتندایە.

2- نەخشی بەرجەستەکراوی کراسێکە کە بۆ چەکی پادشایی دروستکراوە، دەتوانین بڵێین هاتنەوەیەك و گرژبوونی قوماشەکە دیارە بۆ ئەوەی کراسەکە تەواو ببنرێ و سەرنجڕاکێش بێت.

3- نەخشەی سێیەم هاتنەوەیەك و گرژبوونی کراسەکەیە تا سنووری لەبەرچاو بۆ دەرخستنی شوێنی (نیزە)، وێنەکەش لە دیواری هۆرهەڵاتی پلیکانەکانی کۆشکی ئابادان بەرچاو دەکەوێت. نەخشەکانیتریش هەرچەندساکارن، بەڵام تاڕادەیەك رێك تاشراون و تیایاندا هەندێك وردەکاری دەبینرێت. وەکو لەو نەخشانەی تەختی جەمشید دا بەرچاو دەکەون کراسی میدی تا ئەژنۆ درێژەو بە پولەکە لە شانەی تاوەکو ئانیشك چنراوە کە شێوەکەی خڕەو دیارە. یەخەی کراسەکانیشیان بە (3) شێوە بووە: نیوەخڕ و نیوە خڕی گونجاو بە ئاسۆیی کۆتایی دێت. لە هەندێك نەخشە بەرجەستەکراوەکانیشدا دامێنی کراسەکە وادەرئەکەوێت تەنگ بێت، بەڵام لە هەندێکیتریاندا وادەرئەکەوێت دامێنەکەی فراوان بێت و بە ئاسانی کەسەکە دەتوانێت لاقی تیایدا بجولێنێت. بەو جۆرە کەمەری کراسەکە بەهۆی تەسکییەوە دەتوانین بڵێین لەسەر شێوەی زەنگ یان هەرەمێکی ناتەواو دروستکراوە. بەرزی قۆڵەکەی تا ئانیشکی هەروەکو لە نەخشەکاندا دیارن نیشانی ئەدەن کراسەکە بەشێوەیەوکی گشتی لەسەرەوە بە ئەندازەی پێویست فراوان بووەو وردە وردە لە خوارەوە تەسك و خڕ بووەتەوە تەواوی نەخشەکانی میدیش ئەوانەی لە تەختی جەمشیدان لێواری قۆڵی کراسەکە هەتاکو دەگاتەوە بەلای ملی کەسەکە بە چەسپی دەرئەکەوێت.

شەرواڵی میدی: لەبەردە هەڵکۆڵراوەکانی تەختی جەمشیددا لاقی مادەکان لەناو شەرواڵەکانیانا بە جوانی دەرکەوتوون. لە بەشی ناوەڕاستیدا شەرواڵەکە خڕبووەتەوە هەروەها دامێنی کراسی کەسەکەش ناوەڕاستی شەرواڵەکەی داپۆشیووە هەر ئەوەش وایکردووە شەرواڵەکە بەشێوەیەکی گەورەو بێ گرژ بوون و چرچ و لۆچ بکەوێتە بەرچاو، تا سنوورێکیش وادیارە شەرواڵەکە فراوان بووە. بەشێك لەو نەخشە درێژانەی کە لە شەرواڵەکاندا دروستکراون وادەبینرێن کە شەرواڵەکان هەندێکیان تەسك و چەسپ بن، بەڵام لە هەندێکیتریاندا نەخشەکە بە فراوانی دەکەوێتە بەرچاو، شەرواڵەکەش هەتاکو پاژنەی کەسەکە هاتووە، بەشەکەی ناوەوەشی وادیارە پێوە لکابێت. ئێمە لێرەدا تەواو ئەوەمان بۆ روون نەبووەتەوە کە ئەو تیماسکە لە پشتی پای قاچی کەسەکەوە هاتۆتەوە یان لە تەنیشتییەوە بۆ پێشەوەی هێناوەتەوە بۆیە لێرەدا وەزیفەی ئەوە بە تەواوێتی نازانین کە بۆچی دروستکراوە، بەڵام وادیارە ئەوە شوێنی دەرەلنگ و شوێنی قاچی شەرواڵەکەی گرتۆتەوە ئەوەش وایکردووە تایبەتمەندی خۆی هەبێت و لای سوارەکانیش رەچاوکراوە، لەوانەشە ئەو دیاردەیە تایبەت بێت بەبەشی دەرەوەی دەرەلنگی شەرواڵەکە و بۆی زیادکرابێت، بۆیە ئەگەری ئەوە هەیە شوێنی ئاوزەنگی سواریش بوو بێت، یان تایبەت بێت بەو شتانە، ئەوەش بەڵگەی ئەوە دروستدەکات کە شەرواڵی میدی ئەو شتەی تیادا هەبوویێت لە کتێبی کۆنی پۆشاکی ئێرانییەکاندا کە دانەرەکەی (جەلیل چیائپور)ە شەرواڵی میدی بە پانی شوێنی دەرەلنگی سوارەکان ناسراوە، هەروەها لێکۆڵینەوەکانیش کە لەسەر نەخشە هەڵکۆڵراوەکانی تەختی جەمشید کراون و دەکەونە سەر رێگای پلیکانەکانی خۆرهەڵاتی کۆشکی (ئابادانە) ئەو دیاردەیە لە ناویانا هەیە بەوەش دەتوانین بڵێین شەرواڵی میدی شوێنی دەرەلنگی تیایدا دیاریکراوە. بە سەیرکردنی نەخشەی (کاپادۆکیە)کان دەتوانین بڕیار بدەین، کەمەری شەرواڵی میدی واتە ئەو شوێنەی پشتێنەکەی لەسەر بەستراوە بە شێوەیەکی پێچراوە دەرکەوتووە. لە کتێبی پۆشاکی هاخامەنشییەکان و مادەکانیشدا لە تەختی جەمشیددا ئەوە دەرئەکەوێت کە شەرواڵی میدی شێوەی جیاوازی خۆی هەبووە. هەڵبەتە ئەوەی لە وێنەکاندا دەبینرێن ئەوەیە کە شەرواڵەکە لەناو پێڵاوەکەدا شوێنی خۆی گرتووە.

کەمەربەستی میدی: لە رووی نەخشە بەردینەکانی تەختی جەمشیددا، پشتێن یان کەمەربەستی میدی نیشاندراوە کە پێکهاتووە لە پارچە چەمێکی پان بە ئەندازەی دوو بەرامبەر کە بە دەوری کەمەردا سووڕاوەتەوە، لە شوێنێك کۆتاییان پێهێناوە کە هاتۆتەوە سەر پێچانەوەی یەکەم. ئەوەی لای تەماشاکەر سەرسووڕهێنەرە دوای پێچانەوە کە لە دوولاوە سەری پشتێنەکە گرێدراوە. ئەم شێوە پشتێنە کە دوو سەری هەیە بە شێوەی قۆقزی پێچی

خواردووەو لە هەردوو لاوە دەبینرێن و کۆتاییەکانیشیان بە خڕی دەکەونە بەرچاو. مرۆڤی میدی جگە لەو کەمەر بەستە دوو جۆر کەمەربەستیتریشیان هەیە.

1- **کەمەربەستی قەمە:** سەرێکی ئەم کەمەربەستە بزمارێکی سەرپانی پێوەیە و سەرەکەیتریشی کونێکی تیادایە و کێلانەکەشی لە هەردوولاوە قولاپی پێوەیە بۆ بەستنەوەی، کەمەربەستەکەش درێژبۆتەوەو سەرێکی کونێکی تیادایە بە بزمارە سەرپانەکەدا ئەخرێت، قەمەکەش وادروستکراوە لە پێشەوەی لاشەکەدا بەلای راستدا دەبەسترێت، کۆتایی قەمەکەش بەهۆی چەرمێکەوە پێچراوەتەوەو لە شوێنی خۆیدا دەبینرێت.

2- **کەمەربەستی کەوان:** سەرێکی ئەم کەمەربەستە باریکە و بەناو تەختەیەکی کونکراو یان ئێسقانێك کە لە دەست و قاچی بزن دەچێت یان ئاژەڵێکی کێوی توند بەستراوە ئەم کەمەربەستەش بەلای چەپدا مرۆڤی میدی ئەوەی هەیەتی پێوەی بەستووە.

جبە یان ساقۆی میدی: لە نەخشە هەڵکۆڵراوەکانی تەختی جەمشیددا، جگە لەوەی هەندێك لە مادەکان جبەیان پۆشیوە، بەڵام کەسانیتر هەن کراسیان لەبەر کردووە. ئەم کراسە نازانرێ پانیەکەی چەندە، بەڵام پشت و شان و بازووی مرۆڤەکەی دلپۆشیوە. کراسەکەش کە باسی دەکەین قردێلەی هەیە بۆ ئەوەی لە بڵندی سینەیدا لە هەردوولاوە بیبەستێت کە بە کراسەکەوە دیارەو پێکهاتووە لە پارچەیەکی چوارگۆشەی درێژ.

کەوشی میدی: بەپێی ئەو پاشماوە ئاسەواریانەی کە هەن بە شێوەیەکی گشتی (3) جۆر کەوش بەکارهێنراون یان دەتوانین بڵێین مادەکان ئاشنایەتیان لەگەڵیانا هەبووە:

1- کەوشێك کە لە پارچەیەك چەرم دروستکراوەو لە پێیان هەڵکێشاوەو تەختەو پاژنەی نییە لە بەشی سەرەوەیدا درزێکی تیادایە لەوانەی ئەو درزە لە پشتی نوکەکەیەوە بوویێت کە پەنجەی تیادا راکێشاوەو سەری پەنجەکانیش پان بووە بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی ئاسایی لەناویا بێتز ئەم کەوشە هاخامەنشییەکانیش سوودیان لێبینیووە.

2- چەکمەی چەرم: قەدەکەی بڵندەو سەرەوەی لە پێشەکەیدا بەهۆی قەیتانێك پێچراوە. ئەم جۆرە کەوشە لە نەخشە بەرجەستە دێرینەکاندا بەتایبەتی لە ئاشوور هەبووە، لەوانەشە هەمان کەوش بوویێت کاتێك مادەکان هاتوونەتە ئێران پۆشیویانە و باشیش بووە بۆ خاکی تەڕو تووشی یان قوڕی زۆر، یان زەوی بەرداوی کە بۆ رۆشتنی پیادە چاکبووە.

پۆشاکی ژنان: تایبەتمەندییەکانی پۆشاکی ژنان لە چاخی (ماد)دا زۆر زانیاری لەسەر نییە، بەڵام بە سەیرکردنی دیمەنە بەرجەستەکراوەکانی ئاشووری لە نەینەوا ئەوە دەرئەکەوێت کە بە زۆر کۆچ بە مادەکان کراوە، لەو دیمەنانەدا دیارە کە ژنان لەو رۆژگارەدا کراسەکانیان لە (موو) یان (خوری) چنراوەو ئاودامان پۆش بووەو بۆ پێشەوە کراوەتەوە تاوەکو بتوانن تیایدا بجولێن، قۆڵی کراسەکانیشیان لە ئانیشکیانا بە تەسکی هاتووەتەوەو قۆڵەکەش مەچەکیانی داپۆشیوە، وەکو دیارە بارە ئابوورییەکەش لەمەدا رۆڵی لە دروستکردنەکەدا بینیووە.

ئەوەی لێردا قسەی لەسەر دەکرێ مادەکانە کە بۆ ژیانیان گەیشتوونەتە ئێران و بوونەتە گوندنشین و جلکی تایبەتیان بۆ شوان و عەشیرەتە کۆچەرییەکانیان هەبووە. سیستەمی تایبەتی فەرمانڕەواکانیان واتە پادشای تایەفەکانیان ئەمەیان بۆ هێنابوون و هەر عەشیرەتێکیش بۆخۆی نیشانی دیارو تایبەتمەندی خۆی هەبوو لە رووی رەنگی پۆشاك و کڵاویان، ئەم عەشیرەتانە دیارە تازە ئاشنا بوون بە ئاشوورییەکان بەڵگەش بۆ ئەمە ئەو وێنانەیە کە پەیوەستن بە سەرەتای هاتنیان بۆ ئێران کە تیایاندا دەرکەوتوون (کەوشی قەد بڵندیان لە پێدایە کە لاکانی بە پێستێکی قەیتانی باریك بەستراوە) ئەوەی بەرچاو دەکەوێت لەگەڵ رۆشتنی کاتدا بەهۆی زۆربوونی سامان و دروستکردنی حکومەت و بوونی ئاسایشەوە بووە کە جلکی جوان لە ناویانا دەرکەوتووەو جوولەی بە لەش داوەو مادەکانیش کەوشی قەد بڵندی تایبەتیان بەکارنەهێناوە بۆ بڕینی رێگای وشکانی، موغەکانیش کە توێژێکی رۆحانی ناو کۆمەڵگا بوون لە کەسانیتر بە پۆشاکی تایبەتی خۆیان جیاکراونەتەوە، گۆڕە بەردینەکەی (دوکان داود) و (قزقەبان) و پارچە مەعدەنە ئاڵتوونەکەی گەنجینەی جەیحوون شێوە ئەم توێژە بە خۆیان دەرئەخات، لەناو ئەمانەشدا مرۆڤی ئاسایی هەبوون هەمان پۆشاکی شێوە ئاسایی مادیان پۆشیوە، بەڵام خاوەن دەسەڵات و ساماندارەکان خاوەنی جۆرەکانیتری جلکی فراوان و بێقۆڵ بوون کە داویانە بە سەرشانیانا لەسەر شێوەی (جبە) و کڵاویشیان هەبووە کە پلەو پایەی کۆمەڵایەتیانی دیاریکردووە، لەم دیمەنانەدا مادەکان رەنگی جلکەکانیان و شێوەکانیان هاوشێوەی دراوسێکانیان بووە وەکو مانابییەکان یان ئۆرارتۆییەکان و ئاشوورییەکان. بەراوردێك لە نێوان پاشماوەی ئەو کەوشانەی لە (زێویە) دۆزراونەتەوە لەگەڵ ئەوانەی تایبەتن بە کەوشی ماد کە لەسەر دیمەنەکان دەرکەوتوون دەردەکەوێت کە هاوشێوەن یان بۆ سەرچاوەیەك دەگەڕێنەوە.

(وێلی دیورانت) پەیوەست بە مرۆڤی ئەو سەردەمە دەنووسێ: چینە باڵاکان لە مادەکان واتە گەورە پیاوەکانیان شەرواڵیان پۆشیووەو ژنەکانیشیان خۆیان جوانکردووەو روومەتیان سوور کردووەو بە خشڵیش خۆیان رازاندووەتەوە، هەتاکو زین و بەرگی ئەسپەکانیشیان بەزێڕ رازاندووەتەوە.

گەلێکی ئاسایی کە لەوەو بەر شوان بوون و ژیانیان گوزەراندووە، ئێستا سواری گالێسکە دەبن کە چەرخەکانیان لە شێوەی لوولەیەکدا دروستکراون و شێوەیەکی خڕیان وەرگرتووە،

ئەم شێوەیەش بۆ گالێسکە گرانەکان بەکارهێنراوە کە سەرانی حکومەت لە مەجلیسدا بۆ هاتوچۆیان بەکاریان هێناوە بۆ سەردانی شوێنەکانیتری مەجلیسەکان.


سەرچاوە

علی اکبر سرفراز، بهمن فیروزمندی

ماد/ هخامنشی/ (اشکانی)، ساسانی/ چاپ اول 1373، لا 125-135

# زەردەشت... مێژووی دەرکەوتنی

پاشماوەیەك لە نووسینە دێرینەکان مابێتەوە: مێژووی دەرکەوتنی زەردەشت گرنگییەکی گەورەی هەیە بۆ دەرخستنی راستییەکان هەروەها کاریگەریشی هەیە بۆ گەیاندنی پەیامەکەی جگە لەوەش لە زمانەکەیدا هەتاکو ئەندازەیەك ئەو هەستپێدەکەین. ئەمانە لای لێکۆڵەرانی بیانی بوونەتە بەڵگە وم لە پەراوێزی ئاوێستا ناسانیشدا باسیان هاتووەو لێکۆڵینەوەیان لەسەر کراون تیایدا راسی پسپۆڕەکان جێگیربوون و شێوەی راستی خۆیان وەرگرتووە.

1- بەو شێوەیەی رامان لەسەر داوە باسی ئاسایی بەهیچ شێوەیەك شوێن باوەڕ نییە و ئەو قسانەش کە بە رێگای سەرەتایی لە تیۆرێکدا هاتوون لە سەرچاوەی مێژووی زەردەشتەوە بەهایان بۆ دانانرێت. بۆ ئەمە ئاماژە بەو راپۆرت و زانیاریانە ئەدەین کە بە شێوەی داستان و چیرۆك لەو رۆژگارانەدا کۆبوونەتەوە، یان بۆ ئەو رۆژگارە دەگەڕێنەوە کە کۆمەڵگای ئێران بەگشتی لە راستی زەردەشت و نووسینەکانی بێئاگابوون. چونکە زانینی زانیاری لەسەر رۆحانییەکانی ئەو سەردەمەی زەردەشت و باوەڕیان لەگەڵ ئامۆژگارییەکانی رۆژگارەکەدا بە کەمی لە بەردەستدابوون، بۆیە کاریگەری رۆحانیەکان لەو سیستەمە کۆمەڵایەتیەدا بووەتە بڕیار و بەشێوەیەك وەرگێراون نامەکانی (بندشن) کە چوونەتە ناو (ئاوێر فنامە) لە سنووری (2) هەزار ساڵ بەر لە دەرکەوتنی زەردەشت بە جوانی و رەوانی داڕێژراون و بە ئێمە گەیشتوون، ئەمەش بەڵگەیەکە بۆ مێژوونووسانی ئەو سەردەمە کە چۆن رووداوەکانیان سەقامگیر کردووە، بەڵام لێکۆڵینەوەیان لەسەر نەکردوون ئەمەش وایکردووە لە رووی زانست و مەنتیقەوە بۆ توێژینەوەو ساخکردنەوە بە سوود نەبن نووسرانی چاخی ساسانی و سەرەتای ئیسلامیش هەر بەو شێوەیە زانیاریان لەسەر زەردەشت و بیروباوەڕی هەبووە. ئەم دیاردەیەش بەردەوامیداوە بە رۆژگاری چاخی حەڤدەو هەژدەو زانیارییەکان هەر ئاواش بەو شێوەیە بڵاوبوونەتەوە.

لێکۆڵەرە گەورەکان و شارەزایانیتر کە لە داستانی ئاسایی زانیاریان وەرگرتووە ئەو راستییە دەسەلمێنن کە ئاینی زەردەشت لە کاروانی سەردەمەکەدا جارێکیتر دووچاری لادان و لاوازبوون بووە ئەوەی لەو

ئایینەوە سەرچاوەی هەڵگرتووە بە هیچ شێوەیەك شوێن باوەڕ نەبووە کە لای هەندێك لە زاناکانیش ئاماژەی پێدراوە لەوانە (بویس).

(هەرتل) کە خۆی یەکێکە لە لایەنگرانی بەهێزی زەردەشت دەرکەوتنی ئەو بۆ چاخی شەشەمی بەر لە زایین دەباتەوە. بوونی ئەدەبیاتی سەردەمی دواوەی ئاوێستاش کە سەرچاوەی رەسەنی مێژووی ئاساییە (هەرتل) ئاماژەی پێدەدا و دەنووسێ:

ئامادەکردنی خودی ئەو نامانە، لە راستیدا زانیارییەکانیان لە ئەشکانییەکانەوە وەرگرتووە کە توانیویانە لێیان بەدەست بهێنن. بۆیە بە هیچ شێوەیەك لەو زانیارییانەی شایستە نین کە ببنە سەرچاوەی مێژوویی و سوودیان لێوەربگرن لای (هەرتل)یش بۆ سەردەمی ئێرانی کۆن بەڵگەیبوونی مێژوونووسین نییە و سەرچاوە نووسراوەکانیشیان کە لە ئاوێستای دواییدا هەن کە تەنیا لەناو چیرۆك و داستانەکاندا بەرچاو دەکەون.

2- زمانی گاتاکان بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵ زمانی فارسی هاخامەنشیدا جیاوازەو زمانی مانەوەی بەردەوامە لە نێوان دوو خاکی گەورەدا و زمانی گەلێکە لە پرسەکانی مەزهەبیدا گۆڕانکاری خێرای بەسەردا نەهاتووە. لای هەموانیش ئاشکرایە گۆڕانکاری لە زمانەکەدا لە ئەنجامی دەسەڵاتی قەومێکی بێگانەدا دروستدەبێ یان لێی زیاد دەکرێ. لێرەدا پێویستە ئەوە بڵێین: هەتاکو هاتنی دەسەڵاتی ئەسکەندەر هیچ قەومێکی بێگانە لە ئاریاکانی ناوچەکە دەسەڵاتدار نەبوون. لەمەوبەریش ئاماژەمان بە بەشێك لە ناوی مادەکان و هاخامەنشییەکاندا کە رەگ و ریشەی زەردەشتیەیدان هەیە کە هەتاکو خودی نازوی (داریۆش)یش لە بنەچەدا (دارایا) و (هۆش)ن یان (دارایا) و (هۆمنە). ناوە تایبەتەکانیش بە درێژی سەردەمەکە کەمتر گۆڕانی تێدابووە.

هەتاکو ئەگەر گۆڕان لە زمانەکەشدا بوو بێت. نموونەش بۆ ئەمە ناوە کۆنەکانی ئێرانی وەکو: بیژەن، گیو، دارا، سیاوشن خسرەو، (سودابە) و هەتاکو لە هاتنی دەسەڵاتی ئەعراب و تورکیشدا گۆڕان لە مەزەبی ئێرانیدا هەر بە هەمان شێوەی کۆن رۆشتووە یان کاری پێکراوە ئەمە بۆ کاتێك بووە کە ناوی کەسانی ناو کۆمەڵانی مادو هاخامەنشی لەناو کەسانی ناو کۆمەڵانی گاتایی نەچوون، بەڵام ئەو ناوانە کە خاوەنی رەگوریشەی ئاوێستایین بە گشتی شێوەیان گۆڕاوە.

ئەوەی لەمەدا سەرنجراکێشە تەنیا ناوی کەسەکانە کە شێوە مەزهەبییەکە تیایاندا نەگۆڕاون لەمەدا هەتاکو ناوە ئوسوڵییەکانیش گۆڕانکاری تیادا دروستبووە هەروەکو: ((خوا) و (ئامشە

ئاسپندان) و (ئانگره مینو). ئەمەش گۆڕانکارییە لە نامەکاندا و تێگەیشتنە مەزهەبییەکاندا کە مرۆڤ هەستیپێدەکات یان دەروونی پێوەی قاڵە.

گرنگیدان بەم بابەتە بەشێك لە لێکۆڵەرانی خستۆتە سەر ئەو راسە کە بڵێن: ئەم گۆڕانکارییە لە ئەنجامی هەزار ساڵدا شارەزاییان لەسەری بۆ دروستبووە.

3- ئەگەر گاتاکان لە چاخی حەوتەم یان شەشەم بەر لە زایین رێکخرابن دەبوایە ئەوەمان تەواو بزانیایە کە شارستانیەتی و باوەڕەکانی بابلی و ئاشووری لەناویانا نیشانێکیان هەبوایە. بۆ ئەمە لەمەوبەر وتوومە بچووکترین پاشماوەی شارستانیەت لە گاتاکاندا نابینرێت. جگە لەمەش لە گاتاکاندا بەهیچ جۆرێك ناوی سوڵتەو دەسەڵاتداران نەهاتووە هەروەها نووسینەوەی ئەم سروودانە و دەوروبەرەکەیشی بەگشتی بە دەسەڵاتێکەوە ئاشنا نییە. ئەوەی لە داستانەکانیشدا بۆمان ماوەتەوە نیشانە بەوە دەدات لە کۆمەڵگای عەشایەریی و کۆچەریدا نزیکبوونەوەیان لەگەڵ سوڵتەدا راستەوخۆ نەبووە، بەڵام دواتر ئاشنای ئەو سیستەمەی دەسەڵاتە بوون بە مانا (گاتاکان) لە ناو هێنانی (شا)دا بەشیان هەبووە.

لە سەرەتای تەورات لە فەسڵی (ئافەرین)دا هەروەها لە داستانی ئیبراهیمدا ناوی پادشا نەهێنراوە، بەڵام لە قورئانی پیرۆزدا پادشاو فەرمانڕەوا قسەیان رۆشتووە لە کاتێکدا سوارچاك لە گاتاکاندا تەیا سەردەستەیەك بووە، بەڵام سەرۆکی عەشیرەتەکە دەتوانین ناوی میری کاهینی لێبنێین.

لە گاتاکاندا ئەوە بەرچاو دەکەوێت کە سوارچاك لە ناوچەکەدا زۆر دژی زەردەشتبوون هەروەها ئەویش بە هەمان شێوە دژیان وەستاوە، بەڵام لە دواییدا لەناو یەکێك لەو عەشیرەتانەدا کە (ویشتاسپ)ە ماوەتەوە.

ئەو عەشیرەتانە کە لە ناوچەیەکی بچکۆڵەدا بوون و دەسەڵاتی جیاجیایان هەبووە نەیانتوانیوە حکومەتداری بکەن بۆ ئەوەی زەردەشت لە گەڵیاندا هاوبەشی هەبێت هەر ئەوەش وایکردووە سەرۆکی بنەماڵە گەورەکان کە (کاهین-میر) بوون بە یەکەوە سەرۆکایەتی بکەن.

4- چ لە کاتی هاتنی فەرمانڕەوایەتی هاخامەنشیدا و چ لە چاخەکانی دوای کۆمەڵگای ئێراندا، بەر لەوەی بۆ ئێران کۆچ بکەن مەزهەبی ئاریاکانی هیندو جەرمەن هەبووە هەروەها بە ئاریاکانی باکووری خۆرهەڵاتی ئێران ناسراون کە پێشوازییان لە پەیامی زەردەشت کردووەو چوونەتە ناو ئایینەکەی ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی لە رێڕەوی ئایینەکە لابدەن و ببنە دوولایەنی دژ لەگەڵ ئایینی زەردەشتیدا.

5- ژینگەی گاتاکان و ئەو ناوانەی بەکارهێنراون و بڵاون تیایدا و خۆیان پێناساندووین بەو جۆرەیە کە کۆچەربن و خاوەنی رەسەنایەتین. ناوەکانی (ویشتاسپ)ەو (جاماسپ) و (فرش

ئوشتر)ەو.. لە ژینگەیەکی رەسەنی سەرەتاییدا خۆیان نیشانداوە بەو شێوەیەی کە ئایینی دروستبوو کاریگەری لەسەریان نەبووە هەروەها لە ناویانا ناوە کۆنەکانی پێشووی وەکو (فراوەرتی، ئاستیاگس، دارایاوش، هووخشترە، ئارتابانوس، ئوتاتوس و... لەسەر شێوەی خۆیان ماونەتەوە.

6- پارستەکان لە کۆتایی چاخی هەشتەم و سەرەتای چاخی حەوتەم بەر لە زایینداا لە (پارسوماش)ی دامێنی کێوی بەختیاری خۆرهەلاتی (شوستر) وردە وردە لەسەرخۆ بەدامەزراندنی دەولەت ئاشنا بوون. ئەوەبوو، بۆ یەکەمجار لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی (هوبان ئیمنا)ی پادشای عیلامی (692-689 پ.ز) پارسەکان ناویان بلاوبۆوەو پادشای ئاشووریش (سەرنجاریب) ئاماژەپیێداون.

هاخامانش کە دامەزرێنەری زنجیرەی هاخامانشییەکانە سەرەتا لە ژێر کاریگەری دەسەلاتی مادەکان و عیلامەکاندا دەولەتی خۆی دروستکردووەو کارەکانی بەجێهێناوە، دواتر کوڕی ئەو (675-640پ.ز) خۆی لە ژێر دەسەلاتی عیلامییەکان دەرهێناو ناوچەی (پارسا) و (ئانشان)یشی خستۆتە ژێر دەسەلاتییەوە.

7- سەردەمێك لە چاخی (5)ی بەر لە زایین لە یۆناندا زەردەشت پەیامبەر و ئەستێرەناس و حادوگەر خاوەنی نهێنی بووە لایان. ئەو سیفەتانەش پەیوەستن بە سەردەمی دووری بەر لە زایین، مێژووش بە ئێمەی واناساندووە کە بۆ تەمەنی پەیامەکەی چەندین هەزار سالەی بۆ دانانوە بەلام بۆ ئەم بۆچوونە رازیبوون دروست نەبووە کە بەر لە چاخێك لەو سەردەمەدا ئەمە لە باکووری ئێراندا روویدا بێتز لەگەلّ هەموو ئەمانەشدا تاکە ئێرانییەك نەبووە لە هەمان چاخدا لەسەر بوونی زەردەشت زانیاری هەبوو بێت هەتاکو ئاشنای ناویشی نەبوون. هەمیشە لەوانە زەردەشت بە گەورەترین رووناکبیری دنیای کۆندادەنێت کە خاوەنی زانست بووەو بۆ هەر شوێنێك کۆچیکردبێت یان بۆ لای هەر خاوەن نهێنیەك رۆشتبیچت هەلگربووە.

هۆمەر کە بەر لە چاخی (5) لە رۆژگاری (ئەفلاتون) نێوانی هەبووە لەگەلّ زەردەشتدا هەرگیز بە ئەندازەی ئەو پەیوەست بە رۆژگاری دوور و نهێنییەکانیەوە نەبووە.

8- بلاوبوونەوەی ئایینە گەورەکان و گەوربوونیان بووەتە هۆی ئەوەی لەژێر کاریگەری و گەورەییاندا دەولەتی بە توانای جیهانی لەسەرخۆ شێوەی تەواوی خۆیان وەربگرن. کۆمەلانی خەلکیش کە پەیڕەوی عەقلّ و مەنتیق ناکەن، یان مەنتیق سۆزیان ناجولێنێت جارێکیتر

پێویستیان بە هۆکاری دەرەوە هەیە بۆ وریاکردنەوەیان. ئەمەش پێچەوانەی لێکۆڵینەوەکەی (تۆینبی)یە، کە دەڵێ ئەم ئاینانە جیهانی نین کە دەوڵەتی جیهانی دروست بکەن بەڵکو بە پێچەوانەوە دەوڵەتە گەورەکان ئایینەکانیان تەنیا جیهانین.

ئایینی جولەکە بەو دەسەڵاتە کەمە ناوچەییەی کە هەیبوو لەسەر خاکی (یودا)، نفوسی بڵاوبۆتەوە هەر ئەو سولتە ناوچەییەش بووە کە مەزەبی جولەکەی لە هەمان ئەو ناوچەیەدا جارێکیتر هێشتۆتەوە هەتاکو دەرکەوتنی کۆمەڵگای جولەکە ئەوسا وەستاوە.

(ئایینی جولەکەش کە قەومییە هەڵبەتە تەورات لەسەری کاریگەری زۆری هەیە و لە شیکردنەوەی ئایینەکەشدا بەڵگەی سەلمێنەر زۆرن لەو رووەوە، بەڵام دژایەتی کلێسای جولەکە بۆی سەرچاوەی تێڕوانینە).

عیساییەت کە هەمان شێوە ئایینی جولەکەیە، لە رۆم گۆڕانکاری لە شێوەیدا روویداوە ئەو کاتەی ئیمپڕاتۆرێکی جیهانی وەکو ئایینێکی رەسمی ئاشنایکرد لەو شوێنانەی کە لەژێر دەسەڵاتیابوون، هەروەها ئایینەکەش کە بە شوێنەکانیتریشدا بڵاوبووەتە، چەند سەدەیەك دوای ئەوە دەوڵەتانی ئەوروپاش بوونە جێگری ئیمپڕاتۆری رۆم و ناوچەی دەسەڵات لەژێر دەسەڵاتیانا بەرەو فراوانتریان برد. ئەگەر عیساییەت لە فەڵەستینەوە بەرەو رۆم رۆشتبێت، بەڵام پەیڕەوانی ئەو ئایینە کە لەناو ئایینی جولەکەدا بوون لە رۆژگاری پێشوودا بەهێز نەبوون بەڵگەش بۆ ئەمە لە رۆژگاری ئەمڕۆدا کاریگەری ئەو ئایینە لەناو عیساییەتدا نەماوە لە تەواوی ئەو خاکانەشدا رووناکبیرانی مەسیحی بە پەرتەوازەیی ئایینەکەیان گەیاندۆتە ئامانج، یارمەتیان لە دەوڵەتەکانی مەسیحییەوە وەرگرتووەو لە هیچ کام لەو کۆمەڵگایانەشدا مرۆڤی مەسیحی خوێنی نەڕێژراوە.

ئایینی ئیسلام لە سەردەمی خەلیفەکانی ئاشدینا نفوسی بڵاوبۆتەوە کە بووەتە هۆی ئەوەی وڵاتانی زۆر داگیر بکەن ئەو کاتە لە سنووری عەرەبستان هاتنە دەرەوە، بەڵام فراوانی ئەو دەسەڵاتە نەیگەیاندنە سەر خاکیتر بۆ ئەوەی نفوس و دەسەڵاتیان زیاتر بڵاوببێتەوە.

مرۆڤێك کە لەژێر دەسەڵاتی وڵاتانی مەسیحی و ئیسلامی و ئایینەکانیاندا ژیانی بەسەر بردبێت هەرگیز زانیاری لەسەریان نەبووە، بەڵام بە پێچەوانەوە دواکەوتووترینی مەزهەبەکان کە هەن لە رووی کاریگەری دابونەریتی و ویراسەوە یاساییترین و پێشکەوتووترینی ئەو باوەڕانەن کە لێکۆڵینەوەیان لەسەر پرسی مەزهەبی بۆ ئەو رۆژگارە لەسەر کراوە هەتاکو

ئەوانەش بەناوی ئایینە گەورەکانەوە کاریانکردووە، پەنایان بردۆتە بەر کاری جادووگەری و پڕو پوچ بەمەش دەزگای کلێسایان بەدرێژایی چەند سەدەیەك خستۆتە گێژاوەوە.

ئیمپڕاتۆری رۆم و تورکیاو کاپادۆکیای کۆن کە ناوچەی زەردەشتی نشینبوون خستنیە ژێر دەسەڵاتییەوە، هەتاکو بەسەر میسریشدا دەسەڵاتی دەڕۆیشت.

دەست بەسەرداگرتنی رۆمی مەسیحی ئەسکەندەرییە و قوستەنتەنییەش لە مەرکەزە گرنگەکانی ئایینی مەسیحی بوو، هەروەها لە سوریاش رۆخەکانی دەریای سپی ناوەڕاستی گرتۆتەوە کە لە ژێر دەسەڵاتی و نفوسی دەوڵەتی رۆمدا بوون کە ئایینەکە تیایاندا بڵاوبووە. دەسەڵاتی رۆم لە کاتی مانەوەیدا گەیشتۆتە خۆرهەڵاتی دەوڵەتەکانی رۆم بە مانای لە تورکیاوە هەتاکو باکووری ئەفریقا لەژێر دەسەڵاتیان بووە، واتە لەگەڵ سەرکەوتنی سیاسی و سەربازیدا سوڵتەی ئایینییشی لەگەڵ خۆیا هێناوە.

دەوڵەتی عوسمانی هەتاکو سنووری (ئوتریش) بەرەوپێش چووەو لەو ناوچانەدا جارێکیتر ئایینی ئیسلام دەستباڵا بووە، بەڵام مەسیحییەکان دووبارە بۆ ئەو ناوچانە گەڕاونەتەوەو بەدەستیانەوە ماوەتەوە هەتاکو سنووری تورکیاش بەرەوپێشچوون ئەمەش سەرلەنوێ ئایینی مەسیحی کردۆتەوە بە ئایینی رەسمی ئەو شوێنانە کە لەوە پێش لەژێر دەسەڵاتیانا بووە کەمایەتییەکانی ئیسلامیش لە رۆمانیاو بولگارستان و یوگوسلافیا هەبوون. ئەم ئەنجامە هەمان جێنشینی ئاسایی دروستکردووە کە پاشماوەکەی لە سوریاو لوبنان و وڵاتانیتردا ماوەتەوە کە موسوڵمانەکان تیایدا کەمینە بوون لە ژێر دەسەڵاتی مەسیحییەکاندا.

ئایینی زەردەشت لە سەرەتادا لەلایەن هیچ دەوڵەتێك و هێزێکەوە پشتیوانی لێنەکراوە. (ویشتاسپ) کە ئامۆژگارییەکانی زەردەشتی لا ئاسایبووە، لای لێکۆڵەرانی خۆرئاواش ئەو ئایینە بۆ پادشاو شاهەنشا ئامادەکراوە بە جۆرێك کە رێنمایی کراوە، بەڵام لە مەرگی زەردەشتدا پشتیوانی بۆ ئایینەکەی بە تەواوی نەماوە. پەیامی زەردەشتیش لەو رۆژگارەدا خاوەنی هۆکارەکانی تایبەتی بووە بەو گۆڕانکاریانە کە لە کۆمەڵگادا هاتۆتە گۆڕی و، دروستبوونی قسەی زۆریش بە نەمانی زەردەشت بووەتە هۆی نەمانی (پارێزێك)ی بە توانا کە وڵات رزگار بکا و لە کۆبوونەوەکاندا کاریگەری هەبێت.

بەم شیکردنەوەیە و توێژینەوەیە گەیشتینە ئەو زانیاریانەی کە ئایینی زەردەشت لە یۆناندا لە چاخەکانی (5) و (6)ی بەر لە زایین لێکۆڵینەوەی لەسەر نەکراوەو ئەفسانە پڕ نهێنی ئامێزەکانی یۆنانیش پەیپێبردووەو تێکەڵاوی ڕووداوەکانی بووە.

سەردەمێك کە بیروباوەڕەکان بەناوی زەردەشت ئایینی ڕەسمی بە توانای دەوڵەتی ئێران بووە نفوسی بەخێرایی بڵاوبۆتەوەو ناوچەیەکی گەورەی لە دنیای کۆن گرتۆتەوە، کە پێدەچێت ئەو فراوانی و بڵاوبوونەوەیە بۆ ئایینی زەردەشت نەبووبێت بەڵکو بۆ مەزهەبی دەرباری زەردەشت بووە.

پەیوەندی ئەم ئایینە بە دەرباری ساسانییەکانەوە هەتاکو دوای لەناوچوونی دەوڵەتەکەش بەدەست بەسەرداگرتنی ئەعرابەکان بەسەر کۆمەڵانی ئێرن بە جۆرێك بووە کە نەیتوانیوە بەربەستێك لە ڕێگایاندا دروستبکات بۆ کۆچکردنیان لەبەر ئەوەی ئایینی فەرمانڕەواکان سەرکەوتووەو شێوەی ئەوانی وەرگرتووە.

9- لە بەشەکانی (ئاوێستا) نزیك بە (گاتاکان) ناوی (ئاسن) نەهاتووە، هەروەها بۆ (دراو)یش ئاماژەیەك نییە. ناوی (نان)یش کە لەناو ئارياییەکانی ویدایی و گاتاکاندا براوە لێرەدا نەهێنراوە. ئەم نیشانانەش ئەنجامێك دەدەن کە سەردەمی (گاتاییەکان) پەیوەستن بە چاخێکی کۆنتر.

10- لەوەو بەر بەپێی بۆچوونی (میلز) لە گاتاکاندا خوای (هەومە) و (مانگ) ناویان نەبراوەو ڕێکخستنی ئەم سروودانەش بەر لە پەرستنی (مانگ) لەناو ئارياییەکاندا ڕێکخراون، زەردەشت لە پەیامەکەیدا بۆ ناوی خواکانی ئاریایی ئەوانەی بوونیان بە خەیاڵ و زادەی خەیاڵەوە پەیوەست بووە گۆڕیونی و ناوی نەبردوون ئەمەش لەبەر ئەوە بووە ئەگەر ناوی بېردنایە دەبوو کاری بەرچاو واقیعیانەی ئەوانی بخستایەتە بەرچاو، بەڵام لەناو ئارياییەکاندا (هەومە) و (میترا) (خۆر) لەگەڵ خوکانیتردا پەرستوویانن لەگەڵ ئەوەشدا کە ناوی هیچیان نەبراوە، لە سەرو ئەوانەشەوە زەردەشت لە بنەچەدا ئاماژەی بەناوی هیچ کام لە خواکانی (وارۆنا) و (ئیندرا) و (ئاگنی) نەداوە لەگەڵ ئەوەشدا نەیتوانیوە بڵێ: لە سەردەمی ئەودا مرۆڤ باوەڕی بەو خوایانە نەبووە، لە حاڵێکدا پەرستنی توخمەکانی سروشت لە شێوە خواکاندا و خواکانی عەشیرەتدا کە هەروەك (تەوتەمێك) بوون، زریانی بەر لە مێژوو ڕەواجی پێداون، ئەم بێدەنگییەی زەردەشت کە یەکێکە لە شاکارەکانی ئاوێستا بەم کارەی توانیویە بتەکانی بەرچاو دەروونی بە خەیاڵ بێناونیشان دابنێت.

ئەوەی لەمەدا سەرنجراکێشە لە ئاوێستای دوایشدا ناوی ئەو خوایانە وردە وردە دەرئەکەون و لە زەویدا پایەیان بەرزکردوونەتەوەو بینراون، گاتاکانیش لەو رۆژگارەدا کەمتر دەرکەوتوون ئەمەش بووەتە هۆی بەوەئی ئەو بتانە روناکتر دەربکەون، هەموو ئەمانەش بۆ ئەوە بووە ناوی زەردەشت بەگشتی فەرامۆش بکرێ. ئەم بەڵگە دەرکەوتووە بەسەرچووەش کە سەردەمەکەی زۆر دوورە، باوەڕی مێژوونووسان لەسەری تەواو پێچەوانەی بنەماکانی ئایینی هەر هەموو لایەکە ئەمەش بۆ ئەوەیە هەتاکو ناوی پەیامبەر لە دڵ و دەروونیاندا بسڕنەوە. لە وتەیەکدا هیرۆدۆت و ئەوانی دی لە نووسەرە کۆنەکان دەربارەی باوەڕی مرۆڤی ئێرانی سەردەمی هاخامەنشی دەڵێن: زەردەشت دەرنەکەوتووە نەبووەو ئەمە لەکاتێکدایە کە لە هەمان سەردەمدا یۆنانییەکان ئاشنای ناوی زەردەشت بوون.

11- ژینگەی گاتاکان کە بۆ چاخی ئاژەڵداری دەگەڕێتەوە واتە بۆ ئەو سەردەمەیە کە هێشتا کشتوکاڵ دەرنەکەوتووەو جوتیاری و کۆلاکێش لە چینێکی تایبەتدا قاڵبی خۆیان وەرگرتووە یان تیایدا کۆبوونەتەوە.

بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی وردی زمانناسی، (هات های) حەوت فەسڵ یان (Haptanghaiti) کە نزیکترین یەسنایە بە گاتاکان لە سوردی 42یدا کە بە یەسنای حەوت (بهر)یش پەیوەستە لەم (هات های)یەدا (ئاستریا) و (فشویانت) کە قسەیان لەسەر کراوە بە جوتیار راڤەکراون، بەڵام دواتر کە زیاتر شیکراونەتەوەو لێکۆڵینەوەیان لەسەر کراوە، مانای تری لێ بەدەستهێنراوە (لۆمل) باوەڕی وایە کە (ئاسترا) مانای لەوەڕگا و ئالیکی حوشتر دەدات ئەمەش مانای کاری شوان دەدات بە مانای شوانی چوارپێ یان ئالیکدەر بە چوار پێ دەگرێتەوە.

(پورداود) و (ئازەر گشەسپ) و شوشتەری جارێکیتر لەڕووی پەروەردەوە مانای ئەو وشەیەیان لێکداوەتەوەو وشەکەش بە مانای بەخێوکەری ئاژەڵ دێ (بویس) جارێکیتر بە شوانی ئاژەڵی تەندروستی باش راڤەیکردووە.

بەڵام لە سرودی 43دا هاتووە کە سەردەمی رێکخستنەکەی بۆ بەر لە دەرکەوتنی زەردەشت درێژبۆتەوە کە هەتاکو ئێستاش (چینەر) (زارع) سەربەخۆیە و جوتیاریش لە بنەچەدا شوێنی قسە لەسەر کردن نەبووە، بەڵکو ئاژەڵداری و کشتوکاڵ بەیەکەوە لەم ژینگەیەدا وابەستەبوون کە بۆ بەر لە دەرکەوتنی شار، یان گوندی کشتوکاڵ دەگەڕێتەوەو پەیوەندن بە زۆر کۆنەوە.

(رۆدۆلف) دەنووسیّ: لە ناوەڕاستی هەزارەی سێهەمدا ئاسەواری ئاژەڵداری و لەوەڕگا لەو ناوچانە دابینراون و هیندو ئێرانییەکانیش کە لە هەزارەی دووەم بەرەو خۆرهەلاّــی ئێران و سەرزەمینی هیندستان رۆشتوون کۆمەڵێك لەوانە، کە بە دروستکردنی گۆزەو گلێنەوە خەریك بوون، وردە وردە دانیشتوون و بە کشتوکاڵەوە خەریك بوون، رۆژگاری (زەردەشت)یش بۆ سنووری هەمان سەردەم دەگەڕێتەوە، واتە بەر لە جێنشینی تەواو.

بۆچوونەکانی (تۆلستۆڤی) کۆنینەناسی شوورەوی و دەربڕینەکانی ئەکادیمیای، شوورەوی کە لایەنگری تیۆرە بالاّکانن، ئەمانە لە کەناری رووباری (جەیحون) کە پشکنینیان ئەنجامداوە، لەو شوێنانەدا هەندیّ بەڵگەیان دۆزیوەتەوە کە پەیوەستبوون بە گەلانی ئاژەڵدار، ئەم ئاسەوارانە بۆ چاخی هەشتەمی پێش زایین دەگەڕێنەوە. بڕیارێك لەو رووەوە کە لە (وندیداد)دا هاتووە، نیشانیدەدات کە (یەیما) مەئموری بیناکەرەو لە تەرەف (ئاهو رامزدا) و نێردراوە کە خاوەنیەتی ئەمەش لە چاخی هەشتەمدا بووە دوای ئەوەی کشتوکاڵ لەم ناوچانەدا رەونەقی پەیدا کردووەو بلاّوبۆتەوە.

بە زۆری (وندیداد) تازەترە لە ئاوێستای دوایی، بەلاّم (گاتاکان) کە بە رێگایەکی سەرەتایی هاتوون زۆر کۆنترن. بەپێی ئەو لێکۆڵینەوانە و بۆچوونانە دەگەینە ئەنجامێك کە ئاوێستا کۆن تاوەکو ماوەیەکی زۆر لە پێشکەوتنی شارو کشتوکاڵ بیّ زانیاری بووە هەروەها لە گاتاکانی چاخی هەشتەمی بەر لە زاینیش کۆنتر نییە. گاتاکانیش لەو ئەدەبیاتانە کۆنترن کە دەتوانین بڵێین: بەر لە هەزارەی یەکەم رێکخراون.

12- لە گاتاکاندا سیستمێکی سەرەتایی هەیە کە بۆ بەر لە دروستکردنی دەوڵەت یان شارستانیەت دەگەڕێتەوە سەرۆکی ئەو کۆمەلاّنەش کە سەرپەرشتی کاری مەزەبی سیاسی عەشیرەتەکەی دەکات هەروەکو ئاماژەی پێدراوە، سوار چاکێکە، یان میرێکی کاهینە.

لە بەرگی یەکەمدا روونکردنەوە یەکەم لەسەر ئەو کۆمەڵەداوە، ئەویش بەو جۆرەیە لە قۆناغی سەرەتاییدا و لە دروستبوونی کۆمەلاّنی کۆچەریدا کاهین و سەرۆکی کۆمەڵەکان لە کەسێکدا کۆبووەتەوە، بەلاّم وردە وردە و لەسەرخۆ ئەو دووانە لە یەکتری جودا بوونەتەوەو پەرستگاش لە دەرەوەی ئەواندا بەشێوەی دوو دروستکراو بەیەکەوە پەیوەستی کردوون هەروەها کارتێکردنیشی بەسەریانەوە هەبووە کە بەکارەکانیان هەستاون. لە گاتاکاندا بە زمانێك پسەکراوە تیایدا ئەوە زانراوە کە سەرۆکی عەشیرەتەکانی ئارییایی سەرۆکی مەزهەبی و ئاگری وەجاخ و پەرستگاو گەورەی خێزان بوون.

سوارچاك كە میرێكی كاهین بووە لەسەر شێوەی (Ensi)ی وڵاتی سۆمەر بووە كە بۆ هەزارەی چوارەمی پێش زایین دەگەڕێتەوە ئەمەش یەكێك بووە لەو دوو شوێنەدا كە پلەی وەرگرتووە. یەشتاكانیش بە زمانێكەوە پەیوەستبوون كە تیایدا بە جۆرێك كۆمەڵان خەڵكی دەركەوتوون كە قۆناغەكانی سەرەتاییان بڕیوە.

ئەوەی لە (یەشتا) كۆنەكانیشدا هاتووە وەكو (مهریشت) و (رام یشت) و بەشێك لە (فەروەردین یشت) ئەوە دەگەیەنن كە بەر لە مێژووی گاتاكان دانراون.

خوێندنەوەیەكی وردی زمانناسی كە لەمساڵانەی دواییدا بەسەر گاتاكان ئەنجامدراوە ئەوەیان تیادا دەركەوتووە كە خاوەنی دیالێكتی تایبەتن بە خۆیان هەروەها هەمان شت لە یەشتاكانیشدا هەن واتە دووبارە بوونەتەوە.

كۆنترین بەش لەناو گاتاكاندا یەسناكانە بە مانا (هپتانگ هائیتی)، بەڵام لەناو پاشماوەی یەشتاكاندا بەردەوامییەك هەیە بەوەی گاتاكان كۆنترین ئەڵقەن لەم نووسراوەدا.

(پورداود) باوەڕی وایە كە هەندێك لە (یەشتاكان) بە زمانێك نووسراون كە مرۆڤی هیندو ئێرانی مەزهەب هەیانبووەو پێیان نووسیوە، ئەو دەنووسێ: (سەیركردنێكی ئەو شتانەی كە لە یەشتاكاندا نووسراون و ئەوانەی داستانە مىللییەكانیش بە زمانێك نووسراون بۆ سەردەمێكی دوورە دەڕۆن هەتاكو بە سەردەمێك دەگەنەوە كە ئێرانییەكان و هیندییەكان تیایدا پێكەوە ژیانیان بەسەر بردووە. ((ئەو داستانانە لە رێگویداشدا لای براهماكان هەن. تیۆرێك كە لەسەر زمانی یەشتاكان داڕێژراون سەردەمی دروستبوونی ئەوانەی (واتە داستانەكان) بە چاخی گاتاكان داناوە كە لەناو گاتاكان و یەشتاكاندا هاوبەشن و بەرچاو دەكەون)).

ئەوەی لە یەشتا كۆنەكاندا سەرنجڕاكێشەو بە چەند سەدەیەك دانراو و ئەوەیە ناوی پادشا نەهاتووەو شارستانیەتی شاریش ئاسەواری نەبینراوە. قارەمانەكانی گاتاكان ناوەكانیان خاوەنی رەسەنایەتین لەوانە پیاوی ئازا، سیمرغ، رۆخۆر دێوی دوژمن ئەمانە كە لە (فروردین یشت)یشدا هاتوون هەر بەو جۆرەش لە یەشتاكانیتریشدا كە لای كۆچەرییەكان كۆنن راڤەیان لێكردوون.

وشەیەك كە لە گاتاكان و یەشتاكانیشدا بەكارهێنراوەو هۆكاری گومانی لای لێكۆڵەران دروستكردووە (دخیۆ) (سەرۆكی گوند، یان وڵات) یا وەكو (دهیۆ)یە كە (گوند)ە. (دخیۆ پاتی) (سەرۆكی وڵات)ەكە هەمان (دخو)یەو (دە) خواش دەگرێتەوە.

به زۆری لێکۆڵەران (دخیۆ) بە (وڵات) راڤە دەکەن. من سەرم لەوە سوورماوە کە چۆن لە دواییدا (دهیۆ) بە (دە) گۆڕدراووەو مانای گوندی وەرگرتووەن لای لێکۆڵەرانی زمانناسی نوێش (دهیۆ) بە (ناحیە) لێکدراوەتەوەو (شار)یش گەورە بووەو بووە بە وڵات، هەروەها وشەی (کشور) بە (وڵات) یان (کرشور)یش کارییێکراوە کە پێیان وتووە (خشترم) ئەمەش بە مانای (پادشا) یان سەرۆکی وڵاتیش هاتووە کە (خشتاتیا) ناوی بووە.

لەم حاڵەدا کە (ناحیە) بووەتە (کیشوەر) (وڵات) گرنگی خۆی لە دەستداوە بەهۆی ئەوەی بە (دە) گۆڕدراوە. (دهیۆش) هەمان (دە) خوایە و (دهیۆپت)یش مانای (دە) خوای لەخۆ گرتووە. لە گاتاکاندا وشەی (شار) باس نەکراوە، هەروەها وڵاتیش بەمانای راستی ئاسەواری نییە و بەکارهێنانی لەلایەن پادشاکانی وڵاتەوە لە گەردونەی گاتاکاندا لە یەشتا کۆنەکانیشدا (شار) و (کشور) (وڵات) لەسەر شێوە یەك نین. ئەگەر پەنابەرینە بەر لێکۆڵینەوەکەی (پورداود) دەبێ ئەم یەشتانە پەیوەست بن بە سەردەمی بەر لە کۆچی ئاریاکان بۆ هیندو ئێران لە هەزارەی دووەمی بەر لە زایین کە خراوەتە پاڵیان.

لە بەدواچوونەکانی (کریستنشن) و ژمارەیەکیتر لە خۆرهەڵات ناسەکاندا یەشتا کۆنەکانیان کردووە بە دوو بەشەوەن بەشێکی کۆن و بەشەکەیتری خاوەنی فەرموودەکانی زەردەشتە، بەشە کۆنەکەی بۆ بەر لە کارتێکردنی ئایینی زەردەشتە، بەڵام بەشەکەیتر ناخەنە پاڵ ئەو. هەرچەندە لەوانەشە هەریەکێك لەو یەشتانا لە سەردەمانی جیاوازدا رێکخرابن و خاوەنی بەشە جیاجیاکانیبن، بە هەمان شێوە ویداکانیش بە یەك شێوەو لە یەك سەردەمدا نەهاتوون و ئەو سروودانەش نەوتراون بە مانا رەگوریشەیان جیاوازن و لە سەردەمانی جودادا رێکخراون.

بەڵام بەپێی لێکۆڵینەوەکانی زمانناسی (یەشتاکان) لە بنەچەدا دواتر لە گاتاکان نووسراون و زمانەکەشیان شێوە حەقایەتە. یەکگرتنێك لەسەر بەشە کۆنەکانی و وەرگرتنیان لەلایەن کلێسای زەردەشتییەوە لایەنگرە بۆ ئەو راستییەی کە رۆحانییەکانی کۆمەڵانی خەڵکی بە ئایینی ئاریاکان هەماهەنگی و هاوبیریان ماوەتەوەو ئەو بەشانەش بەپێی باوەڕەکانی کۆنی ئاریایی خۆیان رێکیان خستوون. ئەو باوەڕانەش بەر لە زەردەشت بە پاشکۆکانی ئایینی زەردەشتەوە تێکەڵاوبوون و بە زمانی رۆژداڕێژراون، بەڵام دواتر لە گاتاکان و (یەشتا) کۆنەکانیشدا هێشتا بەو سەردەمدا رێکنەخراون.

13- بەپێی خوێندنەوەو ئەو لێکۆڵینەوانەی لەسەر (ویداکان) کراون مێژووی ڕێکخستنیان تەواو دیاری نەکراوە کە شوێنی متمانە بێت. هەروەکو لە بەرگی یەکەمدا ئاماژەم پێداوە (ویداکان) سرودی پیرۆزی ئاریاکانی کۆچکردوون بۆ هیند.

(ویدا) لە زمانی سانسکرتیتدا بە مانای دانایی دێت و لەناو هیندییەکانیشدا بە بەرزترین زانست و چاکەی دادەنێن (ڕێگویدا) بە مانای زانست و چاکە دێت کە سرودی پیرۆزن، یان سرودی ستایشکردنن. لە ئەدەبیانی سانسکریتدا واهاتووە کە ((ویداکان هۆنراوەی دروستکراو نین کە مرۆڤ داینابن بەڵکو ئەزەلین)).

(ویتنی) زانای ئەمەریکی ئاوەڕی وایە (ڕێگویدا) تەواوی بناغە و ڕەگوڕیشەی مەزهەبی و سیاسەتی هیند نیشان دەدات. (ویداکان) پێکهاتوون لە (ڕێگویدا یان سرودی ستایشی ئاسمان، یاوەکو سرودەکانی قوربانیانی ستەملێکراو، یان (ویدا) سزای قوربانییە.

(ترودا) زانستی سیحر و جادووەو بەشێك لە هیندییەکان بە سرودەکانی سەرەتایی (ئەزەل)ی زانست و زانینی دادەنێن کە پەیوەندی بنەڕەتی بە (ئەتروداوە) نییە. دەربارەی کۆنی ویداکان و زمانناسی و دانانی مێژووی وردە (کرۆنۆلۆژی) لێکۆڵەران لێکۆڵینەوەی زۆریان لەسەری ئەنجامداوە کە ماوەیەکە پێوەی سەرقاڵن و لەم هەوڵەیاندا بە چەند نامەیەکی جیاجیا گەیشتوون، بەڵام بۆ دانانی ڕۆژگاری (گاتاکان) گرنگی زۆریانپێداوە کە بە شێوەی چڕکردنەوەو کورتکردنەوەیان ئاماژە بەم لێکۆڵینانە دەدەین:

(ماکس مۆلەر) یەکەمین کەسە، تێکۆشاوە کە توانیویەتی (کرۆنۆلۆژی) ئەدەبیاتی هیندستان بە وردی ڕێکبخات، هەروەها لەگەڵیا مێژووی سرودەکانی ویدایش بکات بە چەند بەشێکەوە کە بۆ نێوان (1000-1200پ.ز)ی گێڕاونەتەوە.

(مانرا) بۆ بەر لە زایینی داناون. براهمانا (600-800پ.ز) گێڕاونەتەوە.

(فارتین هاوگ)ی زانای بەناوبانگی ئەڵمانی دەستپێکردنی ئەدەبیاتی، ویدایی بۆ (2000-2400پ.ز)ی بردوونەتەوە. پرۆفیسۆر (یاکۆیی) ئەڵمانی مێژووی ویداکانی بە کۆنتر داناوەو بردوونیەتەوە بۆ نێوان (2000-3000پ.ز) هەروەها دەریخست ئەوەی بە تەخمین داناوە کە لەوانەیە مێژووی ڕاستی (ویداکان) لەوەش کۆنتر بێت.

هەنگاومێك کە (تیلاك) تیۆری خۆی نیشاندا ئەو واتە (یاکۆیی) جارێکیتر ویداکانی پەیوەستکرد بە (5) هەزار ساڵ پێش زایین.

(تیلاك) بە سوود وەرگرتن لە زانستی ئەستێرەناسی، دێرینی ویداکانی بردۆتەوە بۆ (7) هەزار ساڵ پێش زایین. مارتن بوهلەری ئەڵمانی تیۆری تیلاکی پەسەند کردووە. دواتر (ووست)ی ئەڵمانی بەپێی لێکۆڵینەوەکانی لەسەر تیۆری لێکۆڵینەوەی زانایانی بەر لە خۆی وەکو (ئالدەنبورگ) و (گلدنەر) و (ماکدۆنل) کە ناوی هەندێك لەوانەی لە (پاروقی) بردووە، گەیشتووە بەو ئەنجامەی کە لە (رێگویدا)دا (ماندالا)ی نۆیەم بۆ بەر لە (1400پ.ز)، بەڵام یەکەم بۆ (1400پ.ز) و (ماندالا)ی دەیەم بۆ سنووری (1200پ.ز) دانراون.

نیشتمانی یەکەم و نۆیەم لەو (ماندالا) نەدیار نین، بەڵام (5) و (2) و (7) و (10)ە لە هیندستان رێکخراون، بەڵام ئەوانیتر لە دەرەوەی هیندستان دانراون چوارەم لە سنووری نۆیەم و حەوتەم لە سنووری هەشتەم تەخمین دەکەم. بەشێوەیەکتر رێکخستانی رێگویدا کە بۆ دەرەوەی هیندی دەبەنەوە کۆنترە لە 1400 پێش زایین. لەم لێکۆڵینەوەیەدا کەمو کورییەك کە هەیە ئەوە دەگەیەنێت کە هەر ماندالایەك لەژێر ژمارەیەکدا تۆمارکراوە بە مانا ئەوانەی سروودەکانیان گوتووە لە رۆژگاری جیاوازدا رێکیان خستوون،

لەگەڵ ئەوەشدا (ماندالا)ی یەکەم هەر خۆی سەردەمەکەی نەزانراوە، بۆ زانینی ئەم بابتەش بە کورتی روونکردنەوەیەك ئەدەم:

سروودەکانی رێگویدا کە شاعیرەکان رێکیان خستوون و (ریشی) ناوی لێناون پێکهاتوون بە (2801) سروود، (سوکتا) دەڵێ: لە رێکخستنی ویداکاندا (ریشی) هاوبەشی لە (400) یاندا کردووە. کۆمەڵەی سروودەکانی بەشی یەکەم کە (ماندالان) دەرکەوتوون کە لەو (1) ماندالایەن کە سروود واتە لە (1-10) ژمارەیان لەسەر دانراوە.

پرۆفیسۆر دکتۆر (مانکا) لە کتێبی مێژووی رێگویداد نووسیویەتی: باوەڕم وابە کە (744) سروود لە ویداکان پەیوەستن بە رۆژگاری (راما) و (48) سروود بۆ بەر لە رۆژگاری (راما)ن بەشێوەیەکیتر لە 80٪ی ئەو سروودانە بۆ رۆژگاری (راما) و بەر لەو پەیوەستن.

(راما) کە یەکێکە لە قارەمانەکانی رەسەنی (ویداکان) مێژووەکەی بۆ (1400-1700پ.ز) دەگەڕێتەوە.

(مانکا) بە سوود وەرگرتن لە مێژووی ئاسایی هیندستان و حەسابی پورانی مێژووی (راما)ی بۆ (3750)ی پێش زایین بردۆتەوە هەروەها لێکۆڵینەوەی لەسەر شاعیرەکانی ویدایی و سوکتاکانی 1، 3، 4، 6، 7 کردووەو دایناون کە پەیوەستن بە رۆژگاری (راما)یان بۆ بەر لەو دەڕۆن.

لێکۆڵەرە تازەکان سەردەمەکانی 1200 پێش زایین، یان 1400 ساڵ پێش زایین وەرناگرن. دکتۆر (سارما-Sarma) زانای هیندی مێژووی سەردەمی ویدایی بۆ نێوان 560-1200 پێش زایین سنووردا مردووەو بە (3) سەردەمەوە دابەشیکردووە: (مانترا)، یان سروودەکانی (ڕێگویدا)، کە سەرچاوەی رامانن. بەشەکانیتری بە مانا (براهماکان) یان ئاداب و رسومی مەزەبی (ئوپانیشادەکان)یان فەلسەفەی دانایی کە لە سەردەمەکانی دواتردا ڕێکخراون.

هەروەکو چەند کارێك رام داوە ڕێگویدا رەکو ریشەی سروودن و (براهمانا) بەهۆی (برەهمەنەکان) و (ئوپانیشادەکان)، یان بەهۆی رۆحانییەکانی فەیلەسوف و زاناوە ڕێکخراون. بەپێی ئەم ژمێرییە (ڕێگویدا) بە (1200) ساڵ پێش زایین، ڕێکخستنی دادەنرێ. (بویس) پشتبەست بە بۆچوونەکانیتر (ڕێگویدا)ی بردۆتەوە بۆ دەیەی دوایی ئەندام بەوە گەیشتووە کە ڕێکخستانی ڕێگویداکانی بردۆتەوە بۆ بەر لە 1700ی پێش زایین زۆرینەی لێکۆڵەرانی سەردەمی رەزامەندن لەسەر ئەو تێڕوانینانەو ڕێکخستنی سروودەکانی ڕێگویداکە بۆ دەرەوەی هیندستانی دەبەنەوە لە نێوان (1500-1700پ.ز) ئەمەش لەکاتی کۆچبەرانانی گەورەی ئارياييەكان بووە بۆ دەربەندی (سەند).

(هەرتل) یەکێکە لەو کەسانەی کە لە سەرتای چاخی بیستدا ئاماژەیداوە کە ڕێکخستنی (ویداکان) لە دەرەوەی هیندستان ئەنجامدراوە. ئەو دەنووسێ: بوونی گژوگیا وەکو (سۆما) یان (هەوما)ی ئێرانی لەگەڵ (جۆ) پەیوەستبوون بە ناوچەی ئێران،

بەڵام دەربارەی (برنج) و (قامیشی شەکر) زیاتر لە هیند گرنگیانپێداو، ئەمانە دەریئەخەن کە ڕێگویدا لە دەرەوەی هیند دانراوە. (ئاشفاتە) کە یەکێکە لە گیاکان، لە شەعایری (مەزەبی) براهاماکانا زۆر گرنگە و ناوی تەنیا لە سروودەکانی (1) و (10)دا بە ئێمە گەیشتووە، هەروەها (گەنمە شامی) گەرك ریشاڵەکەی بە نرخە لە هیچ کام لە سروودەکاندا ناوی نەهاتووە. (نیاکرود) و (وەرنە) و (ئوردوم برە) و (پلاکشە) و (یەکنوکتە) و (پرنە) و (بیلوا) و (ئالیکی بەبەها) قسەیان لەسەر نەکراون، هەروەها داری هەنجیریش لای هیندییەکان گەلێك گرنگ بووە.

(هەرتل) باوەڕی وایە کە زمانی (گاتاکان) و (ویداکان) لە ریشەیەکەوە هاتوون و بە زمانێکەوە پەیوەستن. هەر ئەو جۆرە کە دیومە (میلز) بەر لە نیو سەدە جارێکیتر هەمان

واقیعیەتی ساخکردۆتەوەو وێنەی ئەو زاراوانەی تەواو داوە کە هاوشێوەن لە (ویداکان) و (گاتاکاندا) و را لەسەر داون.

بەو جۆرە ناوی خواکانی ویدایی لە ئاوێستای کۆندا بە (یەزدان) و (دێوان) گۆڕدراون، وێنەی ئەمانەش بە چەند نموونەیەك لەم زاراوانە ئاماژە پێدەدەین، ئاشە، یان ئارتە-رتە، مینیۆ-مینۆ، و هۆمنە و سومنە، خشاترا-کشاتزا، ئارمائیتی-ئارمتی، هۆروتات-سروتاتی، ئامرتات-ئامریتاتو، سراوشە-چراوشیت، ویو-ویو، یەیما-یاما، پریتا-تریتا، هئومە-سومە، ورتر-ورتر، ئیندرا-ئاندرا، گندهارو-گندروو.. هەتاکو لە گاتاکاندا سروودی 32 بەندی 4 دۆست و خۆشەویستی دێوان (دئو-زوشتەی) ناو بووەو لە ویداکانیشدا جارێکیتر هەمان زاراوەی (دو-جوشتە) بەکارهێنراوەتەوە.. لە کۆتاییدا ئەم لێکۆڵینانە دەگەنە ئەنجامێك کە ئاریایی ویدایی و گاتایی بە سنوورێکی زۆر لە یەکترەوە نزیکن و لە یەکدەچن، هەتاکو لە رسوم و ئاداب و باوەڕێ خۆشیاندا جارێکیتر لە یەکتر نزیك دەبنەوە. ئەو واقیعیەتەی کە لە چاخی بیستدا لە توێژینەوەی لێکۆڵەرانی سەردەمدا هاتووە ئەو حاڵەتە تەواو دەچەسپێنی. لە حاڵێکدا بە باوەڕی تەواو دەڵێم: گاتاکان و دیداکانی سەرەتایی زانیارییان لە یەکترەوە وەرگرتووە بەهۆی ئەوەی ئەو دوو گەلە لە یەکترەوە نزیکبوون. لێرەدا ئەوەی سەرنجراکێشە بەشێك لە خۆرهەڵاتناسان ئاماژە بەوە دەدەن لە ویداکان سەرەتاییدا بە دوو زاراوەی لە توانای مرۆڤ بەدەر ئاماژە دەدەن کە تیایدا خواکان یەکدەگرنەوە کە پێکهاتووە لە (دوو) (Deva) (دئوەی ئاوێستا) و (ئاسوورە). (بویس) دەنووسێ: (زاراوەی خواکانی کۆنی هیندو ئێران (دوو) بووە کە بە مانای درەخشان دێت، ئەو خوایانە بە رووناککەرەوە ناویان رۆشتووە). بەو شێوەیە نازناوی نەمری، یان (ئەمرتیە) کە هەمان (ئامشەی ئاوێستایە) بەهاو واتایەکانن.

ئێرانییەکان وشەی بەگە کە بەمانای بەخشندە دێت لەگەڵ خواکاندا بەکاریان هێناوە. زاراوەیتریش کە هەیە بەناوی (ئاسورە) (لردیا) یەکە مانای خۆشی خواوەندگارەو بۆ مرۆڤیش بەکاردەهێنرێ. ئەو ناوە لە (ویداکاندا) نازناوی هەموو خواکان بووە، بەڵام بەر لەمە بە (دیۆس پیتار) گوتراوە کە بە تواناترین خواکان بووە. بەپێی ئەو لێکۆڵینانەی هاوچاخ (ئاسورە) پێشتر لەگەڵ خوادا دیاریکراوە، خواکانیش لەگەڵ رۆحانییەکاندا بەو تێڕوانەدا بەو ناوە ئەنجامگیربوون، کە نازناویان بووە. ئەمەش لە حاڵێکدا بووە کە دوو زاراوە لەسەر خوا بەشێوەیەکی گشتی هەبووە.

(میلز) دەنووسێ: (ئاسورە) لە ویداکانی کۆندا باوکی خواکانە و خوای ئاسمانە کە ژمارەی ئەمانە سیانن، یەکەمیان خواکانی (میترا-وارۆنا-ئاریامن)ە کە قارەمانبوون هەتاکو دەگەنەوە بە (ئاگنی) کە خۆشەویسترین خواکانی هیندبوون، کە لەوانەوە ئەوانیتر لە دایکبوون. ئەو واتە (ئاسورە) هەردەم باوکی قارەمانەکانە لەسەر زەوی کە تیایدا لە دایکبوون، هەروەها باوکی خاوەن باوەڕەکان و باوکی هەتا هەتایی نەمریشە، هەتاکو خواکانیش سروودیان بۆ وتووەو کوڕانی ئاسامنیش خزمەتکاریبوون.

(ئاسوورە) لە ریشەی (ئاسو)وە هاتووە کە بە مانای بوونی رۆح شێوەی وەرگرتووە ئەم وشەیەش بە خاوەن سامان گۆڕدراوە. ئەم شێوەیە لە سروودەکانی (ویدا)دا بە لێکۆڵینەوە لەسەری ئاشکرا بووە: لە سروودە کۆنەکاندا ئاسوورەی گەورەو بە توانا شوێنی ستایش رێز لێگرتنبووە.

لە رێگویدای 5 سوکتای 85 بەندی 6 کە بە دەستمان گەیشتووە باوکی ئێمە (ئاسورە) لەژێر ئاودا درەوشاوەتەوە.

لە رێگویدای5 سوکتای 63 کە بەندی 3 بەدەستمان گەیشتووە پەرتیارانی (وارۆنات) و (میترا) بە ئێمە دەڵێن: (دو) لە ئاسمان بەهۆی توانای سیحری ئاسورەوە باران دەبارێنێ.

لە رێگویدای 5 سوکتای 63 بەندی 7 ئەمە گەیشتووە: یەینە (دو) (وارۆنا-میترا) بە توانای سیحر ئامێزی (ئاسورە) رۆشتنی خۆی دەپارێزێ بۆ ئەوەی لە دنیادا بەهۆی ئەوەی راستە حکومەت دروست بکات.

لە رێگویدای 2 سوکتای 27 گەیشتووە:

لە رێگویدای 1 سوکتای 55 لە نێوان (Deva)ەکاندا ئاسورە گەورەترین و تاکو تەنیایە.

لە رێگویدای 3 سوکتای 4 بەندی 35 ئەمە گەیشتووە: ویشنۆی پیرۆزو گەورە ئاسورە خاوەی ناوی بووە.

لە رێگویدای 5 سوکتای 41 بەندی 3 ئاسورە هەردەم سەرچاوەی رێز بووە، بەڵام لە ویداکاندا وردە وردە گۆڕانکاری دیاریکراوی تیادا بینراوە کە مانای تەنیای ئەوەی خاوەنیەتی واتە خاونی گەورەیی و خوایەتییە و دژ بە خواکان (ئاسورە) گۆڕاوەو بووەتە سەرچاوەی خراپە و تیایدا بەردەوام بووە.

لە رێگویدای 10 سوکتای 4 بەندی 53 ئەمە گەیشتووە: پەیڕەوانی دێوەکان کە چۆن دژی پەیڕەوانی ئاسورەی بون (پەیڕەوانی دیوان بەرانبەر پەیڕەوانی ئاسورە بڕیاردەر بوون).

له ڕێگویدان 5 سوکتای 1 بەندی 131ك ئیندرا خواستوویەتی لەشکری ئاسورە نەمێنێت.

له ڕێگویدای 1 سوکتای 100 بەندی 6-8: (ویشنۆ) و (شێوا) داواخواز بوون کە توانای (شاسورە) و قارەمانەکانی بەرەو کۆتا برۆن، لەم سوکتایەدا پەیکەری برادەرانی (ئاسورە) و (دیوەکان) کەوتووەنەتە سەر زەوی (ئەو برادەرانەی کە دوژمنی یەکتربوون).

له سروودی 8 سوکتای 85 دژانی ئاسورە ناسراون پەیڕەوانی ئاسورە بە دوژمنانی پەیڕەوانی دێوەکان گۆڕاون.

(ئادوە) بە مانا دژی (دێوە) لەبەر ئەوەی لە سانسکریتدا هێمای نەفییە. پەیڕەوانی ئاسورە، یان ئادوە-(ئاسورە، یان ئاسەوارەکان دژ بە دێوان ناویان دەبەن، ئەوەی سەرنجڕاکێشە لە (وندیداد)دا جارێکیتر (دئو) بۆ ناسینی ئاهورا پەرستان و (فردیەسنایان) بەکارهێناوە بە مانا دژی دێوان. ئەم ململانێیە بەڵگەی سەرنجڕاکێشە لە شێوەی ئەو گۆڕانکارییەی لە مانای (ئاسورە)دا دروستبووە.

لە (مهابهاراتا)ی دوانزەیەمین بەندی 1184 ئەمە دەڵێ: ((لە رۆژگاری رابردوودا سەردەمانێك شەڕ لە نێوان دێوەکان و ئاسورەکاندا روویدا، ئاسورەکان برایانی گەورەن و دێوەکانیش برایانی بچووکتر بوون))، بەشێوەیەکیتر، یەکەم:

ئەم جیاوازییە پەیوەستە بە سەردەمی زۆر دوور، دووەم: ئەم دوو گرووپە کە برای یەکتربوون لە رەگو ریشەیەکەوە هاتوون و خاوەنی شێوازیێ ئاینبوون، هەروەکو:: لە ڕێگویدای 1 سوکتای 100 رەچاوم کرد. لە (ئاترو-ویداو).

براهمانا کە دوتر بە ڕێگویدا ئاشنابووە هەمیشە (ئاسورە) مانای توانای تاریکی دژ بە (دوە) خۆی دووچارکردووە.

لەو بەشەی کە ناوی (ئاهورامزدا) دێ و شیکراوەتەوەو لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە دەتوانین بڵێین: (ئاهورە) هەمان ئاسورە)ی ویداییە و لێی وەرگیراوە، زەردەشت هۆکاری رەوانناسی دەستکەوتووە، ناوێك کە لای مرۆڤ سەرچاوەی رێزو نیشانەی مەعنەوییەتی خواییەکە هەڵیانبژاردووە، (دوە) ناوێکی کە هەمان خوای ئارياییە و دێوان بەو ناوە ئاشنان کە سەرچاوەی درۆ و فریدودانن و بە درۆ خۆیان دگۆڕن. ئەم کارە پێشەکی دەبێتە هۆکارێك بۆ پەیڕەوانی دێوان لە هیند بە تایبەتی کاهینەکان و باوکی خواکانیان کە ببنە دوژمنی زەردەشت و ئەوانەی پەیڕەوای ئاهۆرامزدان کە هەمان (ئاسورا)ن هێرش بکەنە سەریان.

(ئاسورە) لە رۆژگاری (زەردەشت)دا هەمان خوای خراپەکاری ویدایی رێنیشاندەر بووە. ئەمە راستییەکە و لە دەرکەوتنی زەردەشتدا ئەم رووداوە بینراوە لە گەیاندنی پەیامی ئەو دابوونی هەبووەو جێبەجێکراوە.

(برادکە) زانای ئەڵمانی کە لەو رووەوە لێکۆڵینەوەی کردووە، بەم ئەنجامە گەیشتووە ((دەرکەوتن (ئاسورە-ئادوە) لەناو هیندییەکانی ویداییدا بە هەڵە خستویانەتە پاڵ ئێرانییەکانی ئاوێستا)). بەو پێیە بەڵگە زۆرە کە ئەو باوەڕە دروستدەکات لە هەمانکاتیشدا دەبێتە سەرچاوەی تێڕوانین و گرنگی پێدان دەربارەی مێژووی زەردەشت.

وتەیەك کە سەرنجڕاکێشە لەسەر: ماندالای 5 سوکتای 85 ئەوەیە: کە (ریشی ئاتری بها ئومە) سرودەو پەیوەستە بە رۆژگاری (راما) و لە (ماندالا)ی 5 سوکتای یەکەمدا هەیە، بە مانا ئەو (ماندالایە لە سوکتاکانیتر کۆنترە. هەر بەو شێوەیەش سروودی 5 سوکتای 62-63 پەیوەست بە (ریشی ئارکنانا-ئاتریا) کە رەگوڕیشەی لەوانی دی زیاتر کۆنترە.

هەڵبەتە مەسەلەیەك هەیە کە نابێت فەرامۆش بکرێت ئەوەیە کە لە مەزەبی ویداییدا (یاسا) دیاری نەکراوە بەڵکو زووتر لە شێوە فەرهەنگێکی تایبەتدا توانیویانە ئەو رێنماییە بکەن. لەو رووەوە لەوانەیە لە (ماندالا)یەکدا هەموو داواکاریەکان بە یەکسانی نەخرابنەڕوو لە کاتێکدا لە گاتاکاندا ئەوە لەسەر هێڵێکی رێك دیارەو لەبیرێکەوە هاتووە لەناو چوارچێوەیەکی دیاریکراودا.

ئەگەر لە ئایین و مەزەبە جیاجیاکانی کۆن بە وردی سەرنج بدەین ئەوە دەبینین بەبێ جوڵێنەرێکی بەهێزی گەورە، یان گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی غەیر مومکینە ببێتە سەرچاوەی بڕیار. بەتایبەتی لەناو مرۆڤی (پولی تئیست) کە باوەڕیان بە خوای زۆر هەبووە،

هەتاکو لە توانای خوایەتی خواکانی گەلانیتریش گومانێکیان نەبووە، ئەمەش تەنیان دەربڕینە لە رازیبوونیان لە خواکان بەو جۆرەی کە پارێزەرن و ئاگاداریانن، بەوەش توانایان دەرئەخەن.

لەناو گەلانی کۆندا ژمارەیەکی زۆر لە خواو خوای تازەو بەتوانای گەورە هەبوون کە پیاوانی ئایینی و پەرستگا پێیانەوە پەیوەستبوون و شوێنیان بەپێی گرنگیان دەگۆڕدران. لەناو گەلێکدا کە خوای ئاسمان و فەلەك لە سووڕانەوەدا بوون سەرەتا ئەوانە گرنگترینی خواکانی سۆمەری بوون و گەورەی خواکان، بەڵام دواتر خوای خۆر (شاماش) جێگای ئەوانی گرتەوە کە

دەیان سەدە لەوەو بەر گرنگیان هەبووە و سەرەنجام بوونەتە پاشکۆی خواکانی بابل هەتاکو ئەو کاتەی بەرکەنار نراون تا سەرلەنوێوە جارێکیتر (ئینلیل) گەورەیی بڵاوبۆتەوە. لە میسر (حۆرس)(3) هەزار ساڵ لەناو خواکانیدا رێزی هەبوو، لەو ماوەیەدا گرنگی ئەو کەم، یان زۆر لەبەر چاو بووەو بەشێك لە پەرستگای فەراعینەکانیش پێوەی پەیوەستبوون، گەورەی ئەو پەرستگایانەش (حۆرس) بووە کە هاتوون بۆ دیدەنی بۆ ئەوەی بیانبەخشێت ئەمە یەکێکە لە گەورەترین خواکان کە دژی خوا خواستراوەکان و پەیڕەوانیان بووە لە دوژمنانیان.

پێشەکی بەراوردێك ئاماژە دەدەین ئەویش لە دەستبەیەرا داگرتنی قەمێك بەسەر قەومێکیتردا خوایان ژێر کەوتوو جارێکیتر بەزۆری بەشێوەی پلە (2) لە ئانپیون ماونەتەوە. لە کۆمەڵگای ویداییشدا ئەم رووداوانە بەرچاو نەکەوتوون و نە قەومێکیش دەسەڵاتــی گرتووەو ئایینی سەرکەوتووی خۆی بڵاوکردتەوە، ئایینی کۆنیش (پۆلی تئیسم) سەرگەردان نەبووەو خوا کۆنەکانیش دەرنەکراون. بەڵکو تەواوی ئاداب و رسوم و باوەڕە کۆنەکانیش کە بەسەرچوون وەکو خۆیان ماونەتەوە، جگە لەوەش هەموو ئەو خوایانەش بە هەمان ناونیشانیان ستایشکراون. لەلایەکیتر رووداوێك دەبینم کە پەیوەستە بە دەرکەوتنی زەردەشت، یان بە هەڵبژاردنی (ئاهورە) یان باوەڕکردن بە (ئاسورە سانسکریت) کە بەشێوەی خوای تەنیا و دروستکەر و بە توانایە و تیایدا خواکانی کۆمەڵگای هەمووان بە (دێو) گۆڕدراون و ئاداب و رسوم و باوەڕەکانی ویدادیش مەحکوم نەکراوە لە کاتێکدا روحانیەت و حکومەت وابەستە و پەیوەست بوون بە ململانێ، بەڵام رێکخستنی سروودەکانی ویدایی لەلایەن هەمان کاهینەکانی کۆمەڵگاوە بەجێگەیەنراوە بۆیە سەرەتا دەڵێین: ئەم ئاینە نوێیە پەیڕەوانیان خۆیان بە دوژمنی کۆمەڵگا زانیوە.

ئەو خوایانەش کە لە ململانێدا بوون لەگەڵ ئەو ئایینە و لایەنگرانیاندا و تانە و تەشەردانیان لە (ئاهورە–ئاسورە) بێ بایەخی ئەوان دەرئەخات. بەلای منەوە لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی ئەم رووداوە لە سەردەمێکدا یەکە گاتاکانی تیادا لە واقیعدا رێکخراون و رێنمایی کراون.

گاتاکان لە راستیدا لە دەوروبەرێکدا وێنەی خۆیان وەرگرتووە کە ویداکان تیایدا هەبوون. زاراوەو ماناو دەوروبەری ئەم دووانەش هاوشێوەن بە مانا لەناو قەومێکدا و سەردەمێکی هاوشێوەدا دەرکەوتوون، نەك یەکێکیان لە ئازاربایجان بێ و ئەویتر لە دامێنی (هیندوکوش) کە هەزار ساڵ نێوانیان بوو بێت!! ئەگەر بە

وردی لەویداکان بڕوانین دەبینین گۆڕانکاری لە کەسایەتی (ئاسورە)دا لەسەر وێنەی ویداکانی سەرەتایی شێوەی خۆی وەرگرتووە، لێرەدا بەو راستییە دەگەین کە ناتوانین لەوە تێبگەین لە چەند ساڵدا خوای سەرچاوە پەرستیارانی دژ بە خەڵکی خوای گۆڕدراو رۆشتووەو رازیبووە، لەوانەشە سەردەمانێك کە سروودەکانی ویدایی تیادا رێکخراوە پەیامی زەردەشت جارێکیتر دەرکەوتووەو مێژووی دەرکەوتنی (زەردەشت)یش بۆ بەر لە سەردەمی رێکخستنی گاتاکان و ویداکان بگەرێتەوە. ئەم لێکۆڵینەوەیە دەریئەخات کە تەمەنی ویداکان و گاتاکان هاوتەرین. ئەگەر سەرەتای سروودە کۆنەکانی ویدایی بۆ (1700)ی پێش زایین، دابنێین دەرکەوتنی زەردەشت جارێکیتر بۆ هەمان سەردەمی پەیوەندیدار دادەنرێ.

14- لە گاتاکاندا رابەرانی مەزەبی ناویان بەکر پە (کرپن) (کلّپە) و (ئوسیج) هاتووە کە بچووکترین ئاسەواری بەسەر براهمەکانەوە نییە، لەکاتێکدا ئەم رۆخانییانە لە هەزارەی یەکەمی بەر لە زایین لە کۆمەڵگای هیند لە سنووری 800ی پێش زایین، دەرکەوتوون واتە مەقامی بەرزی رۆحانی لە کۆمەڵدا دیاریکراون ئەگەر گاتاکان لە چاخی شەشەمی پێش زایین لەو شوێنەی (کرپە) و (ئوسیج) لەو رۆحانییانە کە ناویان براوە یان لە سنوورێکی کەمتردا کە ئاماژە هەیە، نەبوونی ناوی براهمەکان لە گاتاکاندا پشتگیری ئەو راستییە دەکات کە ئەو سروودانە بەر لە هەزارەی یەکەم رێکخراون.

15- مووغەکان رابەرانی مەزەبی ئێرانییەکان بوون لە رۆژگاری (ماد) و (هاخامەکانشییەکاندا) و مێژوونووسانی یۆنانیش ئاماژەیان پێداون کە گەلی ئاریایی هەروەکو دەڵێن: لە سنووری چاخی نۆیەمی پێش زایین لە خۆرهەڵاتی ئێرانەوە کۆچیانکردووە بۆ خۆر ئاوای ئێران، یان دەڵێن لە بنەچەدا ئاریاکانی خۆرئاوای ئێران یەکێکن لە عەشایەرەکانی مادی ناسراو کە کاری رۆحانگێریان لەو ناوە ئەنجامداوە. هەتاکو ناوی (مغ) یان (موگ) لە (ماد) یان (مد) و (مژ) لە ریشەیەکەوە هاتوون.

لە گاتاکاندا (موغ) بەناونیشانی تیپێکی رۆحانی ناو نەبراوە، هەتاکو لە یەسناکانیشدا جارێکیتر قسەیان لەسەر نییە، تەنیا لە یەکێك لە یەسناکانی ئاوێستایی نەبێت بە مانا لە یەشنی 65دا ناوی هاتووە، لە یەشتاکاندا رۆحانییەکانی ئاوێستایی (ئاترون) یان (ئازربان) ناویان بووە (لۆمل) لەو رووەوە دەڵێ: ((لە ئاوێستادا تەنیا جارێك ناوی (موغ) لە ئاسەوارێکی تازە ناوی هاتووە بە مانای لە یەسنای 65 دا بۆ یەکەمین جار باسی هاتووە کە بە پەیوەندی نزیك لە نێوان (موغ) و ئایینی زەردەشتدا ئاماژە هەیە. لەم دواییەدا کە لە

ئاوێستادا ناوی (موغ) نەهاتووە نەیتوانیوە (لۆمل) پەی بەوە بەرێت کە لە سەردەمانی زۆرینەی بەشەکانی ئاوێستای دوایشدا جارێکیتر چینێك لە موغەکان دەرنەکەوتوون و لە ئایینی (مەزدیەسنا)شدا هەر نەبووە)). هیرۆدۆت رۆحانییەکانی کۆمەڵگای مادەکانی بە (موغ) ناو بردووە، کە لە ناو هاخامەنشیەکانیشدا جارێکیتر نفوسیان بڵاوبووە، بەڵام دەسەڵاتی تەواویان نەبووە. بەپێی ئەو ئامادەکاریەی هێرۆدۆت و ئەوانیتر زانیاری کۆنیان لە سەری هەیە، رۆژێك کە (گاوماتە) (موغ) کوژراوە مرۆڤ تاشەو بە (موغ) کوشتن بەردەوامی داوە، ئەگەر تاریکی شەو نەبووایە هەموو موغەکان تەواو دەبوون. ئەم رۆژە بەناوی (گوومونیا) ناوی براوە کە هەموو ساڵێك جەژنی بۆ دەگێرن. ئەم نەزیلەیە دەیگێرێتەوە، موغەکان لەو سەردەمەدا و هەتاکو دواییش تەواو دەسەڵاتیان بە سەر کۆمەڵگادا نەرۆشتووە، گەرنا هەرگیز مرۆڤی کوچەو بازاڕ کە لە پەیڕەوانی کاهینەکان بوون بە رووخاندنی ئەوانە نەیانتوانیوە شوێنیان بگرنەوە. هەرچەندە گوزارەی هیرۆدۆت لەوانەیە لەگەڵ راستیدا تەواو یەکسان نەبێ، بەڵام پێشەکی ئاسەواری ئەمە هەیە.

لێکۆڵەران جارێکیتر لەو باوەڕەدان لە کۆمەڵگای هاخامەنشیدا، یان لە سەرەتادا (ئاترون)ەکان رۆحانیەکانیان داناوە، بەڵام وردە وردە موغەکان شوێنیان گرتوونەتەوە.

بەلای منەوە ئەم لێکۆڵینەوەیە جێگای گومانە و ئێمە ناتوانین بڵێین: رۆحانییە نامۆکان بەو شێوەیە بتوانن کاهینەکانی ناوخۆ رابگرن کە بەگشتی پاشماوەی ئەوانە لەناوچوون و پاشماوەی ناویان هیچ نەماوە. بۆ ئەمە دەتوانین بڵێین: ئایینی زەردەشت لە بنەمادا کە شیش و کاهین خاوەنی نەبوون، هەر بەو شێوەیەش پەیامبەر جارێکیتر لە پەیامەکەی خۆیدا بڵاوی کردۆتەوەو نووسیویەتی: هەمان (ئاشون)ەکان و خاون ئیمانەکانی پارس گەیەنەر و بڵاوکەرەوەی ئایینی راستبوون.

ئاترونەکان کاهین بوون کە چەند سەدەیە دوای زەردەشت لە کۆمەڵگای خۆرهەڵاتدا هەبوون لە یەشتاکانیشدا نفوسیان هەبووەو شوێنی (کرپنەکان) (کلێپەکان) و (ئوسیجەکان)یان گرتۆتەوە.

ئاترونەکان پاسەوانی ئاگری پیرۆز بوون کە بەر لە زەردەشت سەرچاوەی ستایشی ئاریاکان بوون، کە بڕیاردەر بوون لەسەر ئەو شتە.

(ئازەربانان) لە کۆمەڵگای خۆرهەڵاتدا هەمان شوێنی (براهمانا)کانیان هەبووەو وردە وردە ئەوەی دوایی لە کۆمەڵگای (هیند)دا نفوسیان زۆر بووەو لە شوێنی (کالپا) و (ئوسیك).. لە

هیندو، جێگیربوون. ئاترونەکانی یەشتاکان بە چەند پلەیەك لە پەیامی زەردەشتی رەسەن نزیکتر بوون لە موغەکانی ماد. ئاسەوارێك کە لەم موغانە ماوەتەوە (وندیدا)ە کە نموونە زۆرەکانی سەرنجڕاکێشن لەو لادانە گشتییەی کە لە بنەمای پەیامی زەردەشتدا دروستبووە. ئەم گۆڕانکارییە گشتییە لە بنەمایدا نیشانەیەکە کە ئایینی زەردەشت لایان نامۆ بووەو چەند چاخێك دوای (زەردەشت)یش هەمان خەرافات و ئایینی بتپەرستی گەڕاوەتەوە بۆ ئاریاکان کە رەنگی زەردەشتی بەخۆوە گرتووە.

هاشمی رەزای لێکۆڵەری ئێرانی دەڵێ: موغانی رۆحانی بەر لە زەردەشت ئایینی ئێرانیان هەبووە لە حاڵێکدا ئەگەر ئەم بۆیوونە راست بێت دەبوایە ناوی موغان لە گاتاکان و بەشتاکاندا لە تەك (کارپن) و (کلپە) و (ئوسیج) و (ئاترون)دا، بهاتایە و موغیش ئاماژەی پێبدرایە. (موغان) هەر بەو شێوەیە کە هێرۆدۆت باسیکردوون کاهینەکانی ئاریایی خۆرئاوابوون کە خاوەنی زانست و زانیاری و هاوشێوەی (لاویانی) کەلی جولەکەن کە لای کاهینەکانیان پەروەردە کراون. بەم بەڵگەیە جارێکیتر لە کۆبوونەوەکانیتری ئاریاییدا ئەو کارە بەدوایا هاتووەو نموونەی ئەو دەسەڵاتەش لە کۆمەڵگای ئاریایی لە هیندستاندا دەرکەوتووە. لە (مهابهاراتا)ش ئاماژە بە کۆچی موغەکان دراوە، کە لە رۆژگاری زۆر دووردا شێوە هەبووە بەو شێوەیەی لەو داستانانەدا هاتووە کە مرۆڤی باکووری هیندی بەناوی (ئوتارا-کوروس)ی شێوە جوان و نەجیب کە مرۆڤێکن لە (دوا-لوکا)یای خاکی دیوەکانن. پرۆفیسۆر.

(رائا و بەهادور) مامۆستای هیندی ویداکان باوەڕی وایە کە ئەو گەلانە لە هەمان پەیڕەوانی زەردەشت بوون کە لە پەیڕەوانی دێوەکان جیابوونەتەوە، ئەمە ئاماژەیە کە ((خاکی دیوەکان پاڵپشتە بۆیان)) و لایەنگری هەمان جیاخوازین، بە مانا باکووری هیندستان واتە (هورات) جارێکیتر مەبەستە،

لەسەر (مهابهاراتا)ش لێکۆڵینەوەی تەواو کراوە ئەو خاکەش بە (شاکادویپا) دانراوە کە جارێکیتر قسەی لەسەرە، بەوەی بە (شاکستنە) یان (ساکستان)، (سیستان) ناوزەد کراون. لە کۆتاییدا پرۆفیسۆر (بهادر) دەگاتە ئەنجامێك کە کۆچکردنی موغانی زەردەشتی کەمێك دوورترە لە مێژووی رێکخستنی (مهابهاراتا)، کە شێوەی تەواوی خۆی وەرگرتووە بەم ئاماژانە ئەگەر دەرکەوتنی موغان لە هیند بە سنووری چاخی شەشەمی پێش زایین دابنرێت، دەتوانین بڵێین: بوونی ئەوانە لە کۆمەڵگای هاخامەنشیی، دراوسێی (هیند) پێویستی زیاتری بە لێکۆڵینەوە هەیە.

ئەنجامێك كە ئەو لێكۆڵینەوانە دەستیانكەوتووە ئەوەیە كە كاهینەكانی سەردەمی زەردەشت هەمان (كرینەكان) و (ئوسجە)كان بوون و سوارچاكیش میرێكی كاهین بووەتە سەرۆكی كۆمەڵگا، بهۆی كاریگەری دەركەوتنی زەردەشت لەناو زەردەشتییەكاندا نەوەك ئارییاییەكانی چینی رۆحانی و كاهینەكان ئەوانەی كە (یەشتاكان) باسی رۆژی گاریان دەكاو ئەو گۆڕانكاریانەی بەسریاندا هاتووە كە لە بنەچدا لادانە لە باوەڕی ئاترونەكان كە وەزیفەی لادەری دەبینن لە ئایینەكەدا، بەڵام دواتر ئاگرپەرستی یان نزاكردن بۆ ئاگر بووەتە بەشیان لەم مەزەبەدا و ئایینی ئارییاییەكانیش لە نوێیەوە پەیوەستبووە بە ئایینی زەردەشت.

موغەكانی كۆمەڵگای خۆرئاواش كە چەند سەدەیەك بە ئایینی زەردەشتەوە پەیوەندبوون لە راستیدا لەسەر مەزەبی ئاترونەكانی خۆرهەڵاتی بوون كە لە بەرگێكی زەردەشتی یا ئاشنا بەو مەزەبەو باوەڕەكانیان بوون. ئەمەش شتێكی دروستكراوە كە هاتووە زەردەشت جارێكیتر خاوەنی نەبێت، بەڵام خاوەنی پاشماوەی زەردەشتییە كە ماوەتەوە. عەشیرەتی هاخامەنشیش جارێكیتر دوور بە گاریگەری موغەكان بەرەو خۆرهەڵاتی ئێران كۆچیانكردووەو بە پەرستنی ئاهورامزدا ئاشنا بوون. لە باوەڕەكانی داریۆشدا و بە یانەكانیدا و كاریگەری پەیامی زەردەشت بەر لەمە لەسەر ئەو پاشماوانەی كە ماونەتەوە لای ئێرانییەكان بەڵگەی سەیركردن و نیشانەن بۆ پەیوەندیان بە بنەمای پەیامی زەردەشتەوە بێ كاریگەری مەزەبی موغەكان.

داریۆش بەهۆی رۆشتنی هەزار ساڵ بەسەر فەرمانڕەواكەیدا هەروەكو لە بەندی 8ی ئەم باسەدا هاتووە سەبارەت بە نەبوونی دۆست بۆ ئایینی زەردەشت كە توێژینەوەم لەسەر كردووە نەمتوانیوە بازگۆی راستی پەیامی زەردەشت وەكو خۆی بگەیەنم، بەڵام ئەگەر ئەو بەیانانە بە پاشماوەی ئاوێستایی دوایی و ئەدەبیاتی زەردەشتی ساسانیان هەتاكو هاخامەنشی بەراورد بكەین رەسەنیەتی ئەو رایە زۆر لەبەر دەستدایە، بەڵام داریۆشی (موغ) ئایینی موغەكانی لە كۆمەڵگای ئێراندا تازە كردۆتەوەو هێزو توانای بۆ گێڕاوەتەوە.

لەكاتێكدا بە شێوەیەكی هەستپێكراو خەرافاتی مەزەبی لەو رۆژگارەدا روو لە زۆری بووە، بەڵام لە كۆتایی دەسەڵاتی هاخامەنشییاندا ئەوەی هەبووە بۆ پەرستنی ئاناهیتاو میترا لە بت و پەیكەر بە پەرستگاكاندا بۆ ئەو خوایانە لەلایەن زەردەشتەوە لابراون. جێبەجێكردنی فەرمانی موغەكانیش لە كۆمەڵگای هاخامەنشیاندا بەڵگەیەكیترە كە لە عەشیرەتی ناوبراودا چینی رۆحانی لەو شوێنە گەورەیەدا شوێنیان نەبۆتەوە كە موغەكان دەسەڵاتیان هەبووە بەسەریانا!.

16- له دواییدا له ته‌په‌ی (نوشجان) له نزیك هه‌مه‌دان ئاسه‌واری سه‌رده‌می ماده‌كان دۆزرایه‌وه كه په‌یوه‌ستبوون به چاخه‌كانی حه‌وته‌م و هه‌شته‌م كه له نێوانیانا په‌رستگا ده‌بینرا، كه به زۆری له په‌رستگای ئاگری زه‌رده‌شتی ده‌چوو كه ده‌چووه سه‌ر په‌رستگای هاخامه‌نشی. به سه‌یركردنی ئه‌م پاشماوه‌یه ده‌گه‌یه‌نه ئه‌نجامێك كه له یه‌كچوونی ئایینی له نێوان ماده‌كان و دواتر هاخامه‌نشیه‌كاندا ده‌بینرێ به‌ناوی مه‌زه‌بی زه‌رده‌شت كه ره‌واجی هه‌یه. به‌م پاشماوه‌یه پشتگیریان له تیۆری لێكۆڵه‌ران كرد كه له‌و باوه‌ڕه‌دان موغه‌كان له‌ناو ماده‌كاندا كاریگه‌ری په‌یامی زه‌رده‌شتییان به‌سه‌ره‌وه‌یه، كه دواتر ئایینی ئاریاكانیان (پولی تیئست) له جلێكی په‌یامی زه‌رده‌شتدا گه‌یاند.

17- به‌شێك له لێكۆڵه‌ران كاریگه‌ری باوه‌ڕه‌كانی زه‌رده‌شت له نێوان ئایینی (بودا) و په‌رستنی مانگا لای هیندییه‌كان داده‌نێن به‌و جۆره‌ی په‌رستنی مانگا لای هیندییه‌كان له‌ژێر كاریگه‌ری (مه‌زدیه‌سنا)یاندا بووه‌ن به‌ڵام په‌رستنی مانگا لای هیندو جه‌رمه‌نییه‌كان بوونی نه‌بووه‌و له (ویدا)كانیشدا ئاماژه به‌مه نه‌دراوه، به‌ڵكو به پێچه‌وانه‌وه قوربانی خۆێنڕشتن به‌جێگه‌یانراوه‌كه وه‌زیفه‌یه‌كیان بۆ داناوه. هه‌روه‌ها رێگا نه‌دان به كوشتنی مانگا یه‌كه‌مجار له (ئانزۆ-ویدا)دا به ئێمه گه‌یشتووه كه كۆنی بۆ هه‌زار ساڵ پێش زایین ده‌گه‌ڕێته‌وه. ئه‌م لێكۆڵه‌رانه باوه‌ڕیان وایه كه زه‌رده‌شت قوربانی خوێنڕشتنی رێگه‌نه‌داوه به تایبه‌تی قوربانی مانگا، كه پێچه‌وانه‌ی پایه‌ی (میترئیزمه) و ئه‌م حه‌رامكردنه‌ش لای هیندییه‌كان هه‌بووه. بۆیه ئه‌م رووداوه ده‌مانگه‌یه‌نێته ئه‌و ئه‌نجامه‌ی كه ده‌ركه‌وتنی زه‌رده‌شت بۆ به‌ر له هه‌زاره‌ی یه‌كه‌م ده‌گه‌ڕێته‌وه.

به‌لامه‌وه ئه‌م تیۆره كه ئه‌و باوه‌ڕه‌ی له‌سه‌ره له راستیدا زیاتر په‌یوه‌سته به هینده‌وه. به‌ڵگه‌ی ئه‌و مرۆڤه‌ی كه مانگای كردووه به ته‌وته‌می خۆی هه‌ر به‌و شێوه‌یه‌ش بووه لای سۆمه‌رییه‌كان كه به‌رازیان كردۆته ته‌وته‌می خۆیان و پیرۆزی بوون.

مانگاش له‌ناو خه‌ڵكی كۆندا به‌ڕێزو پیرۆز بووه. له میسر به‌تایبه‌ت خوای زه‌وی به‌شێوه‌ی مانگا به‌ته‌نكراوه، ئه‌مه‌ش نیشانه‌یه‌ك نییه بۆ (خۆرسك)ی دایكی خواكان و خوای زه‌وی كه دروستكه‌ری چوار پێش بووه. له كریت جارێكیتر خوای ئاو به‌شێوه‌ی مانگا به ته‌نكراوه‌و ئه‌و ناوی كچی خۆر بووه. له‌ناو كۆمه‌ڵانیشدا جارێكیتر وێنه‌ی مانگا به‌ڕێز بووه. مانگاو نێره‌ی ئاژه‌ڵیش پیرۆزبووه‌و خوای گه‌وره‌ش (شیواست) كه خوای ئارياييه‌كان نییه، په‌یوه‌ست به دانیشتوانی ناوخۆی هیند. بیروباوه‌ڕه‌كانی دانیشتوانی ناوخۆی هیندیش پێشتر كاریگه‌ری

ئایینی زەردەشتی یان لەسەر هەبووە، بەڵگەش بۆ ئەمە ئاسەواری مەزەبییە لەسەر (بودا)ییەکان کە مەزهەبێکی نوێیە و لای هیندەکان باشتر پێشوازی لێکراوە.

18- لە یەشتاکاندا ئاماژە بە خاك ئاریاکان لە خوارزن و مەرۆ هەیە کە تیایانا ژیان هەبووە، بەشێوەیەکیتر هەتاکو ئەو رۆژگارە گەلانی ئێرانی لە ناوچەکەدا نەبوون و کۆچی گەورەش هێشتا لە باشوورەوە دەستیپێنەکردووە. گاتاکانیش کە لە یەشتاکان کۆنترن، بەر لەو سەردەمانە رێکخراون.

19- شیکردنەوەو لێکۆڵینەوە لەسەر ویداکان و ئایینی (بودا) ئەو راستییە دەخاتەڕوو کە گاتاکان کۆنترن لە ویداکانی سروودی ئایینی. پەیڕەوانی ئەو ئایینانەش هەمان ئەو ئاریانەن کە بە مانای نەجیب و شەریف و رەسەن دێن ئایینی (بودا)ش کە لەسەر بنەمای رەوشتی دامەزراوە واتە چوار حەقیقەتی ئاریانەن کە لە هەردووکیانا (ئاریا) بەمانای رەسەن و شەریف بەکارهێنراوە. زمانی ئارياییەکانیش چووەتە ناو زمانی (هیندو ئێران) و تێکەڵاوی زمانی دانیشتوانی ناوچەکەش بووە کە بەباشی ئامادەکراوە. ئاریاش ناوێکی رەسەنی هەڵبژێردراوەو دانیشتوانە رەسەنەکەی ناوچەکە لێی ئاگادار نەبوون، بەڵام لە گاتاکاندا نیشانەیەك بەناوی ئاریایی نییە. ئەم ناوە لە ئاوێستای کۆندا جارێکیتر بە هەمان مانای رەسەن و شەریف هاتووە. دوای ئەنجام وەرگرتن گاتاکان بۆ بەر لە کۆچی هیندو ئێران دەگەڕێنەوە، بە زمانێکیتر بۆ بەر لەو ویداکان و ئاوێستا و ئەدەبیانی هیندو بە مانا نزیك بە 1500-1700ی پێش زایین کە مەسیح بە سروودی باروردی داناون. ئەمە پوختەی ئەو سەرچاوانەیە کە پشتگیری لە تێڕوانینی لێکۆڵەران دەکات سەبارەت بە کۆنی زەردەشت. بەو پێیە دەرکەوتنی زەردەشت لای ژمارەیەك لە زانایان بۆ کۆنتر لە هەزارەی یەکەمی پێش زایین دەبەنەوە.

لێکۆڵینەوەو توێژینەوەکان لەسەر گاتاکان و ویداکان نیشانیاندا کە مێژووی سەرهەڵدانی زەردەشت دەکەوێتە نێوان 1400-1700ی پێش زایین، ئەگەر دەرکەوت ویداکانی سەرەتایی کۆنترن دەبێ بە هەمان راژە زمانی کاریگەری زەردەشت بەرینە دواوە.

سەرچاوە

موهەندیس جەلالەدین ئاستیانی

زرتشت مزد لسنا و حکومت

چاپ هفتم 1374، لا96-118

# تیشکێك بۆ سەر مێژووی ئۆرارتۆ

ئۆرارتۆ کە لە مێژوی کۆندا بە شێوەی (خالدی) هاتووەو لە تەوراتیشدا بە مرۆڤی (ئارارات) ناسراوە، پێدەچێت لە هەمان سنووری جوگرافیدا ژیابن کە ئەمڕۆ بە (ئەرمەنستان) ناسراوە کە ناجیەی (وان)یشی لەسەر بووە و ئێستا لەناو سنووری کوردستانی تورکیا دایە. دەوڵەتی ئۆرارتۆ لە نیوەی یەکەمی چاخی نۆیەمی بەر لە زایین لەو شوێنەی کە ناومان هێنا لە مێژوودا دەرکەوت. ئەوەش لە رۆژگارێکدا بوو کە دەوڵەتە گەورەکانی وەکو میسر و بابل و هیتی لە هەزارەی دووەمی بەر لە زایین سوڵتە و دەسەڵاتی گەورەیان لەناوچەکەدا واتە لە خۆرهەڵاتدا هەبوو. ناوی ئۆرارتۆ لە کۆنترین شێوەیدا لە بەڵگەنامەکانی ئاشووریدا بەرچاو دەکەوێت، بەڵام لەناو ئەو بەڵگەنامانەدا تەنیا قسە لەسەر یەکێتی گەلانی کێونشینەکانی ناوچەی ئەرمەنستان لە ئاسیای بچکۆڵە و کێوەکانی باشووری گۆلاوی (وان) کراوە. ئەو گەلانە بە (ئۆرواتری) و (نائیری) ناویان هاتووە، وڵاتەکەشیان کیشوەرێکی گەورە بووە کە تایبەت بووە بە فەرمانڕەواکانیان لە سەرەتای چاخی نۆیەمی بەر لە زایین ئۆرارتۆییەکان تێکۆشاون قەڵمڕەوییان رووەو خۆرهەڵات و باشوور بڕواو بڵاوبێتەوە. لە شنووری 834ی پێش زایین هەتاکو دەریاچەی ورمێ پێڕەویانکرد و توانیان سنووری ئاشوور ببەزێنن بۆیە ئاشوورییەکانیش بڕیاری تۆڵەسەندنەوەیاندا. شەڕێك بەر لەکاتی خۆی بە شێوەیەکی دڕندانە درێژەی کێشا، و شەڕەکەش لە رووی لەوحیّ ی وەرشاو دەرهێنراوە کە دیمەنەکانی دەروازەی کۆشکی شەلمانە سری لە بالاوات پێچوانکراوە. ئاشوورییەکان لەو شەڕەدا سەرکەوتن و کۆمەڵێکیان لە ئۆرارتۆییەکان بەدیل گرت. کاسە قالّب رێژەکانی هیتی و ئاشووری دیمەنەکانی ئەو شەڕەیان لە کارە هونەرەکەدا لەبەرچاو گرتووە، بەڵام ئۆرارتۆییەکان دواتر توانیان پەیوەندی ئاشتیان لەگەڵیانا دروست بکەن و دیاری زۆریشیان لە کەلوپەلی کانزایی لە ئاڵتوون و زیو وەرشاو پێشکەشکردن بۆ ئەوەی ببنە هاوپەیمانیان و قسەیان بڕوات ئۆرارتۆییەکان چەند ساڵێك کە سەر بە ئاشوورییەکان بوون و پەیوەندیان لەگەڵیانا بەهێز بوو وردە وردە و لەسەرخۆ تین و توانایان بۆ گەڕایەوە. سەرەنجام لە رۆژگاری یەکێك لە پادشاکانیان بەناوی (ئارگێشتی دووەم) توانی ئەو شارانەی لە ئەنجامی شەڕدا وێران ببوون چاکیان بکاتەوە. ئەو وێرانکارییەش بەهۆی بەگژ داچوونەوەی مادەکان دژی سکاییەکان دروست بوو بۆ

دەرکردنیان لەو خاکەدا و لە هەمان کاتیشدا کۆتایی هێنان بە دەسەڵاتی ئۆرارتۆییەکان لەو شارانەدا. هەڵبەتە لەو هەڵوێستەیاندا مادەکان سەرکەوتن و سوودیشیان لە ئاسەواری فەرهەنگیان دییەوە. ئۆرارتۆییەکان بەهۆی ئەوەی لەکاری مەعدەنسازیدا بە توانا بوون بووە هۆی ئەوەی تیایدا سەربکەون و سەرنجی دراوێکانیشیان بەلای خۆیاندا رابکێشن. کەلوپەلەکانیان لە وەرشا و بەشی زۆری گەیشتە لورستان لە کوردستانی ئێران و هەتاکو دوورتریش رۆشت. بەشێك لەو کەلوپەلانە لە گۆڕەکانی ناوچەی (تراکیا) (تراس) بەدەست گەیشتووە، لەوانەدا دەرکەوت کارناسی مەعدەنی توانیویانە پەیکەر لەسەر شێوەی سروشتی خۆی دروست بکەن. ئاسەوارێك لەم شێوە هونەریانەش لە ناوچەی (تۆپراق قەڵا)ی تورکیا و (کرمیز بلور) و (ئارین بێرد) لە ئەرمەنستان دۆزرانەوە. (تۆپراق قەڵا) کە شوێنەوارێکی دێرینە بۆ سەرچاوەی لێکۆڵینەوە کاریگەری بە ئەندازەیەك لەسەر ئەفسانەکانیش هەبوو هەتاکو لەسەر ئەوانەش کە دەخرێنە پاڵ (سەمیر ئامیس)یش. لە کۆتایی چاخی نۆیەمی بەر لە زایین ئۆرارتۆییەکان هەستان بە گێڕانەوەی ئەو شوێنانەی کە لەوەوبەر لەژێر دەستیانا بوو لە نێوان ناوچەی گۆلاوی (وان) و (ورمێ) بە مانا ناوچەی (موساسیر)ی ئاشووری. لە ناوچەی باشووری گۆلاوی (ورمێ) و پشتی (قەفقاز)یش رووبەرووی شەڕێ‌ی قورس هاتن و وڵاتەکەیان لە ناوەوە بەهێزکرد، بۆ ئەوەی بتوانن رووبەرووی دوژمنەکانیان بوەستن لەولاشەوە رەواجیان بە پەستیارانی گرووپەکانی خواکانیشدا کە بەر لەوان تایەفە جیاجیاکان پەرستویانن کە لە سەروبانەوە (2) کوچکەی خواکانی ئۆرارتۆیی دێ بە خاوی (خالدی) و (تشیبا) و (شیڤینی) کە بڕیاردەر بوون (ئۆرارتۆ) لەمەدا پێش ئاشووریش کەوت. لە رووداوی ساڵانەدا (ساردۆری) کە یەکێك بوو لە پادشاکانی ئۆرارتۆی کوڕی (ئارگێشت) لە نیوەی یەکەمی چاخی هەشتمی بەر لە زایین گەیشتە کورسی دەسەڵات. پیرۆزییەکانی ئەو نیزامە دژ بە ئاشوور و فراوانکردنی سنوورەکەی ئۆرارتۆ و بڵاوکردنەوەی نفوسی ئەو دەوڵەتە بوو تاوەکو (میدیترانە) بۆ ئەوەی دەسەڵاتیان بەسەر رێگا بازرگانییەکاندا بڕوات. ئۆرارتۆ بە ئەنجامدانی ئەو دەسپێشخەریانەی، ئاسیای بچکۆڵەی لە دەسەڵاتی ئاشووری بردە دواوەو فەرهەنگی ئۆرارتۆیش لە ئاسیای بچکۆڵە و لەسەر زەمینەکانی دراوسێی واتە (میدیترانە) لەبەرچاو بوو. دەستڕۆشتوویی ئەو دەوڵەتەش بەسەر رێگاکاندا کە بە (میدیترانە) کۆتایی دێ لەگەڵ بەرژوەندی ئاشووردا دژوار بوو، ئو وڵاتانەش بەو هۆیەوە شێوە دەوڵەتێ‌ی پلە دووی وەرگرت، بەڵام ئاشوور ئەو توانایەی بۆ نەگەڕایەوە کە بتوانێت رووبەرووی ئۆرارتۆ بووەستێتەوە. لەو شەڕانەی دواییشدا کە ئۆرارتۆییەکان دژی ئاشوورییەکان ئەنجامیاندا توانیان سەرکەوتن بەدەست بهێنن. (ئۆرارتۆ) دوای

رووخاندنی دەوڵەتی سیاسی دوژمنی خۆی بەمانا ئاشوور توانی بە پێوە بمێنێتەوە، لەبەر ئەوەی لە 612ی بەر لە زایین نەینەوای پایتەختی ئاشوور بەدەست هێزی یەکگرتووی بابل و ماد و گەلانی بیابان نشین کەوت، بەڵام دەوڵەتی ئۆرارتۆ لە ساڵی 590ی بەر لە زایین بە دەستی مادەکان روخا،

بە مانا گەلانێك هەتاكو ئەو رۆژگارە سەر بە ئۆرارتۆییەکان بوون لێیان هەڵگەڕانەوەو لەناویان بردن. مادەکانیش کە لە ئارییەکان بوون کاتێك گەیشتە خۆرئاوای ئێران لەناو مرۆڤی دانیشتووانی رەسەنی ناوچەکەدا شارستانیەتی بەرز و درەوشاوەیان وەرگرت، بەو شێوەیە ئەوانە دنیایان داگیر کرد، بە زیوەکانی ژێر دەستی خۆشیان ئاگاداری هێز و دەسەڵاتیان بوون. کاتێکیش لە چاخی خەوتەمی بەر لەزایین سەردەمێك کە مادەکان و پارسەکان بەدوا شوێنی دانیشتنی خۆیان گەیشتن و گەلانی ئاریایی لەو ناوچەدا بێدەنگ بوون. لە ئازەربایجان و خۆرئاوای ئێرانیش مادەکان و گەلانیتریش ئەوانەی کە ناوچەیی بوون، بە زمانی هیند و ئەوروپایی قسەیان دەکرد وەکو زمانی ئۆرارتۆییەکان و مانناییەکان و هۆرییەکان و هیتر. ئەوانە بە زمانێك قسەیان دەکرد کە پێدەچێت پەیوەندی بە قەفقازی کۆنەوە، یان بە زمانی (یافشی) ئەمڕۆوە هەبێت، کە لە قەفقاز گرووپێك بەو زمانە قسە دەکەن.


سەرچاوە

دکتر رقیە بهزادی/ اریاونا ارياها

چشم اندازدر کهن تاریخ ایران/ چاپ دوم، پاییز 1383، ل17-20

# تیشکێك بۆ سەر ئاوێستا

کۆنترین کەسێك لە ئەوروپا دەربارەی زەردەشت و ئاوێستا لێکۆڵینەوەی کردبێت ((بارنابابریسوون)) بوو کە پەرتووکەکەی لە ساڵی 1590ی زایینی لە پاریس بڵاوبۆوە. دوای ئەو ((تۆماس هاید))ی خۆرهەڵاتناسی ئینگلیزی بوو کە لەو بارەیەوە تێکۆشاو ساڵی 1700ی زایینی پەرتووکێکی بە زمانی لاتینی بڵاوکردەوە کە تیایدا نووسینەکانی یۆنانی و رۆمی و ئێرانی و عەرەبی لە خۆ گرتبوو.

بڵاوبوونەوەی پەرتووکەکەی ((ئانکتیل دوپروون))ی فەرەنسیش جوولەیەکی لەو رووەوە لەگەڵ پەیڕەوانی ئایینی زەردەشتیا خستەوەو لە نزیکەوە ئاشنایەتی لەگەڵیانا پەیدا کرد. بۆ ئەو ئامانجە ساڵی 1755 رێگای هیندی گرتەبەر و ساڵی 1758 گەیشتە شاری (سوارت) لە بەندەری ویلایەتی (بۆمبای) کە مەرکەزی پارسییەکان بوو، لەوێ مایەوە تا ساڵی 1761، لەوێشەوە چوو بۆ لای زانای پارسی بەناوی ((دەستوورداراب)) بۆ ئەوەی پەروەردەی ئاوێستایی بە جوانی وەربگرێت.

(ئانکتیل دووپروون) دوای ئەوەی کارەکەی لە (سوارت) کۆتایی هات ساڵی 1761 چوو بۆ (ئۆکسفۆرد)، لەگلەڵ خۆیا هەموو ئەو دەستنووسانەی ئاوێستاو پەهلەوی کە لە هیند کۆیکردبوونەوە بردنی بۆ کتێبخنەی (بادلیان) و چاوپێکەوتنیان لەگەڵیا سازدا لەوێشەوە ساڵی 1762 چوو بۆ پاریس لەگەڵ خۆیا 180 دەستنووسی ئاوێستاو پەهلەوی و سانسکریت و فارسی برد بۆ کتێبخانەی پادشایی (کتێبخانەی گشتی میللی) لە پاریس دوای ئەوەی کە 10 ساڵ سەرقاڵی لێکۆڵینەوەو نووسینەوەیان بوو، راپۆرتەکانی تەواو کردو یەکەمین تەرجوومەی ئاوێستای تەواوکرد بۆ یەکێك لە زمانە زیندووەکانی ئەوروپایی بەناوی ((زەند ئاوێستا)) و لە دوو بەرگدا لە پاریس بڵاوی کردەوە، خاوەنەکەی لەوێ مایەوە تا ساڵی 1805 لە ژیان دەرچوو.

دوای ئەو هەتاکو 60 ساڵیش کەسێکیتر نەبوو لە ئەوروپا کار لە ئاوێستادا بکات تەنیا ئەوە نەبێت (کلکەر)ی ئەڵمانی زەند ئاوێستای (ئانکتیل) دووپروون)ی گۆڕی بۆ زمانی ئەڵمانی لە ساڵەکانی 1776-1777 و لە (رێگا)دا بڵاویکردەوە.

سەرلەنوێ ئاوێستاناسی لەلایەن (ئۆژن بۆرنۆف)ەوە دەستپێکردەوە کە زانایەکی گەورەی فەرەنسی و خۆرهەڵاتناسێکی ئەو بوارە بوو لە سەدەی نۆزدەیەمدا، خۆشی زمانی سانسکریتی دەزانی بەو هۆیەوە نزیك بوو لە ئاوێستا. راپۆرتە ئاساییەکانی لەسەر نامەی ئانیی ئێرانییەکان و نامەی ئایینی کۆنی هیندوان ((ویدا) و نووسینەکانیتری سانسکریت بۆرنۆف لە ساڵی 1883 هاتی یەکەم (یەسنە)ی لەگەڵ راپۆرتێکی زانستیدا بڵاوکردەوە، دوای ئەوەش لە ساڵ'کانی 1840-1846 هاتی نۆیەم (یەسنە)ی بڵاوکردەوە لەم کارەیدا لە گۆڕینە سانسکریتی یەکەی ئاوێستادا ئاسەواری (نەریو سەنگ کوڕی دهاڤیل)ی هێنا کە (موبدێکی پارسییەکانی هیند بوو لە کۆتایی سەردەی دوازدەی زایینی سوودی لێبینی).

(بۆرنۆف) لە تەرجوومە سانسکریتییەکەی (نەریوسەنگی) وەرگرتبوو کە لێکۆڵینەوەی لەسەر دابوو ئەویش لە (ئانکتیل دووپروون) وەریگرتبوو کە لە هیندەوە بردبووی بۆ فەرەنسا و لەوێ کەوتبووە بەردەستی. تەرجوومەکەش بناغەیەکی زانستی نەبوو چونکە وەریگێڕابوو لە یەکێك لە تەرجوومە ئاساییەکانی پەهلەوی ئاوێستایی و لە تەرجوومەکەی (ئانگتیل دووپروون)یشدا هەر بەو جۆرە هاتبوو و موبدەکانی (سورات)یش لە (دەستوور داراب) وەریانگرتبوو.

دوای مردنی (بۆرنۆف) لە ساڵی 1852، کۆمەڵێك لە زاناکان کە شارەزای زمانی ئاوێستاو پەهلەوی و سانسکریت بوون هەر یەکێك بەجیا لەوانە کاری بە نرخی خۆیان لەو زەمینەیەدا ئەنجامدا کە یادگاری تێکۆشانی یەکەیەکی ئەوانە بوو کە لەم وتارەدا نەیانتوانیووە ئەو گەوهەرانە بژار بکەن بۆ ئەمەش بە گرنگترینیان ئاماژە ئەدەم. دار میستێتیر لە ساڵی 1886 تاوەکو ساڵی 1887 لە هیندستان مایەوەو بەشێك لە یاساناسان و گەورەی پارسییەکان پێی ئاشنا بوون و لە ساڵەکانی 1892 تاوەکو 1893 پەرتووکێکیان بەناوی ((زەند ئاوێستا)) لە (3) بەرگدا داناو بڵاویانکردەوە. لەم تەرجوومەیەدا، ئەوانە کە ناوەڕۆکی ئاوێستایان هەبووەو ئاسان بوون بە هەمان شێوە لە فەرەنسییەکەشدا بەراوردیان کردووە، هەر کام لەوانەش کە ناوەڕۆکەکەی دژوار بووە بە (زەند) (گوزارەی پەهلەوی ئاوێستا)یان بۆ داناوە.

((میيە))ی زامانناسی ناسراو و شاگردی (دار میستێتیر) دەنووسێ: ((تەرجوومەی گاهانی دار میستێتیر کە لە پەهلەوی شێوە گوزارەکەی وەرگیراوە، دروست نییە، لەبەر ئەوەی گوزارەکە نادرووستە.))

پێویستە کۆششی زاناکانی وەکو (شپیگل) و (گلدنەر) و (رایشلت) لە بڵاوبوونەوەی ناوەڕۆکی ئاوێستا بەر لە ئێستا بەیاد بهێنمەوە.

ئاسەوارە بە نرحەکانی (بارتولۆمە) گرنگترینی ئەوانەی بەر لە خۆیەتی بۆ زمانەکانی ئێرانی سەردەمەکانی بەر لە مێژوو، ((زمانەکانی ئاوێستایی و پارسی کۆن)) و ((فەرهەنگی ئێرانی کۆن)).

سەدەی نوێ لێکۆڵینەوەکانی ئاوێستاناسی سەرەتای دەستپێکردنی بووە کە بە گرنگی وەرگیراوە لەو راستە رێگایەی کە بە ژمارە هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا لێرەدا دەبێت ئاماژە بە کۆشش و لێکۆڵینەوەکانی کەسانی وەکو (دووهارلە) و (منان)ێ فەرەنساوی و (ویست)ی ئینگلیزی و (هاوگ)ی ئەڵمانی و جاکسۆنی ئەمەریکایی بدەین و بەیاد بیانهێنمەوە.

لێکۆڵینەوەکانی ئاوێستاناسی لە سەدەی بیستەمی زایینیدا جارێکیتر لە وڵاتانیتریشدا زۆری بەدوادا هات، زاناکانیش لە زەمینە جیاجیاکاندا زۆر پەیوەستبوون بە زمان و ئەدەبیاتی ئاوێستایی و ئایینی ئێرانییەکانی کۆن، لێکۆڵینەوە کردن تیایاندا و ئاسەواری رۆشن و فێربوون و بڵاوبوونەوە لە نێوانەکەدا دەتوانین بە یەکەمین کودەتا لەناویانا ئاماژە بدەین لەوانە: (ئایۆنکەر) و (هێرتیل) و (هۆمباخ) لە ئەڵمانیا و (بنونیست) و (دۆمزیل) لە فەرەنسا (هەنینگ) و (بیلی) و (گرشوڤیج) لە ئینگلیزستان و (کوریلویچ) لە (لەهستان) و (مۆرگنشتێرن) و (کریستن سن) و (بار)) و ((نیبورگ) و لە وڵاتانی ئەسکەندەناڤی و (ئانکلساریا) و (تاوادیا) و (تاراپوروالا) و (بۆدی) و (کانگا) و (دهابر) و ( مۆدی) و هیستر لە زانایانی پارسی لە هیندستان و (سمیت) لە ئەمەریکا و (فریمان) و (ئابایف) و (بەرتیلیس) لە شوورەوەی. لە ئێراندا تا بەر لە بڵاوبوونەوەی راپۆرت لەسەر ئاوێستای مامۆستا (ئیبراهیم پووورداود) کاری ئاوێستاناسی و لێکۆڵینەوەی زانستی لەسەر ئایین و فەرهەنگی ئێرانییەکانی کۆن بۆ ئێرانییەکان شێوە کاردانەوەیەکی نەبوو، هەروەها نووسراوێکی باوك و باپیرانیش نەبوو بۆ ئەم پەرتووکە بەناوبانگە جیهانییەی ئەو قەومە لەو سەر زەمینەدا کە هەبووبێت.

پووورداود بەر لە جەنگی جیهانی یەکەم رۆشت بۆ پاریس بۆ خوێندنی یاسا، یەڵام لە یەکێك لە سەفەرەکانیدا چوو بۆ ئەڵمانیا بۆ وەرگرتنی هۆکاری مەرجەکانی شەڕ، بەڵام کاتێك لەو وڵاتەدا ئەو سەفەرەی درێژەی کێشا بووە هۆی ئاشنالوونی بە سەرچاوەی زۆرو لێکۆڵینەوەی ئاوێستاناسی، لەم گەشتەیدا، لێکۆڵینەوە لە زمان و فەرهەنگ و ئایینی ئێرانییەکانی کۆن دامێنی گرت، هەر لە سەرەتاشەوە ئاوێستای کردەکاری سەرەکی خۆی و بڕیاری لێدا.

(پووورداود) ساڵی 1304ی هەتاوی (1925ی زایینی) پارسییەکان دەعوەتیانکرد بۆ هیند، ئەویش سەفەری هیندستانی کرد، ئەوە بوو دواتر لەوێ ئاشنایەتی لەگەڵ بەشێك لە سەرچاوە ئاساییەکانی

ئاینەکانی ئێرانی کۆن پەیدا کرد لە هەمانکاتیشدا رای لەو رووەوە لەگەڵ زانایان و ئاوێستاناسانی پارسی ئاڵوگۆڕ کرد. بەو هۆیەوە توانی لێکۆڵینەوەکانی لە ئەوروپا بۆ تەواوکردنی کارەکەی ئەنجامبدا، ئەوە بوو بەشێك لە ئاوێستای خۆی بەناونیشانی ئەدەبیاتی (مەزدیەسنا) بە چاپ گەیاند.

(پوورداود) لە ساڵی 1307ی هەتاوی جارێکیتر سەفەری کرد بۆ ئەوروپاو لەوێ زیاتر کۆشش لە کارو لێکۆڵینەوەکانی خۆیدا کردو بەشەکانی ئەدەبیاتی (مەزدیەسنا)ی بە چەند ساڵێك دوای ئەوە بڵاوکردەوە. ئەو لە ساڵی 1311 (رابیندرات تاگوور) دەعوەتیکرد بۆ وتنەوەی فەرهەنگی کۆنی ئێران لە دانشگای (شاتتی نیکیتان) بۆیە جارێکیتر سەفەری کرد بۆ هیندستان و ماوەی ساڵێك لەوێ مایەوە.

لە کاتێکدا لە هیند بوو لای پارسییەکانەوە بۆ دییەنی (یەزیشنە) (ئاینی نوێژونزا) کە بۆ غەیری زەردەشتییەکان مۆڵەتی ئامادەبوون نەئەدرا بە ئەودرا.

(پووررداود) لە ساڵی 1313ی هەتاوی لە بۆمبایەوە چوو بۆ ئەڵمانیا و کاری توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی لە ئاوێستادا لەگەڵ ئەوەشدا تا ساڵی 1316ی هەتاوی بەردەوامی هەبوو، بەڵام ناچار بوو بۆ تاران بگەڕێتەوە. لە تاران هەرچەندە تا ماوەیەك بە هۆکاری مادووبوونی خۆی لە نووسین و خوێندنەوە دوورگرت، بەڵام ئەوە نەیتوانی بیبەستێتەوە، ئەوە بوو لە 25ی مانگی ئابانی 1347 دەعوەتکرا بۆ کۆنگرەی ئێراناسیی و دانانی فەرهەنگ لەلایەن دانشگا گەورەکانی جیهان ئەوەبوو لە دەرەوەی وڵات کاتی بەسەر برد، دوای ئەوەش سەرگەرمی وانە وتنەوەی زمان و ئەدەب و فەرهەنگی ئێرانی کۆن بوو لە دانشگای تاران کە لە گەڵیا سەرقاڵی خوێندنەوەو بڵاوکردنەوەی نووسینەکانی و پەرتووکە زۆرەکانی بوو.

(پوورداود) لە راپۆرتەکانی ئاوێستایدا هیچ کاتێك لە سنوورێکی دیاریکراودا رازی نەبووە بابەتەکەی دابخات هەتاکو ئەگەر تەواویش بووبێت، بۆیە قەڵەمەکەی رەها کردووە کە هەرچی باشتر و تەواوترە دەربارەی باسەکەی بنووسێت و بە قووڵی و لەسەرخۆ بە گشە جۆراوجۆرەکانیدا بگەڕێت بۆ ئەوەی بتوانێت رووناکی زیاتری پێببەخشێت.

یەکێك لە لایەنە باش و پەروەردەییەکەی راپۆرتی ئاوێستایی ئەو رووبەڕووبوونەوەی بابەتیانەیەتی بە شوێنە جیاجیاکانیدا. (پوورداود) لە کاری خۆیدا هەر بەوە کۆتایی نەهێناوە کە لە چوارچێوەی زانینەکانی بەر لە ئیسلام، راپۆرتەکەی لەسەر ئاوێستاکەی بە تەوا بزانێت، یان پرسیار دەربارەی شتێك بکاو لەناو راپۆرتەکەیدا بیگوزەرێنێت، بەڵکو بەزۆری لە دیوانەکانی شیعر و نووسینە

جیاجیاکانی فەرهەنگی و مێژوویی دوای ئیسلامیش (بە فراوانتر عەرەبی و فارسیش) بۆ پرسی سەرچاوەی باسەکانی گەڕاوەو بابەتەکەی دەوڵەمەند کردووە. ئەمەش وەڵامدانەوەیەکە بە بیرو زانست و پەروەردەیی لە ماوەی سەدە درێژەکانی بەر لە ئیسلام و پاش ئیسلام ئەوا نەدەرکەوتوون و لەسەریان کارەکەی تەواوکردووە. هەر لەو لایەنەشەوە سەردەمی راپۆرتی ئاوێستای (پووورداود) تەرجوومەی ناوەڕۆکی ئاوێستا نییە کە دەتوانین بلێین ژمارەیەکە لە فەرهەنگنامەی ئێرانی ئەگەرچی هەندێك لە توێژینەوەکانی دوای ئەوەی زانیاری باشتری کەوتووەتە بەردەست جارێکیتر سوودی لێ بینیوون و بۆچوونەکانی لەسەریان بەپێی شوێنەکانیان بۆی داناون.


سەرچاوە

جلیل دوستخواه/ اوستا: کهن ترین سرودها و متنهای ایرانی

جلد اول/ چاپ چهارم 1377، لا49-54

# بەڵگە هێنانەوە لەسەر تەلارسازیی ئاشکانییەکان

دانانی نەخشەو ئامادەکاریی بۆ دروستکردنی بینا لە سەردەمی ئاشکانییەکاندا کارەکان لە بنەمادا وادەگەیەنێت بەپێی نەخشەیەك رۆشتبێت، کە هەموو بەشە ئاساییەکانی گرتبێتەوە کە دەتوانین بەراوردی پێبکەین بە بیناکانیتری سەردەمیی، کە پەیوەندیی مێژوویيان هەیە بۆ ئەو لەیەکچوون و بەراوردکردنە.

پەرستگای ئاناهیتا: لێرەدا دەتوانین سەیری نەخشەی بینای پەرستگای ئاناهیتا بکەین و لە ناویا سەرنج لە گۆشەی باشووری خۆرهەڵاتی بدەین، کە بەشی دەرەوەی گۆشەکە درێژ بووەتەوە تاوەکو گەیشتووە بە چینی یەکەمی بەردینی پلیکانەی لای راستی کە 28 مەترە، هەمان سەیرکردنیش دووبارە دەکەینەوە بۆ گۆشەی باشووری خۆرئاوای، کە دەگاتەوە بە چینی یەکەمی بەردینی پلیکانەی چەپ کە بەهەمان دەستوور 28 مەتر، درێژی پلیکانەکان بە هەموویان واتە ئەوانەی لای راست و چەپ 60 مەترەو بەپێی پێوانەکان بەم شێوەیەن: نێوانیان لە یەکەمین بەردی پلیکانەکەوە تاوەکو دەگاتەوە بە گۆشەی لای چەپ 28+ درێژی پلیکانەی 30+ درێژی هەیوانەکەی بەردەم کۆشکەکە 94+ درێژی پلیکانەی راست 30+ نێوانی گۆشەکە هەتاکو دەگاتەوە بە پلیکانەی لای راست 28 مەترەو کۆی هەموویان (210) مەترە، ئەمە درێژی دیواری کۆڵەکەدار و پلیکانەکانیش لە دوولاوە دەگرێتەوە واتە هەتاکو دیواری باشووری، بەرزی هەر پلیکانەیەکی دیواری کۆڵەکەداریش 14,8 سانتیمەترەو قووڵییەکەی لە نێوان (29-31) سانتیمەترەو دەگۆڕێ، پێشەوەی پلیکانەکانیش درێژییەکانیان لە دوولاوە 4,25 مەترە، و ناو ورگی پلیکانەکانیش بە بەردی سروشتی و گیراوەی گەچ پڕکراونەتەوەو دەرەوەیان بە بەردی چاك کراو داپۆشراون و لێوارەکانیشیان واتە گۆشەکانیان لەسەر ئەندازەیەك نەهاتوونەتەوە، بەڵام ئەوەی لە شوێنەکەدا ماوەوە بەرچاو دەکەوێت بلۆکە گەورەکانە و هەموویان لە نێوان (7-8) ریزن و بەردەکانیان یەکپارچەن و زووتر دانراون یان هەبوون، ئەم پلیکانانە لە رووی پێوانەیانا دەتوانین بەراوردیان بکەین بە پلیکانەکانی (ئاپادانی داریۆش).

پلیکانەکانی ئاپادانە درێژی یەکێکیان 4.50 مەترەو بەرزییەکەشی 12 سانتیمەترەو قوولّیان لە دوو شوێندا لە نێوان (29-31) سانتیمەتردان، واتە لەگەڵ ئەوانی پێشوودا یەکسان دەوەستنەوە.

**ریزکردنی کۆڵەکەکان:** لە گۆشەی باشووری خۆرهەڵات و خۆرئاوایدا لە هەر لایەکیاندا 12 کۆڵەکە هەن کە ماونەتەوە، ئەو بەرزییەش کە لەو کۆڵەکانە ماوەتەوە پێدەچێت بەرزی دیواری کۆڵەکە دارەکان بێت، کە لە هەردوو لاوە درێژبوونەتەوە، دوا کۆڵەکەش کە دەکەوێتە کۆتایی ریزی بەردی پلیکانەکان لە هەیوانەکەوە دەگاتەوە بە ناوەوەی تەلارەکە، لێرەوە لەسەرخۆ بەرزییەکەی هەڵدەکشێ و دەگاتە 32 مەتر، ریزی چینەکان کە تەواون و گەیشتوون هەندێکیان لەوەی دواوەیان بڵندترن و دیوارو کۆڵەکەکانیش تەواوکەری یەکترین و شوێنی خۆیان گرتووە، ئەو بەرزیانەش کە پارێزگاریان لێکراوە وەکو خۆیان ماونەتەوە، لەوانەشە دیواری کۆڵەکە داریشمان بەرچاو بکەوێت دوو بەرامبەر بەرزتر بوو بێت لەوەی دواوەی، پلیکانە دوولایەنەکان لەوانەیە لەگەڵیاندا ریزی کۆڵەکەش هەبوویێت، کە بەردەوامیی داوە بە پلیکانەکان بەشێوەی دوو ئەوەندەو زیاتریش، لەوانەش نین لە دواتردا دروستکرا بن، لە هەردوو لای دیوارەکەدا کە پشتێنەیەکی 18,5 مەتری هەیە، ئەمە کەمترین پاشماوەیەکە کە ماوەتەوە، 11 تاوەکو 12 مەتر گەچیش بەناو لاشەی بەردە بچکۆڵەکان و گەورەکاندا لەو دوو لایەی ئاماژەمان پێدا لە دواوە رۆشتووە لەو هەیوانەی کە دەکەوێتە بەردەم کۆشکەکە، پلیکانەکانی کەوانەیەکی نزمی بەردەو لە خۆرهەڵات و خۆرئاوایدا جێگیر بووە، بۆیە ئەو کۆڵەکانە ئەگەر لاشەی بەردینەکانیان هەڵگرتبن لەو بەرزییەدا دەبێت لەو راستەیەی کە درێژ بووەتەوە هەتاکو ئەو شوێنەی پاشماوەکەی رووخاوە دیوار هەبوویێت، بۆ ئەمەش هاوڕان لە سەری و بڕیاری لێدراوەو لە لێکۆڵینەوەشدا بابەتەکە وادەرئەکەوێت. ریزکردنی کۆڵەکەکان و رێکخستنیان بەهۆی گەچی شلەوە بووە، چونکە گەچەکە بەسەر یەکێك لە کۆڵەکەکانەوە دیارە.

لە بەشی خۆرهەڵاتی شوێنەوارەکەدا بەڵگە هەیە بۆ 24 بازنەی بەردینی کۆڵەکە، لە باکووری خۆرئاواشی دوای رووخاندنی دووکان و باڵەخانەکان چوار کۆڵەکەی بازنەییتر لە قولەکاندا و دوو نیوە کۆڵەکەیتریش دەرکەوتن، کە تووشی زیانی گەورە بوون، لە دیواری کۆڵەکە دارەکانیشدا بەردەکان تا ئەندازەیەك شێوە کەوانەیی بوون، کە لە ناو پاشماوەکەدا بەجێمابوون ئەمانە وادەرئەکەون لە ناوەوە بە کانزای تواوە بەیەکەوە بەسترابنەوە بۆ دانانی دیواری کۆڵەکەکان، بۆیە دیاریکردنی بەرزایی قولەکان گرنگی تایبەتی خۆیان هەبووەو سوودیان لێ بینیوون.

پاشماوەی شوێنەوارەکە: لێرەدا دەتوانین بڵێین دوکانەکان کە بە خشت دروستکراون بەهۆیانەوە بەشی دواوەی پاشماوەی شوێنەوارەکە پارێزراوە، بە مانا شوێنە نزمەکان، بۆ ئەمە (ئاشا فوداژ) هەستاوە بە کۆکردنەوەو ریزکردنی کۆڵەکان، بەڵام شکاوەکانی بەکار نەهێناوە، بۆیە کۆڵەکە شکاوەکان جیاکراونەتەوە، کە لە 20٪ تاوەکو 30٪ی هەموو کۆڵەکەکانی گرتووەتەوە، ئەوانە هەموویان جارێکیتر بە میلی ئاسن چاك کراون و بە یەکیانەوە بەستوونەتەوە بۆ بەکارهێنانەوەیان سەرلەنوێ.

بۆ ئەوەی تەواوکردنی کارەکە کەموکوڕی نەبێت، لە ناوچەیەکی شاخاوی لە رووباری (زۆلە) کارگەیەکی بەرد تاشینیان ئامادەکرد، بۆ بەرهەمهێنانی بەرد بە قەوارەی ئەوانەی لە شوێنەوارەکەدا بەکارهێنراون، بۆ ئەوەی بگوێزرێنەوەو بەکاربهێنرێن، بەو جۆرە لە دوو وەرزی (5) مانگیدا کۆڵەکەکان و بەشەکانیتریان لە تاجی ژێر کۆڵەکەو سەر کۆڵەکە دروستکرانەوەو ئامادەبوون بۆ دانان لەگەڵ دانانی بەردی چینی دیوارەکان، بە هەمان شێوە هەر لەو سەردەمەدا کاری چاککردنەوەی (تاقگرا)ش دەستی پێکردبوو، کە تیایدا بە زۆری بەردی سەرەوەی تاقەنەخشدارەکەی گرتبۆوە، کە بە درێژایی مێژووەکەی کەوتبوونە ژێر خاك، بەڵام دەریانهێنانەوە، بەشێوەیەکی گشتی چاککردنەوەی تاقەکە تاکو ساڵی 1354 درێژەی کێشاو تەواو بوو.

(فلاندن کست) لە ساڵی (1840)دا هاتووەتە دیبەنی شوێنەوارەکەو نەخشەی بۆ داناوە، بەڵام بەشی سەرەوەی تاقەکەی تیادا دەرنەکەوتووە بە مانا تاجەکەی، نەحشەکەش بەشێوەیەکی سانا دروستکراوەو سەربانەکەشی لە دوولاوە بە لێژی هاتووەتەوە کە دیارە، سەرئەنجام شوێنەوارناسانی چاخی بیستەم، لە بناغەوە گومانیان لە ناتەواوی نەخشەکەی هەبووە، بۆیە نەیانتوانی کاری چاککردنەوەی شوێنەوارەکەی لەسەر بکەن بەهۆی ئەوەی نەخشەکە کۆنە نەوەك دووچاری هەڵە بن.

مەشخەڵ و شوێنی پیرۆز: ئەم بینایە لە رۆخی جادەی ئاوریشمی کۆنە و هاوشێوەی تەواوی (قولە)ی (نورئاباد)ە، کە مەشخەڵی رووناککەرەوەی هەبووەو وایان داناوە کە شوێنێکی پیرۆزەو رێگا نیشانی کاروانچییەکان ئەدات، لەکاری هەڵکەندن و پشکنسن و گەڕاندا ئەوەی لە بەرد دەستکەوتووە لە جادەی فەرامۆشکراودا بەشێکیترە لەو بەردانە لە ژێر خاکدا دۆراونەتەوەو دەرهێنراون. بەراوردێك لە نێوان نەخشەی بەدەنی پەرستگای (کەنگاوەر) لەگەڵ پاشماوەی بیناکانیتری هاوتەمەنیدا دەردەکەوێت کە بابەتەکە لە رووی نەخشەسازی و شێوەی

بيناو بەردەكارييەكەی دەچێتەوە سەر بيناى پارتييەكانن چونكە نێوانى كۆڵەكەكان لە ميحوەرێكەوە بۆ ميحوەرێكيتر دياريكراوە، هەروەها كۆڵەكەكانيش لەسەر شێوەيەك هاتوونەتەوەو يەكێكيان پێكهاتووە، لە ژێرەكەی+پايەكەی كۆڵەكەكە+قەدى كۆڵەكەكە+ تاجى كۆڵەكەكە. جوانكارى خوارەوەی كۆڵەكەكەش لە تەختەكەيەوە بووەو هەر لە شوێنەكەيدا بريان دروستكردووەو كۆڵەكەكەش سەرى هەبووە يان جارێكيتر بۆی دروستكراوەتەوە، بەڵام لەو رووەوە هيچ پاشماوەيەك بەدەستەوە نييە، چونكە بەشێكى بە هۆكارى ئاگر لەناوچووەو بەشەكەيتريشى لەلايەن دانيشتوانى ناوچەكەوە بۆ سووتاندن و خۆگەرمكردنەوە لەسەرماى زستان بەكاريان هێناون (بوونى خۆڵەمێش لەكاتى گەڕان و پشكنيندا لەناو بەردەكاندا لەڵگەی سووتاندنى كۆڵەكە دارەكانە) ئەوەی لە زانيارى لەسەر كۆڵەكەكان دەستمان كەوت، دەتوانين بەشى خوارەوەو سەرەوەی بەمجۆرە بەپێی ئەو زانياريانە بە يەكترى بەراورد بكەين و هێڵى گەيشتنيان بە چوار گۆشەيەكى يەكسان و هاوتەريب دابنێين و لەناوياندا وێنەی كۆڵەكەكانيش بكێشين، لە دوا ساڵى چاككردنەوەدا بە (كەنگاوەر) ديمەنەكان لە سنوورى (6) مەتر ديوارى كۆڵەكەدار بوون، كە نوێكرانەوە لە باكوورى خۆرئاواى ئەم بەشەدا دەركەوتن، قەوارەی پايەی كۆڵەكەكانيش لە (130-135) سانتيمەتر گۆڕاوە، ئەم جياوازييەش چەندين هەڵەی هێنايە بەرچاو، ئەوەش بە ئەنجامدانى داپۆشينى ديوارەكان بوو بە بەرد، بەپێی ئەو نەخشەيەی بۆی دانرابوو لە شوێنەكەدا تەواوكرا.

ئەمانە بەگشتى واتە داپۆشينى ديوارەكان بە بەرد جياوازى ئاشكراى هێنايە روو، كە لە ناويا سوود لە بەردى نوێش بينراوە. ئەمەش وايكردووە (ئەندازيار مەهريار لە درێژەی وتووێژەكانيدا بەو سەرسوورمانەی بدوێ كە لە (كەنگاوەر) هاتووتە گۆڕێ، چونكە دانانى نموونەكان بۆ داپۆشينى ديوارە بەردينەكان نادروستە و كارەكان تيايدا پێچەوانە بووەتەوە).

پێوانەی كۆڵەكەكانيش لە شوێنەكەدا بابەتييەو هيچ كام لە نووسينگەكانى بەردكاريى رۆژگارى كلاسيكى ئێران و يۆنان و ميسر بەو شێوەيە بەجێاين نەگەياندووە، لەبەر ئەوەی ئەندازەكان جياوازن و (1-2)ن، قەوارەی پايەی كۆڵەكەكانيش 1,80 مەترەو كەوانەی كۆڵەكەكانيش 1,30 مەترن، لە هەندێك جاريشدا بوونەتە 1,35 مەترەو بەرزييەكانيشيان بە 3 جۆر دابەشن و بەرزى كۆڵەكەكانيش 3,55 مەترن، دروستكردنى ئەمجۆرە كۆڵەكانەش واتە خڕيەكانيان يان خڕەيەكانيان لەسەر پێوانەيەك ديارىى نەكراوە، بەڵام بەو جۆرەی قسەی

لەسەر کراوە ئامانج لەمەدا بۆ بەراوردکاریی بووە، لە پێوانەی بینای نەخشەسازییەکەیدا کە بە یەکترییەوە نزیکبوون، بەو خۆکارە داناناپان بەپێی بڕیارێك بووە لەسەر نەخشەکە کە بۆیان دیاریکردووە لە کۆڵەکە دروستکراوەکانی (پارسیۆن) و (پۆزئیدون) و (دەلفی) و (گرنەك) هەتاکو ئەوانەی تەختی جەمشیدیش هاوشێوەی ئەو جۆرە کۆڵەکە دروستکراوانە نەبووە لە رووی خڕییەکانیانەوە، چونکە بەو شێوەیە دروست نەکراون یان بڕیار لە دروستکردنیان نەدراوە بە مانا ناچنەوە سەر ئەوان.

**سواڵەتی ئاشکانییەکان:** ئەوەی لە سواڵەتی ئاشکانیی و دراو مەسرەجە و نەخش و نیگار و کەرەسەی جوانکردن و ئەسپ سواریی ئەمانە لە سواڵەت دروستکراون و زۆریش دەستکەوتوون، خاوەنەکانیان هیوایان بە دنیای دوای مردن هەبووە، ئەو سواڵەتە دروستکراوانەش لە گۆڕەکانی (سلوکی-پارتی)دا هەن کە گۆڕەکان لە بەرد هەڵکۆڵراون و گۆزەی پڕ شەرابیش لە تەنیشتی مردووەکەوە دانراوە، هەڵبەتە ئەو دیاریانە زۆرن کە لە ناویاندا دراوی پارتی بە ژمارەی زۆر هەیە و بە دەستگەیشتوون، پایەی دیواری کۆڵەکەدار و ژووری دروستکراو بۆ گۆڕ لە سەردەمی پارتیدا هەبووە، بەو جۆرە پەرستگای پیرۆز کە شێوەکەی بازنەیی بووە سروشت ئاسابووە کە دەوڵەمەندی خاوەن باوەڕ ئەوەی لە توانایدا بووە لەو گابەردە پیرۆزەدا شوێنی گۆڕەکەی هەڵکۆڵیووەو لەگەڵیدا شوێنی باڵ و لاقیشیان بۆ دەرهێناوە، گۆڕی دانیشتوانە ناوخۆکەی ئاشکانیی و کەسانی ئاساییش لە (سلوکی) و دەوروبەریان لە بەرزاییەکانی باکووری پەرستگای ئاناهیتابوون و شوێنەکەش بووەتە سەرچاوەی لێکۆڵینەوەو بڕیار لە سەردان، ئەو بەرزاییەش خاکی خاوەن گۆڕەکانە، کاتێکیش گۆڕەکە دەکەیتەوە مردووەکە قاچی لێ راکێشاوە، ئەمە نیشانیدەدات کە (کنکوبار) شارێکی پیرۆزو پڕ بایەخ بووەو لە کۆمەڵگای سلوکی و پارتیدا و لەناو مەرکەزەکەیدا سوڵتەو دەسەڵاتیش هەبووە.

پێشتریش دراوی ئاشکانی لە (کەنگاوەر)دا لێدراوەو لە (هەمەدان)یش کە نیشانەو هێمای دراو خانەی ئەوێی بەسەرەوەیە، بە مانا لە هەردوو شارەکەدا هەبووەو خاوەنی بوون، ئاسەوارێکیتر، کە لە سەردەمی سلوکیدا هەبووە قاچێکی دروستکراوە لە بەردی مەڕ مەڕ لە گۆڕستانی (تەپە) لەگەڵ ئەسپ و ماینی یۆنانی لە کاری کنەو پشکنیندا دۆزراونەتەوەو لەگەڵیانا لۆکەی (یۆنانی-سلوکی)ش هەبووەو لە (کەنگاوەر)یش ئەوە سەلمێنراوە، دانانی کوپەی شەرابیش لە گۆڕدا هاوشێوەی لە (تاق بستان)یش هەبووە کە لە ساڵی (1348) داوێنەکەی لەسەر سواڵەت دۆزراوەتەوەو بووەتە سەرچاوەی بلوبڕیاردان لەسەری و ناوچەیەکی

فراوانی گرتبۆوە، هەروەها گۆزەی شەرابی ئاشکانیش لە گۆڕەکاندا هاوشێوەی لە (هەمەدان)یش دەرکوتووەو وێنەی دراوی بەجێهێڵراوی ژێر سەری مردووەکانیش بەشێکە لەو دیارییانەی ناو گۆڕ کە لە بەردەمی مردووەکەیان لەدەستیدا لەکاتی خستنە ناو گۆڕەکەوە دایانناوە، وێنەکانیش کە تایبەتن بە مرۆڤی هێلینستی ئەوە دەگەیەنن پارتییەکان لە یۆنانییەکانیان وەرگرتووە، تاوەکو مردووەکە لە سەفەری نووسینیدا بۆ دنیای دووەم، بتوانێت پاداشت بە پاسەوانی دۆزەخ (فریشتەی مردن) بدات بۆ ئەوەی ژیانی گران و ناخۆش بەسەر نەباو جێگایەکی باشی هەبێت تا ئەو رۆژەی پرسیاری لێدەکرێت.

**نزاو پەرستگای ئاگری ساسانی:** بەڵگەکانی بیناسازی واتە بینای سەکۆی بڵند تیایدا هیچ جۆرە ئاسەوارێکی رۆژگاری ساسانی دەرنەکەوتووە مەگەر (قولە) ناوی هابێت، کە بەشێکی لە کۆتایی کاری هەڵکۆڵینەکەدا لەبەردەستدایە و لەو ماوەیەدا کە دەرکەوت، هەر ئەوەش بووە پاشماوەیەکی دیاریکراو و بڕیارلێدراو، بەڵام ئەوەی لەو ناوەندەوە وەردەگیرێت ئەوەیە لە کۆتایی هاخامەنشیدا و دوای ئەوانیش بە مانا لای پارتییەکان بینای سەرگیراوی بچکۆڵە لە شوێنی وەجاخی ئاگر بە رەسمی بە ناوی پەرستگای ئاناهیتا هەبووە یان دروستکراوە کە ساسانییەکان ئەوەیان رووخاندووەو لە شوێنی چوار تاقێك (پەرستگای ئاگر) یان دروستکردووە، ئەم پەرستگای ئاگرە یان چوار تاقە ماوەتەوەو بەردەوامی هەبووە هەتاکو ساڵێ 21ی کۆچی کە بەدەستی ئەعرابە موسوڵمانەکان رووخێنراوە هەر لەو رۆژگارەشدا واتە لە سەردەمی پارتییەکاندا جگە لە پەرستگای ئاگر (قوڵە) کە سیفەتی پیرۆزی هەیووە رێزی بۆ (ئاناهیتا) و سەرچاوەکانی ئاو هەبووە، بینای ئەو جێگایەش مەزەبی بووە واتە کەسایەتی خۆی هەبووە، کە هەرگیز لەژێر کاریگەرێتی پایەبەرزی و گەورەییدا بۆ روپاماڵی و دنیایی نەهاتووەتە روو.

پادشاکانی ساسانیش بە درێژایی ماوەی فەرمانڕەواکانیان لە رۆژگاری پیرۆزیاندا دوور نەبوون لەو پەرستگایانە و لە رێیاندا ئاگاداری ئایینەکە بوون و رەغبەتیان لێی هەبووەو سوودیان لێ بینیوە، هەم خوا بانوی (ئاناهیتا)ش لە رۆژگارەکەدا گەیشتووەتە باڵاترین پلەو لەگەڵیدا پەرستنی ئاگریش کە ئایینی رەسمی پادشاکانی ساسانی بوو، بڕیاری لەسەر دراوە بەهۆی ئەوەی بەپێی نووسینی (کەرتیر) کە لەسەر کەعبەی زەردەشتی هەڵکۆڵراوە، بە گەشتی پەرستگاکان و قەوارەکانیان کە بۆ بەر لە خۆیان دەگەڕێنەوە، وێرانکراون و لە شوێنیان پەرستگای ئاگریان دروستکردووەتەوە، لە ئێران جگە لە پەرستگای (شامی) ماڵی میر، لە

ئۆدیسەی نەهاتوەندیش بەشێوەیەکی پەرتبووش لە (شووش) تەنیا بۆ پەرستن پەیکەری ئایینی لە شوێنی دانراوە، ئەوەش بەهۆکاری بت شکاندن بووەو زەردەشتییەکان لە سەردەمی ساسانیدا بەهێز کردوویانە، بەهەرحاڵ وێنەکانی پشت و رووی دراوەکان و نەخشە بەرجەستەکراوەکان لە گابەردەکاندا نیشانیدەدات چ لە سەردەمی ئاشکانی بێت یان ساسانی شوێنەکە چیرۆکی کاریگەرییان لەسەر یەزدان لە هونەری یۆنانیدا بۆ ماوەتەوە کە لەو سەردەمەدا هەبووە، ئەو کاریگەرییەش لە هونەری هاخامەنشیشدا سەرچاوەی هەڵگرتووە.

پێوانە لە نێوان بەردەکانی (تاق بستان) و کۆشکی خەسرەوی پەروێز لە بێستوون بە بەراوردکردنیان بە بەردەکانی (کەنگاوەر) دەرئەکەوێت لە نێوانیانا هیچ پەیوەندییەك نییە. بەر لە نووسینی ئەم بابەتە دوو کارمەندی شوێنەوارناس لەگەڵ ئەندازیارێك، بێ بەڵگەو بە پێچەوانەی واقیعەکە لەسەر مێژووی بینای کەنگاوەریان نووسیوە، بەو جۆرە کە پەرستگا نییە، بەڵکو کۆشکی خەسرەوی پەروێز بووە؟ (590-628ز) خاڵی پرسیارەکە ئەوە دەگەیەنێت، ئەگەر بەردی بیناکە لە رۆژگاری خەسرەوی پەروێزدا توانرابێت دانرابێت، لەژێر کاریگەریی هونەری یۆنانی یان میدی یان هاخامەنشی بووایە گیای پیرۆزیش لەسەر بەردەکان دەبوایە هەڵبکۆڵرایەو (ئینود بانوی ئاناهیتا) و ئاهورامزداو پادشا بە شێوەیەکی بەرجەستەکراو لەسەر چوارگۆشەکان هاوشێوە کۆشکی بێستوون لە (تاق بستان) بۆ سەر بەردەکان بگوێزرانایەوەو دەربکەوتنایە، ئەگەر بەو جۆرە نەبێت، ئەی چۆن و بۆچی هەروا بە خەیاڵ کۆشکی خەسرەوی پەروێز لە کەنگاوەر بە سکاری و بەبێ هیچ جۆرە نەخش و نیگارێك بەردەکانی بەو شێوە ساکارە بهێننەوە؟

کارکردن بۆ دروستکردنی کۆشك یان گۆڕ و پەرستگا، دەبوایە بۆ هەر یەکێکیان بە جیا بکرانایە، کە دەیتوانی ئەو گۆڕانکارییانە لەو سۆنگەیەوە کارەکان لە دروستکردنی بیناکەدا رێکبخات و واقیعی بیناکەش پەی پێبەرێت، هەر ئەوەش بە بیناکەوە دیارە، کە پەرستگایە چونکە هیچ شێوەیەکی جوانکاریی پێوە دیار نییە.

بەردەکان و کۆڵەکەکانی بە گەورەیی و جیاواز لەوانیتر دانراون، بێ ئەوەی کاری جوانکارییان لەسەر کرابن، هەروەها دوریشن لە ئارایشتی (کۆرەنتی) یان (ئایۆنی) یان (دوری) هەموو ئەو ساکاریانەش کە هەن بۆ ئەوە بووە بیناساز ئەزیەتی بە خۆی نەداوە، خۆ ئەگەر کارەکەی پێچەوانە بووایە بەرد کاری بیناکە دەگۆڕاو بینای دنیایی شوێنی ئایینی

دەگرتەوە، بەشەکان و شێوەی کۆڵەکە دروستکراوەکانیش ناچنەوە سەر کۆڵەکەکانی بینای (پارشنیون) کە بە جوانی دەرکەوتوون، بەرزی کۆڵەکەکان و تیرەکانیان خاوەنی پێوانەیەکی دیاریکراون و لەسەر شێوەیەکیش نەهاتوونەتەوە، تیرەی کۆڵەکەکانیش لەسەرەوە بۆ خوارەوە هاوشێوەن، بەڵام بیناساز و بەردسازیی (کەنگاوەر)یش تەواو شارەزاو ئاشنای ڕێکخستنیان و دروستکردنیان بوون و لەسەرخۆ و بەجوانی ژیانیان بە بەشەکان و توخمەکانیان بەخشیوەو لەسەر بنەمای دروستکردنی کلاسیکی یۆنانی لە کارەکانیاندا دوورکەوتوونەتەوەو لە بەرگێکی نوێدا هێناویانەتە بەرهەم، کە تازەگەرێتی پێوە دیارەو لە قاڵبێکی ئارییاییدا بەرهەم هاتووە، لەو شێوەیەدا داپۆشینی دیواری بەردەکان هاوشێوەن و شوێنی خۆیان لەناو ئەو قەڵەمڕەوە کلاسیکییەدا گرتووەو داڕێژراون، بەڵام لەژێر هیچ ناونیشانێکدا ناتوانین دیواری بەردی چوار ڕووی کۆڵەکەدار و بەشەکانیتری لە کۆڵەکەکانی دواوەو پشتێنەو جوانکارییەکانی بە بینای کەنگاوەر (پەرستگای ئاناهیتا) بەراورد بکەین، چونکە تاجی کۆڵەکەکانی پڕ لە نەخش و نیگارن لەگەڵ توخمەکانیتری لە شێوەی چوار پاڵو واتە چوار ڕووە داڕێژراوەکانی کە بەشی خۆرهەڵاتی کۆشکی خەسرەوی دووەمی لە بێستوون گرتووەتەوە، گەورەیی ئەم سەرکۆڵەکانە لە قەوارەی بەردەکانیاندایە، کە لە چوارچێوەیەکدا نەخشێنراون تایبەتن بە خوا (ئاناهیتا) و خەسرەوی پەروێز و ژنەکانی هەموو ئەوانەش دیارن و بەشەکانی کۆڵەکەکانیش تایبەتن بە کۆشکی خەسرەوی پەروێز لە بێستوون، ئەگەرچی شوێنەکەی کەناری (تاق بستان)ی بیناسازی بەردەکانی کە نەیانتوانیوە توخمەکانی یەکبخەن، ئەم دیمەنەی کۆشکی پادشایانە بخەرە بەرچاوت، بەشەکان و تیرەی سەری کۆڵەکەکان دەردەکەون، کە هیچ شێوەیەك سوود لە هەموو ئەو نەخش و نیگارەی کۆشکی خەسرەوی پەروێز وەرنەگیراوەو بەراورد ناکرێن، ئەم بەردکاری و بیناسازییەی ئێرەش سەر بە نووسینگەیەکیترەو لقێکی هاوشێوەی بیناکانی بەردینی (بابل) و (باختەر)ە، جگە لەو شوێنە دیاریکراوەنەیتریش لە دەریای سپی ناوەڕاست لە تەختی جەمشید کە لەو مەقامەدان دەتوانین پێوانەیان بە یەکتری بکەین.

باشی دانانی کۆمەڵە دیواری کۆمەڵە داری پەرستگای ئاناهیتا کە بە شێوە زنجیرێك بەردەکانی بە یەکترەوە بەستوونەتەوە، ئەگەر بە وشکە کەڵەك دانرابن، یان دۆخاوی گەچ کرابێتە نێوانی چینی بەردەکانەوە، کە بوونەتە پارچەیەك و نیشانەیەکی بەرچاون، بە سەیرکردنیان دەردەکەوێت کە بینایەکی تۆکمەی داڕێژراوی کلاسیکییە بە هیچ شێوەیەك ناتوانین بڵێین ئەم دیوارە بەردانە لە

کۆمەڵەی دیوارە بەردە جوانەکانی پادشاکانی راوشکاری جەرگەی تاق بستان و نەخش و نیگاری سەمای خاسیەکانیەتی لە ئاوەدانی و بەردەوامی ئاهەنگییەتی و دانانی بەردەکانیشی لەسەر شێوەی دانانی بەردەکانی هیند شێوەی خۆی وەرگرتووە، بەو پێیە دەتوانین بڵێین شوێنی دیمەنەکەمان واتە پەرستگای ئاناهیتا لە ناوچەی مادی گەورەدایە کە بە درێژایی مێژوو خاوەن پێگەیەکی سیاسی ئابووری کۆمەڵایەتی و مەزەبی بووە.

**وەسفی بینای کەنگاوەر لەلایەن مێژوونووسانی نوێوە:**

ئەگەر وادابنێین و بڕیاربدەین بینای کەنگاوەر، پاشماوەی کۆشکی خەسرەوی پەروێز بێت، ئەوە هەروەکو لە نووسینی هەندێك لە جوگرافی نوسانی نوێ و فارسی باسی هاتووە، ئەو رایە پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە بەو شێوەیەی کۆشکی ناوبراو چۆن و بە چ شێوەیەك ئەو سیفەتەی پێدراوە؟ بێ ئەوەی کاری هەڵکۆڵین و پشکنینی تیادا کرابێت، چونکە مێژوونووسانی نوێ و فارسی بە گەڕانیان بە ناویا کە وەسفی کۆڵەکەکانیان لە وێرانەکەدا کردووە نەیانتوانیوە لە شوێنی خۆیدا بوونی کۆشکی خەسرەوی پەروێز بسەڵمێنن یان دەریبخەن کە هەیە، ناسینی وێرانەکەش بە لێکۆڵینەوە دەبێت، نەوەك بۆ چەسپاندنی رایەکەمان پەنابەرینە بەر دوو شوورای کۆڵەکەدارو بێ کۆڵەکە کە باڵەکانی 220*210 مەترن و شورای کۆڵەکە دارەکەی ناوەوەش 94*9.32 مەترن، سەکۆی چوار رووش کە لاشەکەی بە بەردو گەچ کراوە لەگەڵ ئەوانیتردا رووبەرەکەیان دەگاتە 4.7 هەکتار و ئەو شێوەیەی پێبەخشیووە.

**دروستکردنی کۆشکەکە:**

1- بۆ ئەم ناسینە بە نەخێر وەڵام ئەدەینەوە، چونکە لە نێوان دوو سوورای پڕکراوە بە گڵ تاوەکو ئەو شێوەیەی ویستوویانە کردوویانە و بڵندیان کردووەتەوە. دوای گەڕان لە سنووری ئەو دوو شوورایەدا دەرکەوت تەنیا هەر ئەوەندە بەس نییە، بۆ دروستکردنی کۆشکێك، بەدرێژایی مێژووش هیچ بینایەك لەو خاکەدا دەرنەکەوتووە، کە ئەنجامی نشووستی بەسەرهاتبێ و پاشماوەکەی شوێنەواری نەمابێت.

2- لەوانەیە بڵێین کۆشکی وەسفکراو سەکۆی چوار رووی لە ناوەوە بۆ کرابێت، کە لەم شێوەیەیدا ئەندازەکەی (94*9.32) مەترەو ژێرەوەیان بۆ سازاندبێت،

بەڵام کۆشك و هەیوانی خەسرەوی پەروێز شوێنی گونجاوی نەبووەو ئەوەی لە هەڵکەندنیش لەبەردەستدایە هەتاکو پارچەیەکی بچکۆڵەش لە سواڵەت کە لە کۆشکەکەدا دەرهێنرابێت و بۆ سەردەمی ساسانی بگەڕێتەوە بەدەست نەگەیشتووە.

3- ئەگەر بڵێین ئەو کۆشکە و سەکۆی ناوەکەی قولەیەك بێت کە بەرزییەکەی 32 مەترەو دروستکراوە، وادایدەنێین کە کۆشکێك بێت لە بینایەکی بچکۆڵە دادەرهێنرابێت ئەمەش ژیری و مەنتیق وەریناگرێت. بەپێی مەنتیق پاشماوەی هەر جۆرە کۆشکێك دەبێت دوای وێرانبوونی بمێنێ، خۆ ئەگەر بە ئاگر سووتابێت یان بوومەلەرزە ئەگەر توانیبێتی پارچەکانی بەلایەکدا بردبێت، دەبێت بەشەکان و تۆخمەکانی پەیوەستبن بە بیناسازی کۆشکی پادشاکان، بەڵام لەم گەڕانەماندا بە دوایانانا بەدەست نەگەیشتوون جگە لە پارچە بەردی بچووك کە لە بیناکانی سەردەمی ئیسلامیدا بەکارهێنراون و پەیوەستن بە بلۆکە بەردینەکانی پلیکانە دوولایەنەکانی باشووری. هەڵبەتە ئەو پارچە بچکۆلانە ئەگەر هەبوونایە لە بەرژەوەندی دروستکردنی کۆشکەکە دەبوو، خۆ ئەگەر جیاجیاش بڵاوبوونایە یان لەو شوێنانەدا بوونایە کە لە خشت و گڵن دەبوونە سەرچاوە بۆ لێکۆڵینەوەو بڕیار لەسەر وەرگرتنیان، بەو پێیە ئەوەی لەبەر دەستدایە دەتوانین دایبنێین کە قوڵەیەکی 32 مەتری شێوە سیفەتی سەردەمی ماد یان هاخامەنشی شێوە وەجاخە و هەر ئەوەش لە سەردەمی سلوکی و پارتیشدا پەرستگا بووەو لە سەردەمی ساسانیشدا لە شوێنی پەرستگای ئاگر بەشێوەی چوار قاپی بیناکراوە، خوالێخۆشبوو (لۆکۆنین) زانای رووسی لە دانیشتنی شەرو و رۆژێکی خۆی لە (کەنگاوەر)داو جارێکیتر لە نووسینێکیدا بە هیچ شێوەیەك نەیووتووە، کە ئەم بینایە وێرانەکانی کۆشکی خەسرەوی پەروێز بێت، بەڵکو بە ئاشکرا لە نووسینەکەیدا نیشانیداوە بە پێچەوانەی ئەوەی کە بینای پەرستگای ئاناهیتا بەپێی ناوەکەی و لاشە بەردینەکەی ناوی پیرۆزی لەسەر هەڵکۆڵراوە، کە بە شێوەی (پیر) هاتووەو پەیوەستە بە کۆتایی سەردەمی ساسانی و رۆژگاری خەسرەوی پەروێز.

ئەم زانا رووسییە بە ئەندازەی دۆستێك یان حەق ناسێك ئەوەی لە دەستیدا بووە چەند وێنەیەك بووە لە کاری هەڵکۆڵینی چەند جارێك دەستیکەوتوون، سوپاسی خۆی بۆ گەورەیی و ماچکردنی وێنەکانیش دەرخستووە کە لە راستیدا هۆکارن بۆ رێزلێنانمان بۆی.

ئەو لەو سەردەمەدا سەرۆکی بەشی دراوی ساسانی بووە لە مۆزەخانەی ئارمیتاجی لینینگراد و نووسینەکانی سەر دراوی ساسانی خوێندووەتەوە،

بەڵام لە خوێندنەوەی ئەو نووسینەدا پسپۆڕ نەبووە، یادی ڕێزلێنان و ڕێزگرتنی لامان دەمێنێتەوە بۆ ئەم زانا مردووە کە بنیاتنەری ڕادەربڕین بوو بەجێیهێشتین.

پرۆفیسۆر (گیردگرووپ) مامۆستای نووسینی ساسانی لە دانشگای هامبۆرگ و پسپۆڕ لە نووسینی ئەم سەردەمە. لەوەوبەر بەردە نووسراوەکەی پەهلەوی ساسانی شاپووری دووەم بەناوی (ئارەزنەرسە) لە (مشکێن شار) ساڵی 1345 دۆزرابۆوە خۆی خوێندییەوە، دوای ئەو خوالێخۆشبوو (هەنینگ) جارێکیتر خوێندییەوە، دوای ئەوەش هەستا بەردەنووسراوەکەی لە پێرستی نووسراوەکانی جیهانیدا تۆمارکردو ژمارە (452)ی پێدرا، لەوەش زیاتر شتێك نەبوو لە نووسینەکەدا بۆیان دەربکەوێت. هەرچۆنێك بێت ئەو نووسینانە بە تەنیا بن یان ناوی تەواو بن یان بە بچکۆڵە کراوەیی واتە پادشای پیرۆز (485-459ز) بخەنە پاڵی، کە بە دوایدا دۆزینەوەی مۆری گڵێنەیی لە کەنگاوەر وێنە و دیمەنەکانی بۆ خوێندنەوەو لێکۆڵینەوە پەیوەستە بە پادشای پیرۆز بۆ وەڵامی ئەمە لە ساڵی 1992ی زایینی لە نامەیەکی بە وێنەوە سەرنجی خۆی نارد. بەپێی ئەوانەی لەبەردەستدان لە هەڵکۆڵینەکانی (کەنگاوەر)دا بەڵگە بەدەستەوە نییە، کە بینای (کەنگاوەر) کۆشکێك بێت پەیوەست بێت بە خەسرەوی پەرویز، بەڵام بەڵگەی زۆر هەیە بۆ نەبوونی کۆشکی خەیاڵاوی یان کۆشکی وەسفکراوی حوکم لە سەردان، کە لەوەوبەر لە لاپەڕەکاندا باسی هاتووە، کە بۆ ئەو بگەڕێتەوە. لە کۆتاییدا ئەوەی بەزۆری لای مێژوونووسانی نویّ و فارسیش هەیە نووسینەکەی (بێستوون)ە کە دەیخەنە پاڵ فەرهاد و کۆشکەکەشی بۆ شیرین دەگێڕنەوە کە لە پێشووتردا نیشانماندا، کە بابەتێکی ڕۆمانسییە نەوەك حەقیقەت بێت.

**بەڵگە سەلمێنەرەکانی بوونی پەرستگای ئاناهیتا لە کەنگاوەر:**

1- لەژێر قولەکەدا دیمەنی کانییەك هەیە، بە چواردەوریا دەگاتە (8) هەزار مەتری چوارگۆشەی ئاو لە ئەستێرکێك وەردەگرێت.

2- وێرانەکانی لە ئەنجامی ئاگر و سووتاندنی لە دوو توێژاڵی پشتێنەیی، کە دەکەونە پشتی دیواری کۆڵکەداری خۆرهەڵات بە ئاشکرا پێوەیان دیارە کە سووتاون و وێنەکانیان لەبەردەستدان. ئەمەش کۆنترین سووتاندنە کە پەیوەستە بە سەرەتای ڕۆژگاری ساسانی و بۆ دووەمجاریش لە ساڵی 21ی کۆچی کە ڕوویداوە، بە مانا لە هێرشی مسوڵمانەکاندا ڕوویداوە.

له نێوان ئەم دوو سووتاندنەدا چاککردنەوەی پەرستگای ئاناهیتا ئەنجامگیر بووەو پەیوەستبووە بە ڕۆژگاری پادشای پیرۆز (485-459ز) پادشای ساسانی.

3- لە دروستکردنی کۆشکەکەدا بیر لەوە نەکراوەتەوە، واز لە دروستکردنەکە بهێنرێت لە بەردانانی لاشە بەردینە گەورەکە لەلایەك و پڕکردنەوەی ناوەکەی لەلایەکیتر و دروستکردنی پایەی دیوارەکانی کە هێماو نیشانەن بۆی و نووسینەکانیشی کروتکراوەی ناوەکەن یان ناوی تەواون بەو جۆرەی کە ناوی (ئامشاسپەندانی هاوشێوەی (شتریۆر) هەڵکۆڵرابێت؟ هاوشێوەی بەشێك لەم نووسینانە و هێماکانیان لە پاشماوەی بەردەتاشراوە لەتبووەکانی کۆشکی خەسرەوی دووەم لە (بێستوون)یش هەڵکۆڵراون و دەرکەوتوون، وێنەی کۆشکەکەش بەرد لاشەکەی و دیوارەکانی بە نهێنی نەهێشتووەتەوە.

4- تەلاری سەد کۆڵەکە و گەنجینەی تەختی جەمشید و پاسارگاد و نەخشی ڕۆستەم و تەختنشینی فەیرۆز ئاباد، تەواوی هێما کۆکراوەکانیان لە کتێبی پەرستگای (ئاناهیتا)دا دانەر وێنەکانیانی داناوە. ئەو هێمایانە لە ڕووی بەردەتاشراوەکان و بیرازکراوەکانی (تەلاری گەنجینە و سەد کۆڵەکە) هەڵکۆڵراون کە دەتوانرێت بەپێی جیاوازیی ئاشکرای هەڵکۆڵینی ئەو هێمایانە لە نێوان بینای دنیایی و دنیای کۆتایی ببینرێن و لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکرێ.

سەردەمی هاخامەنشی: بەو جۆرە بەپێی تیۆری (تیلیا) و (گوسمان)ی و (هانسمەن) کە ئەو دووانەی دوایی پسپۆڕ بوون لە نووسینی (لیدی)، هەروەها (ئەرنج ئەشمیت) تەواوی هێماکانی لە هەر (3) شوێنەکەی (پاسارگاد-تالار) و گەنجینە و سەد کۆڵەکەی تەختی جەمشید، نووسینە تاکەکانی ناوی کە لە ڕووی بەردی لاشەکان لە (کەنگاوەر) هەڵکۆڵراون، پەیوەستن بە دیاری پیاوچاکان و خاوەن باوەڕەکان لەکاتی هیتنیاندا، چاککردنەوەو هەڵچنینی ئەم بینا مەزهەبییەش پەردە پۆشکراوەو ئەو وێنەیە ئەمڕۆش لە نێوان خەڵکی خاوەن باوەڕو باوەڕدارانی مەزهەبی تەواودا لەناو مزگەوتەکان و گۆڕی ئیماندارانی پاکیشدا هەیە و سوودیان لەو بینا گشتیانەش دیوەو بە پارە یان بە پیاویش کۆمەکیان کردوون.

5- بوونی گۆڕی بەردین، یان تابووتی گڵێنەیی یان گۆڕی کووپەی شەراب، ئەمانە یان لە ڕووی بەرد دەرهێنراون یان شووڕای خۆرهەڵاتی پەرستگای (ناهید) یان گرتووەو بۆ سەردەمەکانی (مادی-هاخامەنشی-پارتی) دەگەڕێنەوەو پەیوەستن بە پەرستنی خاك لای نزاکەران. باوەڕدارە بە تواناکانیش لە ناوەڕاستی پەرستگا پیرۆزەکەدا شوێنیان بۆ داناون (بە مانا شوێن بۆ گۆڕ) جگە لەمانەش لە خۆرهەڵاتی

بەرزاییەکانی باکووری (کەنگاوەر)یش کە هەکتاری زۆری گرتووەتەوە، شوێنەکە تایبەتە بە گۆڕستانی یۆنانییەکان و یەهودییەکان و ئاشکانییەکان، بۆ کاری کنەو پشکنین ئەندامانی دەزگای (کەنگاوەر)یش لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا کاری گەڕان و هەڵکەندنیان تیایدا کرد. دوای ئەسکەندەرییە، کەنگاوەریش بووەتە شاری سلوکییەکان لە رۆژگاری حکومەتی هاوبەشدا لەگەڵ پارتییەکاندا بەتایبەت، کە لە (نەهاوەند) ئانتیۆگۆسی سێیەم پەرستگایەکی بۆ خۆشکی خۆی (لائودیکە) بیناکرد. ئاسەوارێك کە لە گۆڕەکانی ئەم تەپەیەدا دۆزراونەتەوە بوونی سلوکییەکان بەڵگەی لەبەرچاون. ئەوەش بە دۆزینەوەی قاچێکی مەڕ مەڕ کە بە جوانی تاشراوەو بەشەکانی و پەنجەکانی بە جوانی دەرهێنراون، ئەمەش بەڵگەیە بۆ هونەری بەردتاشینی سلوکی و یۆنانی، ئەو پاشماوەیەش دەیسەلمێنێ کە لایەنی ماناو ناوەڕۆکی هەیە، کە لە گۆڕەکەدا بەجێهێڵراوەو ساڵی 1352 دۆزرایەوە.

شوێن و مێژووی کۆنی کەنگاوەر: کەنگاوەر لە هەزارەی پێنجەمی پێش زایین لە جوگرافیای کۆنی مێژووی ناوچەکەدا ئەمینداری فەرهەنگی و شارستانێتی نووسراوی بەدوای خۆیاهێناوە.

1- نزیك بە گوندی (سەگابی) یەکەمین شوێنەواری گوندی سەدەی بەردینی نوێ دۆزرایەوە، کە بۆ هەزارەی پێنجەمی پێش زایین دەگەڕێتەوەو تیایدا کاری گەڕان و پشکنین لەلایەن شوێنەوارناسی کەنەدییەوە کراوەو ئەنجامەکەشی بڵاوکراوەتەوە.

2- چینەکانی ژێرەوە یان سەرەوە کە بەدوای یەکتریا هاتوون فەرهەنگ و شارستانێتی کۆنن، کە بەردەوام لە گودین تەپەی کەنگاوەر هەبووە، هەتاکو بەر لە سەرهەڵدانی نووسینی ئیلامیش یان سەردەمی شارنشینی کە ماوەتەوە، دوای ئەوەش چینەکانی ژێرەوەو سەرەوەی (گودین تەپە) لەگەڵ تەلاری (36) کۆڵەکەی مادەکان لەژێر خاك هاتوونەتەدەر، کە نەخشەی ئەمەی دوایی چوار گۆشەیەو ئەو پشکنینەش لە رێگای دەزگایەکیتری کەنەدییەوە کراوەو ئەنجامەکەی بڵاوکراوەتەوە.

3- ئەوەی لە مێژووی سەردەمی ماد رۆشتووە، لە بەشی سەرەوەی چینی (گودین تەپە)دا دەرکەوتووە کە لەناویا شارستانیەت و فەهەنگی هاخامەنشیش دێت، بەهۆی ئەوەی لە ناوچەکەدا تەپەکە شوێنی عیبادەت بووە، کەناگاوەریش بەپێی تاقیکردنەوەکان لەسەر خاکەکەی و دۆزینەوەی سواڵەت و شووشە و مەعدەن دیاردە شارستانییەتەکەی لە چاخی پێنجەمی پێش زایین چووەتە ناو مێژووی فەرهەنگی ناوچەکەوە. گەیشتن بەو ئەنجامە لەلایەن سەرۆکی دەزگای ژاپۆنییەوە بووە،

بەهۆی ئەوەی پرۆفیسۆر (سۆز و مۆنیشیمۆرا) لە کۆنگرەی شەشەمی کۆنینەناسی و هونەری ئێران لە ئۆکسفۆردی ئینگلیستان ساڵی 1971ی زایینی کە سەرپەرشتی کاری دەزگاکەی کردووە، بۆ ئەوەی قسەی لەسەر بکات.

سەرچاوە

سیف الله کامبخش/ اپار تاریخی ایران

چاپ اول 1380، لا167-216

# پەرستگای ئاناهیتا و شێوازی بیناسازییەکەی

ئەگەر بەشێوەیەکی سەر پێیی گوزەرێك بکەین بە کۆمەڵگا پەرت و بڵاو و بچووکە کۆن و دێرینەکاندا، لە بواری ئەو ئایینانەوە کە برەویان هەبووە لەسەر زەویدا، زۆر بە کەمی پەرستگاو پەیکەری خڕو سێ لایی خواکانمان بەرچاو دەکەوێ، ئەوەی دەکەونە بەرچاو، تەنیا پەیکەری لە قوڕ دروستکراون، لە پێکهاتەی ئاژەڵ و خواوەندانی جوانی و زاوزێدا. شێوازی ئەم هونەرە لە ئەنجامی بیرکردنەوەی گوێ ئاگردانی ژنە گوندنشینەکانەوە بووە لە سەرەتای سەردەمانی بەردینی نوێ بە دواوە.

لە سەردەمانی دروستکردنی شار و سەرەتای پەیدابوونی نووسین و نەخش و نیگار، سێ هەزار ساڵ پێش پەیدا بوونی عیسا، لە رێگەی باشووری ئێران لەگەڵ نیشتەجێبوونی (ئیلامییەکان) لە دەشتی خوزستان و بڵاوبوونەوەی ئەم فەرهەنگ و کەلتوورە لە بباشووری رۆژهەڵات و خۆرئاوای ئێران، دروستکردنی پەیکەری عەشتار و خواکانیتر لە قوڕ و بەردو برونز و بە قەوارەی گەورەو بچووك هاتە ئاراوەو دانیشتوانی بناری شاخەکانی زاگرۆس دەستیان کرد بە دروستکردنی پەیکەری جۆراوجۆر لە بەردو لە ناوچەی (شەهداد) بە قەوارەی پەنجا تا شەست سەنتی مەتر پەیکەری لە قوڕی سوورەکراو دۆزراوەتەوە. ئەم پەیکەرە لە قوڕ دروستکراوانە، کە وەك ئاماژەیەك بۆ خوا پەرستی هەردوو دەستی گرتووە بە سنگیانەوە، لەبارەی شێوازو ناوەڕۆکەوە زۆر هاوشێوەی یەکن.

لە هەزارەی سێهەمی پێش عیساوە، سەرەتا لە (بوشەهر) پەرستگای (هومبان نومن)ی ئیلامی دروست کرا، پاش ئەوە لە دەشتی خوزستان و شوش و چغار زەنبیل و حەوت تەپە، دەستکرا بە دروستکردنی پەرستگا بۆ شاکان و خواوەندان وەك ئاهار، کیریرش، گال و نهونتە، پەیکەری ئەم خوایانی ئیلامییە، هەندێکیان بە قەوارەی ئاسایی لە بەردو برونز دروست دەکران و لە پەرستگاکاندا دادەنران. شارەکانی سۆمەر و بابل لە وڵاتی نێوان دوو رووبار و لە میسرو وڵاتانی کەناری دەریای سپی و یۆنان، چەندین پەرستگای خوایانی جۆراوجۆریان تێدابووە.

له نیوەی هەزارەی دووەمی پێش عیساوە و لەگەڵ هاتنی بەرەبەرەی ئێرانییەکان لە باکووری رۆژهەڵات و باکووری رۆژئاوای ئێرانەوە، پەیکەری خڕو سێ لایی گەورەی خواکان، شوێنی خۆیان چۆڵ کرد بۆ چەندەها جۆری جیاجیاو بچووك لە پەیکەری دروستکراو لە قوڕی سوورەوەکراو و برۆنزی ئاژەڵی ماڵی، مرۆڤی نێرو مێ، گیان لەبەری دڕندەو خەیاڵی، جوانترین ئەم پەیکەرانە لە بنارەکانی کێوەکان لە (ئەملەش و مارلیك) و ئازربایجان و کوردستان لە قوڕی سوورەوەکراو و برۆنز، لە لوڕستان و کەناری زاگرۆس دروستکراون و لە گۆڕەکانی سەردەمی بەردین لە سەرەتاکانی هەزارەی یەکەمی پێش عیسا کەوتوونەتە بەردەست ئەم ئاسەوارە جۆراوجۆرانەی ناو گۆڕستانەکان پەیوەندییان بە کەسانێکەوە بووە کە خەریکی شوانی و ئاژەڵداری و بەخێوکردنی ئەسپ بوون لەو شوێنانەدا نیشتەجێ بوون تێیدا، ئەم خاوەن ئاژەڵە تازە هاتووانە تا ئەو کاتە هێشتا فێری دروستکردنی خانوو نەبوو بوون ژیانیان لە کۆچکردن و کەپرو ساباتدا دەبردە سەر، یاخود خانووێکیان دروستکردووە کە بە تێپەڕبوونی کات لەناوچوون و نەماون، ئەوەی مابێتەوە تەنیا پاشماوەی پەرستگای (سرخدم)ە لە لوڕستان.

## سەردەمانی لە ئارادا نەبوونی پەرستگای سەرگیراو و پەیکەری خواکان

لە سەدەی نۆیەم و هەشتەمی پێش عیسادا، سەرەتا مادەکان لە رێگەی باکووری خۆرئاوای ئێرانەوە هاتوونەتە ئەم خاکە. ئاسەواری گۆڕستانی سەردەمی بە سیلك کاشان و ساختمانی قەڵای چوارگۆشە و میرنشینی ئەو شوێنە دەسکردی ئەو نەتەوە تازە هاتووەن. ئەم کۆچەریانە سەرەتا مردووەکانیان لەژێر خاکدا دەشاردەوەو گۆڕەکانیان بە شێوەیەکی هەڵتۆقی و دادەپۆشی، چەندین گۆڕی لەم جۆرە لە باباجانی کرمانشا، گودین تەپە و کنگاور، هەمەدان، نەهاوەند، نوشیجانی مەلایر، لەلایەن ئەمانەوە لە رێڕەوی خۆیاندا دروستکراون و بەجێماون. ئەم تازە هاتوانە پەرستگاو پەیکەریان نەبووەو پەیڕەوی ئایینی موغەکان و زەردەشت بوون.

لە سەدەی حەوتەمی پێش عیسادا، پارسەکان کە بە ئامۆزای کۆچەرییەکانی پێش خۆیان دادەنرێن،

لە هەمان رێگاوە گەیشتنە ئەم خاکە و بەرە بەرە سەرکەوتن بەسەر مادەکاندا و دەستیان کرد بە دروستکردنی شارو پێگەی دەوڵەتی. سەرەتا لەسەر مەسجد و پاسار گادو هەمەدان

بارگە و بنەیان خست و وردە وردە کە دەسەڵات و توانایان پەیدا کرد، حکومەتەکانی وڵاتە دوورەکانیان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە.

پارسەکان، پەرستگایان نەبوو، پەیکەری خواکانیان نەدەپەرست، ئەوەی زۆر گرنگ بوو بەلایانەوە حکومەت و دەسەڵات و بوونی شایەك لەسەر لووتکەی دەسەڵات و دروستکردنی ساختمان و کۆشك بە شێوەی چوارگۆشە و رازاندنەوەیان بە کۆڵەکە و هەیوان لە پانایی ئەو شوێنانەی لەژێر دەستیان بوو. خوای ئەوانە (ئاهورامەزدا) بووە ئایینیشیان بریتی بوو لە پیرۆز راگرتنی ئاگر. ئەوەندەی پێنەچوو کە لە نیوەی سەدەی شەشەمی پێش عیسادا، کۆرشی گەورە، پاش ئەوەی سەرکەوت بەسەر میسری و لیدی و بابلی و ئاشووریی و ئورارتوییەکاندا، چی وەستای بیناسازی و بەردکاری ئەو وڵاتانە هەبوو هەمووی هێنان و لە پاسارگادو هەمەدان دەستی کرد بە فراوان کردنی شارو بنیاتنانی کۆشکی گەورە. بەدوای ئەودا داریۆش دەستیکرد بە دروستکردنی کۆشك و ساختمانی گەورەو شاهانە، خەڵکە ئاساییەکەش بە خشت و دار دەستیان کرد بە دروستکردنی خانووی چوارگۆشەی هەیوان دار بۆ نیشتەجێبوونی خۆیان و لەسەر بەرزایی شاخەکان قوللەی بەرزیان دروست دەکرد بۆ شوێنی خواپەرستی، تاکە خوای شاو خەڵك ئاهورامەزدا بوو، پەرستگاکانیان بەرزایی و شاخەکان بوون کە لەوێدا ئاگردانێکیان دروستکرد بوو.

تا سەردەمی ئەردەشێری دووەم هەخامەنشی، دروستکردنی پەیکەری خواکان و بنیاتنانی هەموو جۆرە پەرستگاو ئاتەشگای سەرداپۆشراو لە ئێراندا یاساغ بوو، ئاسەوارو بەڵگەیەك لەسەر بوونی پەرستگا سەرگیراو و پەیکەر پێش سەردەمی ئەردەشێری دووەم، تا ئێستا لە پشکنینی شوێنەوارناسیدا دەست نەکەوتووە.

### دروستکردنی پەرستگای سەرداپۆشراو و پەرستنی پەیکەری خواکان

لە ساڵی 404ی پێش عیساوە تا ساڵی 224ی پاش عیسا، واتە ماوەی 628 ساڵ، سەرلەنوێ دەستکرایەوە بە دروستکردنی پەرستگا بۆ ئاهورامەزدا، ئاناهیتا، میترا، بەشێوەی سەرگیراو و داپۆشراو، لەو شوێن و ناوچانەی لەژێر فەرمانڕەوایی ئەردەشێری دووەم و حکومەتەکانی سلوکی و پارتی، دوو خوای ئاهورامەزداو ئەهریمەن، وەك خوای چاکە و خراپە

گۆڕدرا بۆ سێ خوایی و پاشان لەناوچوونی زنجیرەی شاکانی هەخامەنشی لە بواری ئایینیدا چەند خوایەکیتر هاتنە ئاراوە. لە بابل، سوریا، باختەر، لە خوزستان و بەشێوەیەکی گشتی لە چوارچێوەی سارای ناوەندیدا چەند پەرستگا دروستکران بە بیانووی پەرستنی خواکان.

لە ساڵی 224ی پاش عیسا و پێش ئەوەی کە زنجیرەی ساسانی دەسەڵاتیان گرتە دەست و روویان کردە ئایینی زەردەشتی وەك ئایینێکی رەسمی دەوڵەت، جارێکیتر هەموو پەرستگاکان وێران کران و خوا جیاجیاکان هەموو سەرنگون کران و لەبڕی ئەوانە بە گوێرەی راسپاردەی ئاوێستا بەرپرسیانی ئایینی دەستیان کرد بە دروستکردنی ئاتەشگا لە شوێن و لووتکە هەر بەرزەکاندا وەك سەردەمی هەخامەنشییەکان و وێنەی ئاناهیتا و فریشتەکانیان لە شێوەی نەخشێکی دەرکەوتوو هەڵتۆقی و کۆمەڵەکان و بەسەکانیتریان پێ جوان کردووە.

دروستکردنی ئاتەشگای سادە بە سەقف و سەربانی گومەزی شێوەوە گۆڕا بۆ شێوەی ساختمانێکی (بینایەکی) چوار دەروازەیی، کە لەو سەردەمەوە تا ئێستا چل و چوار ئاتەشگای لەو شێوازە دۆزراوەتەوە کە گرنگترینیان لە تەختی سلێماندایە (ئاتەشگای ئازەر گوشتاسب).

## بەراودکردنی شێوازی ساختمانی نیشتەجێبوون و پەرستگاکان

لە سەدەی پێنجەمی پێش عیساو لە سەردەمی زێڕینی یۆنانییەکاندا بیناساز و بەرد تاشەکان، دەستیان دایە دروستکردنی پەرستگا لەسەر شێوازی ئاتیکو دوریك بە شێوەیەکی فراوان. ئەو بەرد کارییانەی دەکران لە پەرستگاکاندا جوانکاری تێدابوو. پەیکەری خواکان کە لە بەردی مەڕ مەڕ دروستدەکران، بە چەندەها خشڵ دەڕازانرانەوە، بەجۆرێکی وا کە رەگەز درشت و قەبەکان بەهۆی رەنگ کردن و هێڵکارییەوە دەگۆڕدران و دەخرانە شێوەیەکی جوان و زێڕینەوە. پەیکەرە جۆراوجۆرەکانی خواکان بەشێوەیەکی رووت و لە هەرەتی گەنجیدا،

لە پەرستگاکانی وەك: (پارتیون)، (ژۆبیتەر)، (ئەرخسیۆم)، (تسئەئوس) و گەلێك لە پەرستگاکانی میسر و وڵاتی نێوان دوو رووبار و سوریا ئەم پەیکەرانە دادەنران.

لەگەڵ پەیدابوون و برەو پەیداکردنی ئایینی عیساو دروستکردنی کلیساکان لە شوێنی پەرستگاکاندا، یەکسەر پەیکەری خرو سێ لایی لەناو پەرستگاکاندا بۆ عیساو مەریەم، لەگەڵ نەخشاندنی پەیکەرەکان بە

وێنەی پیاوانی پیرۆزی ئایینی مەسیحی و بەکارهێنانی مۆزاییك و گەچکاری و شووشەی رەنگاو رەنگ هاتە ئاراوەو جوانییەکی بەخشی بە دەرگا و دیواری کلێساو پەرستگاکان.

لەو شوێنانەی لەژێر دەسەڵاتی ساسانییەکاندا بوون، بە هاتنی دەسەڵاتی ئایینی ئیسلام، هەندێ لە ئاتەشگاکان کران بە مزگەوت و گومەز و منارەو میحرابیان بۆ دروستکران، بە بەرزی و گەورەیی منارەو کۆڵەکەو میحراب، کاشیکاری جوان لەگەڵ نەخش و نووسیندا، فەرموودەی خواو ئایەتەکانی قورئانیان لەسەر نووسیوە و هیچ زەێر و خشڵێکی پێوە نییە، وەك مزگەوتەکانی ئەسفەهان کە هەرچەندە شاهانە دروستکران، بەڵام جگە لە کاشیکاری و ئایەتی قورئان هیچ جوانکارییەکیتری بۆ نەکراوە.

موسڵمانە خوا پەرستەکان لەم جۆرە شوێنانەدا بەبێ ئەوەی هیچ پەیکەرێکی لێبێ، نوقمی توانایی و گەورەیی خوا دەبن و لەگەڵ روانین بۆ لووتکەی مەنارەو گومەزەکان لەسەر بەرەو ئاسمان و کاکێشان بەرز دەکەنەوەو لە دڵی رووناکی خۆیاندا دەگەڕێن بە دوای تاك و تەنیادا.

## راپۆرتی گەشتیاران و رۆژهەڵاتناسان لەسەر نەخشەی بیناسازی پەرستگای ئاناهیتا لە کنگاوەر

سەدو حەفتا ساڵ پێش ئێستا، کە گەشتیارە ئەوروپییەکان و ئەوانەی بەدوای شارە شوێن نەزانراوە دێرین و مێژوویەکانی ئێراندا دەگەڕێن، سەردانی شارۆچکەی کنگاوەریان کرد. لەسەر دیواری گۆشەی باکووری رۆژئاوای شوێنەکە پەیوەستە بە ئیمامزادە شازادە ئیبراهیمەوە نۆ ستوونی راوەستاو لەسەر بەرزایی شوێن پایەکان لە بەشێکی چل مەتری دیوارەکە بەرچاو دەکەوێ، لەلای باشووریشەوە لە چەندین بەرزاییدا هەندێ پارچە بەردی شکاو هەن کە بەدرێژایی دوو سەدو دە مەتر بەلای رۆژهەڵاتی رۆژئاواوە بڵاودەبنەوە. (تکسیە) لە هەزار و هەشت سەدو سی و نۆدا و (فلانددن کست) لە هەزارو هەشت سەدو چلدا، ئەم بەشەیان بە دەروازەی پەرسگاکە داناوەو بە ئەندازە گرتنی درێژیی بەشی خۆرئاواوو باشوور کە بریتییە لە 217,93*229 مەتر،

بە بەراوردکردنی ژمارەکان لە باکوور و رۆژهەڵات نەخشەی پەرستگاکەیان لەگەڵ پەرستگای کنگوبار، کە (ئیزیدور خاراکسی) لە سەردەمی یەکەمی میلادیدا لە کتێبەکەی

خۆیدا بەناوی (ئیستگاکانی پارت) باسیکردووە، بەیەك شێوە داناوە، لەبەر ئەوەی کە مۆڵەتی ئەوەی نەبووە شوێنەکە هەڵکەنی بۆ ئەوەی نەخشەی تەواوی شوێنەکە بخاتەڕوو، نەخشەی خەیاڵی بە بەراورد لەگەڵ پەرستگای خورشید (پالمیرا) لە سوریا دروستی کردووتەوەو وێنەی گرتووەو ستوون و بنچینەکانی پاشماوەی دیوارەکان لەگەڵ بەردکارییانی یۆنانی شێوازی دووریکدا وەك یەك داناوە.

لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمیشەوە، جاکسۆن دیولافوا، هێرتسفیلڵ، دومورگان، پاش ئەوەی سەردانی کنگاوەریان کردووە هەریەك لەوانە بابەتێکیان لەسەر نەخشە و ساختمانەکە نووسیوەو بە پەرستگایەکی سەردەمی سلوکی-پارتیان داناوەو پشتگیری ئەوەشیان کردووە کە لەسەر شێوازی یۆناییە تکسیە و جوکسون، لە راپۆرتەکانی خۆیاندا پەرستگای کنگاوەریان داوەتە پاڵ ئەردەشێری دووەمی هەخامەنشی.

لەم چل ساڵەی دواییشدا (رومن گریشمن) لە چەند بابەتێکی خۆیدا دەربارەی ئێران و پارت و ساسانییەکان، پاشماوەی ساختمانەکەی بە ئاسەواری پەرستگایەکی دوو سەد ساڵ پێش عیسا داناوەو نەخشەی پاشماوەکەی گەڕاندووەتەوە بۆ سەردەمی سلوکی و پارتییەکان، رۆژهەڵات نامەکانیتر، هەر ئەم بۆچوونانەیان دووپات کردووەتەوە و شتێکیان لەسەر زیاد نەکردووە.

بەم جۆرە تا سێ ساڵ پێش ئێستا ئەو زانیاریانەی کە لە راگوزەرو گەشتیارانی کۆن و نوێی ئەوروپاییەوە کەوتوونەتە دەست لە دوو سێ دێڕ زیاتر تێپەڕیان نەکردووە، جوگرافینووسە فارس وعەرەبەکانیش لە سەدەی سێهەمی کۆچیدا ئەم ساختمانەیان بە کۆشکی دزەکان و باڵەخانەی خەسرەو و کۆشکی پەروێز و شوێن راوی پەروێز ناساندووە.

لە ساڵی 1933دا (ئەریخ شمیت) هاوکات لەگەڵ کاری کنە و پشکنینی خۆیدا لە تەختی جەمشید، سواری فڕۆکە تایبەتەکەی خۆی دەبوو لەناو فڕۆکەکەوە چەند وێنەی کنگاور و گودین تەپە و تەپە کارخانەی ئامادەکرد و ئەم وێنانەی لە کتێبەکەیدا بە ناوی (فڕین بەسەر شارە کۆنەکانی ئێراندا) چاپ کردووە.

بەرپرسانی میراتی کەلتووری پێش لە شۆڕشی ئیسلام ئێران لە ساڵی 1347دا، پێنج پرۆژەی گەورەی شوێنەوارناسی لە هەموو ولاّتدا، لەوانە تەختی جەمشید، نیشابور،

هەمەدان و کنگاور، بەمن سپێردراو خەرجییەکەی بەهۆی دەزگای بەرنامە و بودجەوە دابینکرا. من فەرمانم پێدرا بۆ سەرپەرشتی کردنی دەستەیەك لە ئاسەوارناسان لە شارۆچکەی

کنگاور بۆ کاری کنه و پشکنین، له رابوردووی نۆ ستوونه‌که و هه‌ندێ له دیواری به‌ردینی کۆن که له ساڵی (1840)دا وێنه‌ی گیرابوو، هیچی دیار نه‌مابوو له‌به‌ر ئه‌وه نه‌خشه‌ی پشکنینه‌که بۆ سێ مانگ درێژکرایه‌وه به‌مه‌رجێك که نیشانه و ئاسه‌واره‌کان به په‌یوه‌ندی له‌گه‌ڵ رابوردووی نۆ ستوونه‌که و خستنه روویان به شێوه‌یه‌کی زانستیانه، ئه‌م کاره ئه‌نجامدراو نووسه‌ر له‌گه‌ڵ دوو ئه‌ندامی سه‌رکی ده‌سته‌که و دوو خوێندکاری بواری کۆنناسی دانشگای تاران و دوو که‌س له سه‌رپه‌رشتیکارانی کرێکارانی هه‌ڵکه‌ندنی هونه‌ری و له سه‌ره‌تای مانگی سێهه‌می ساڵی (1347)دا، ده‌ستیان کرد به کارکردن له‌سه‌ر رۆشنایی وێنه‌کانی (ئه‌شمیت) و سنووری دیواری رۆژهه‌ڵات و باشوور له شوێنه‌که دیاری کرا. دواتر له شه‌ش چاڵ به درێژی شه‌ست مه‌تر و پانی بیست مه‌تر و له کۆی 1200 مه‌تری چوارگۆشه دروستکرا به هه‌ڵکه‌ندن و خاك و خۆڵه‌که‌ی هێنرایه ده‌ره‌وه. له‌م چاڵانه‌دا که له باشووری به‌شی رۆژهه‌ڵاتی شارۆچکه‌که‌دا هه‌ڵکه‌نرابوون پاشماوه‌ی گه‌لێك ستوون و ته‌خته به‌ردی ده‌ستکاری کراو و پاشماوه‌ی دیواری رووخاو که هه‌موو چاڵه‌کانی داپۆشیبو که به به‌راورد له‌گه‌ڵ ساختمانه تازه‌کان و پارچه گۆزه‌که له سه‌رده‌مانی جیاجیاکادا دۆرزانه‌وه، ده‌سته‌ی به‌رپرسی کنه‌و پشکنینه‌که رووبه‌رووی کۆمه‌ڵێك ئاسه‌واری جۆراوجۆر بوویه‌وه له‌گه‌ڵ برێکی زۆر له به‌رهه‌م و ده‌ستکردی سه‌رده‌مه کۆنه‌کان و سه‌رده‌مه سه‌ره‌تاییه‌کانی ئیسلام تا ئێستا که سه‌رو سیمای شاره‌که‌ی له‌گه‌ڵ پێگه‌ی ئابووری، کۆمه‌ڵایه‌تی نیشته‌جێبوون، فه‌رمانڕه‌وایی، رێبازی ئایینی، په‌رستگا، گۆڕستانه‌کان به‌شێوه‌یه‌کی نادیار و وێران و سه‌ره‌و ژێر کراون.

له شاری هه‌مه‌دانیشدا، به هه‌مان شێوه به‌رنامه دانرا بۆ کار له‌گه‌ڵ جیاوازییه‌کدا که ژماره‌ی 990 ماڵ و دوکان له شوێنی شاره کۆنه‌که‌دا له‌سه‌ر ته‌په‌ی (ئه‌کباتانا)دا هه‌بوون که به‌و هۆیه‌وه کاره‌که به زه‌حمه‌ت ده‌چووه پێشه‌وه، چونکه تا پانزه ساڵ پێش ئێستا بواری ئه‌وه نه‌بووه که کاری هه‌ڵکه‌ندن و کنه‌و پشکنینی تیا بکرێ.

له کنگاوه‌ردا کۆمه‌ڵێك خانوو و دوکان و موڵکی ئه‌وقاف دروست کرابوون که ژماره‌یان ده‌گه‌یشته (214) له شارۆچکه‌یه‌کی هه‌ژار و خاڵی له‌مه‌رجی ته‌ندروستی بوو، دانیشتوانه‌که‌ی به زۆری خه‌ریکی مارگرتن، رمڵ لێدان، ده‌روێشی،

بازرگانیکردن به تلیاك و کاری خراپه بوون. له حاڵه‌تێکی وادا هه‌لێکی باش رێك که‌وتبوو بۆ ئه‌وه‌ی خاوه‌ن ماڵه‌کان زه‌وییه‌کیتر یا پاره وه‌ربگرن و له شوێنه‌که رزگاریان ببێ.

نووسەری کتێبەکە، سەرپەرشتی خەمڵاندنی زەوی و خانووەکان و کامەندانی دەزگای بەرنامە و هەم سەرپەرشتی دەستەی لێکۆڵینەوەو پشکنین بوو رووبەڕووی ئەرکێکی قورس و گران بوویەوە، چونکە خاوەن زەوی میراتبەرەکان بەڵگەی رەسمی و قانویان نەبوو و ئەمەش بووە هۆی دواکەوتنی کارەکان. بەم هۆیەوە پارێزگاری ئەو سەردەمەی کرماشان دووجار لە نزیکەوە بە دوادەچوونێکی مەسەلەکەی کردو بە نووسراوی رەسمی داوای لە دەزگاکان کرد کە بەخێرایی کۆسپەکانی سەر رێگای جێبەجێ کردنی مەسەلەکە لابەرن تا لە ئەنجامدا گواستنەوەی دانیشتوانی شارۆچکەکەو چۆڵکردنی شوێنەکان هاوکات لەگەڵ روخاندن و لابردنی خانووە تازە دروستکراوەکان، پاراستنی و نوێکردنەوەی ئاسەوارە کۆنەکان رووی لە پەرەسەندن کرد و کنەو پشکنین گەیشتە قۆناغێکی خێراو پێشەوەچوونی کارەکان و کارکردنی زیاتر لە دوو سەد کرێکاری ناوچەکە بوو بەهۆی باشبوونی باری ئابووری.

لەو خانووانەی کە کڕابوون سێ خانوویان کران بە یەك و گۆڕانکارییەکایان تێداکرا. نووسینگەی هونەری نەخشەکێشان، ژووری تاریك بۆ وێنەگرتن، عەمبارێکی کەلوپەل، نووسینگەی بەڕێوەبردن، چێشتخانە، ژووری نان خواردن، ژووری ئەنتیکەخانە، دە ژووری بۆ حەوانەوەو خەوتن بۆ میوان و ئەندامان و شارەزاکان، ئامادەکرا. وەستایەکی دارتاشی خەڵکی ناوچەکە بە کرێ،

لەو کەلوپەلەی کە لە خانووەکاندا بوون، کورسی و قەرەوێڵە و مێزی نان خواردن و چارپایە، جێگەی نووستن و پێویستییەکانیتری بۆ دروست کردین. لەلایەکیترەوە دەزگای بەرنامە هەموو ئامێرێکی بۆ شاخ کون کردن و بەرد شکاندن بۆ دابینکردین، کارگەیەکی شاخ و بەرد بڕین دروستکرا، کارگەیەکی ئاسنگەریش لە نزیك بیناکەی شازادە ئیبراهیم، بە کوورەو مووشە دەمەوە ئامادەکرا بۆ دروستکردنی شیش و پێویستییەکانیتر و بەم شیشانە گواستنەوەی ستوون و سەرستوونەکان ئاسان بوون بۆمان.

بەمجۆرە، شوێن لێکۆڵینەوەی پەرستگای ئاناهیتا بەو هەموو توانایەی خۆیەوە، بوو بە سەنتەرێك بۆ گەلێك لێکۆڵەرەوەو ئەوانەی پەیوەندییان هەبوو پێیەوە لە ئێرانییەکان و ئەوانەی شەیدای ئەو بوارە بوون بەجۆرێك بە چەندەها رۆژ و حەفتە دەیانتوانی لەم سەنتەرەدا خەریکی کاری لێکۆڵینەوەی کۆنناسی و کۆمەڵناسی، فێربوون، ئامادەکردنی نامە سەرولیسانس و دکتۆرا ئامادە بکەن و دەستەی کنەو پشکنین ئاسانکاری تەواوی بۆ ئەوانە دەستەبەر کردبوو.

نووسەری ئەم کتێبە لەگەڵ دەستەیەکی پانزە کەسیدا، بەدرێژایی حەوت وەزری کنەو پکشنین لە کنگاور و دوو وەرز لە تاق گەڕا (پاتاق) و تێکڕا چوار وەرزی هاوین و زستان، بۆ سەرلەنوێ دروستکردنەوەی ئاسەواری کنگاور و تاق گەڕا، بەدرێژایی چاو هەشت مانگ، بە هەوڵ و کۆششێکی بەردەوام، بۆ ناسین و لێکۆڵینەوەو دروستکردنەوەی نەخشەو بیناکانی هەردوو شوێنەوارەکەو بەرچاو کەوتووەو هەستی پێکراوە و لە ژێر خاك دەرهێنراوە کەتووەتەوە بەرباس و لێکۆڵینەوەو بڵاوکراوەتەوە.

لەسەر ئاسەواری تاق گەڕ، پاش کنەو پشکنین و دۆزینەوەی ئەو بەردانەی کە لەژێر خاکدا بوون، کە (فلاندن——کست) بەهۆی کەوتن و گومبوونیان لەژێر خاکدا، بە هەڵە لە وێنەکەیدا روویداوە کە سەقفەکەی بە تەختی وێنە نەکێشاوە بەڵکو لە دوو  لاوە بە لێژیی وێنەی کێشاوە، ئێمە لەسەر شێوازێکی زانستی سەرلەنوێ دروستمان کردووەتەوە، بەڵام بەداخەوە، وا سێ ساڵ دەبێ کە کێشەی کنگاور هەروەك خۆی ماوەتەوە.

## ساختمانی کنگاور-شوێنەکەی-بۆچی واناوی نراوی؟

شەقامی ناهید لە بارەی شوێنەکەیەوە کەوتووەتە خۆرئاوای ساختمانە ئاسەوارییە مێژووییەکەوە لەلای باکوورەوە بازاڕێکی بچووك هەیە لەگەڵ بینای ئیمامزادە شازادە ئیبراهیمەوە،

لای رۆژهەڵاتیشەوە پاڵیداوە بە تاشە بەردی بابا قورەت و هەندێ گوندنشینەکان لە باشووریشەوە بە زەوی کشتوکاڵ و رێگای نێوان هەمەدان و کرماشان کۆتایی دێت. ناوی خیابانەکە لەو ئاسەوارەوە وەرگیراوە کە بووە بە ژێر خاکەوە لە مێژوودا باسکراو و ناو و بەکارهێنانەکەی لەسەر بنەمای بەکارهێنانی پەرستگای سەرداپۆشراوەکانی یۆنان و بوونی پەیکەری ئارتمیس (ئاناهیتا) بەهۆی گەشتیارە ئەوروپییەکانەوە.

لەم پەنجا شەست ساڵەی دواییدا، هەندێ کەسانی نەدار و هەژار، بۆ دابینکردنی ژیانیان و دروستکردنی شوێنی نیشتەجێبوونی خۆیان، دەسیان کردووە بە سووتاندنی ئەو بەردە گەچینەیەی لەو شوێنەدا مابوونەوە ئاهەنگ و قسڵ و گەچیان بەرهەمدەهێنا لێی، لەبەر ئەوە شوێنەکە لە ناو خەڵکەکەدا ناوی دێی گەچ کەنەکانی لێنرا.

بەم شێوەیە کۆمەڵە ساختمانەکانی کنگاوەر پەیوەندییەکی دوور و نزیکی هەبووە لەگەڵ ئێزەد بانوی ئاناهیتا. چونکە بەلای خەڵکی ناوچەکەوە، لە سەردەمانێکی کۆنەوە ئەفسانە و سەرگوزشتەیەکی زۆر هەبووە کە خەڵك دەم بە دەم گێڕاویانەتەوە. ئەگەر گوندی گەچ کەن، یا چغازەنبیل، نەخشی رەجەب، نەخشی رۆستەم، قەڵای زوحاك کۆی خواجە، گەلێکیتر شوێنی کۆن و مێژوویی بە تێپەڕبوونی کات و سەردەم ناوێکی ناوچەییان بۆ دانراوە کە بە گوێرەی زانیاری ئەمڕۆ ئەو ناوانە ناگونجێن لەگەڵ شوێنەکەدا، بەڵام ناو و وشەی (کنگاوەر-کنکوبار) لە سەدەی یەکەمی عیساوە لە مێژوودا جێی گرتووەو تا ئەمڕۆش گۆڕانێکی وا نەهاتووە بەسەریاندا، جگە لەوە کە شێوازی بیناسازییەکەی پەیوەندییەکی نزیکی هەیە لەگەڵ ئاناهیتادا بەم بەڵگانەی خوارەوە:

لە یەکەم رۆژەکانی دەست بەکاربوونمان، لەناو خەڵکیدا قسە و قسەلۆك بڵاوبووبوویەوە لە زمانی کەسانی پیرو بەتەمەنەکاندا دەیانگووت بە گەنجەکان، گوایا ئەمانە هاتوون بۆ ئەوەی هەناری زێڕین و ماسی زێڕین لەژێر زەوی گوندی گەچکەن دەربێنن!.

لە ناوچەی خۆرئاوای ئێراندا بەتایبەت لە لوڕستان، هەنار و گوڵ هەنار و ماسی و مەڕی کێوی و ئاو، وەك هێما و نیشانەیەك وان بۆ (ئەشێ) کە خوا ژنێکی وەك ئاناهیتا و عەشتاری بابلی و نانای سۆمەری کە ئەمانە خوای ئاو زاوزێ کردن و جوانین، کە لای یۆنانی و رۆمییەکان بە ئارتمیس، دیانا، ئافرودیت، سین بل، ڤینۆس و هیتر ناسراون چەند دەرزی لە برۆنز دروستکراو کە سەرەکەیان پان بووەو نەخش و نیگاری خەیاڵیئەفسانەیی و وێنەی ژنێك لە حاڵەتی سکپڕی و منداڵ بووندا پێیانەوە بووە، یاخود وێنە و نەخشی ژنێکیتر کە لە دەوروبەریدا ماسییەکان دوو بازنەیان پێکهێناوەو هەنار و گوڵە هەنار و هەندێك نەخشەیتری خەیاڵی لەسەر ئەو دەرزی سنجاقانە وێنە کرابوون، (ئەریك شمیت) ئەم دەرزی سنجاقانەی لە درزی دیوارەکانی پەرستگای (سورخدم) لە لورستان دۆزیبوویەوە کەوا دیارە ژنە نەزۆکەکان وەك قوربانی و نەرز چەقاندوویانە بەو شوێنانەدا. کەلوپەلی ئایینی لەم جۆرە لە مۆزەخانەی ئێراندا هەن و شایانی توێژینەوەو بەدواداچوونن بۆ تێگەیشتن لە ناوچەی لوڕستان.

لە کتێبی (عجائب المخلوقات)ی محەمەد توسی کە لە ساڵی (556)ی کۆچیدا دانراوە، هاتووە کە ((کۆشکی... شارێکی لەو سنوورەدا پێی دەگوترێ کنگور. خانووی زۆر سەیری لێ دروستکراوە لە

بەرد، ئەو بەردانە خراونەتە سەریەك و قورسایی هەریەك لەو بەردانە باس ناكرێن، مەگەر هەر خوا بزانێ كێ دروستی كردووەو بە چ هێزێك ئەو بەردانە بەرزكراونەتەوە)).

((لەم كۆشكەدا سەرچاوەیەكی لێیە كە تیایدا ماسی رەشی ئەڵقە لە گوێ هەیە، جێی سەرسوورمانە كە ماسی لە دەرەوەی ئاوی ناژی ئیتر چۆن ئەم ئەڵقانە كراوەتە گوێچكەیان)).

شوێنەواری جۆگە ئاوێك لەو شوێنەدا كە دەسەڵاتداران لەسەر بەرزاییەك تا سەدەی حەوتەمی كۆچی دروستیان كردووە لە سەردەمی ئیسلامدا، لەكاتی كنەو پشكنیندا دەركەوتووە، ئەم جۆگە ئاوە بە لوولە راكێشراوە و بە شێوەی لوولەی ئاوی ماڵان، جۆگای ئاوەڕۆیش لەكاتی هەڵكەندنەكەدا دەركەوتووە. ئاوەكە بە لوولەكەدا رۆیشتووە و شان بە شانی ئەو ئاوەڕۆش ئامادەكراوە كە پاشماوەی ئاوی باران و سەرچاوەی دەگەیەنێتە دەرەوەی ناوچەكە،

لە سەردەمانی كۆندا ئاوەڕۆ و جۆگە ئاوەكان لەژێر سەكۆی ناوەندی بە دیواری چوار لایەنە ئاوی باران و سەرچاوەكان بەو لوولانەدا رۆیشتووە بۆ كاری كشتوكاڵ بەكارهێنراوە لە دەرەوەی ناوچەكە.

### پەرتگای ئاناهیتا-كنگاوەر لە (كنەو پشكنین و توێژینەوە)

كارو چالاكی تاقمی ئاسەوارناسی پەرستگای ئاناهیتای كنگاوەر لە ساڵی 1347ی كۆچی هەتاوی بە سەرپەرشتی نووسەر دەستی پێكرد، هاوكات لەگەڵ جێبەجێكردنی پڕۆژەی كڕین و گواستنەوەو رووخاندنی خانووە شڕەی گوندنشینەكان، نەخشەی كاری پشكنین بۆ دیواری رۆژهەڵات، باشوور، رۆژئاوا و ناوچەی سەرووی بەرزاییەكە ئەنجامدرا، كە بە پێچەوانەوە بۆچوونی (فلاندن كست) تەنیا یەك ستوون كە بریتییە لە پایە + كۆڵەكە + سەرستوون لە قەراغی دیواری دەرەوە لەناو خاك دەركەوت، لەگەڵ ئەوەی كە دەكەوێتە بەرچاو لە پلەكانەی دوولا لە باشووری ناوچەكەیدا كە نەحشی چوارگۆشەكەی، سەكۆ و پەرستگاكانی سەردانەپۆشراوی سەردەمی هەخامەنشی دێنێتەوە بەرچاوی بینەر، لەبەر ئەوە، شێوازی بیناسازی لە سەردەمی هەخامەنشییەكاندا كراوە بووە وەك پەرستگای ئارتمیس لە سەردەمی سلوكییەكان و پەرستگای (ئانائی تیس= ئاناهیتا) لە سەردەمی پارتی و لە سەردەمی ساسانییەكاندا پەرستگای ئاناهیتا و ئاتەشگاكان. لە سەردەمی ئیسلامییەكاندا، وێرانەكە كە ناویان لێناوە (كۆشكی دزەكان) بووە بە شوێنی نیشتەجێبوون و بەرە بەرە بووە بە خاوەنی

مزگەوت، گەرماو، ڕێگا، بازاڕ، خان، گۆڕستان و لە ئەنجامیشدا بووە بە شارۆچکەیەکی گەورە لە جێگای ئەو بیناسازییە کۆنەداو خاوەنی فەرمانڕەوای ناوچەیی خۆی کە تا ئێستا بەردەوامن.

نەخشەی پاشماوەی تەواوی بیناسازییەکە، کە بەهۆی پشکنینی کۆن ناسییەوە لە ژێر خاکەوە هاتووەتەدەر، بەرزاییەکە× چوارگۆشە بە پانایی 210× 208 مەتر لەلای باشوورییەوە دیوارێك هەیە رازاوەتەوە بە بیست و چوار کولەکەی چوون یەك، لە دوولاوە دوو پلەکانی هەیە هەریەك بە درێژایی سێ مەتر کە هەریەك بە درێژایی سی مەتر کە هەرەیەك بۆشاییەکی لە خۆگرتووە بە درێژایی 94 مەتر، پلەکانە و بۆشاییەکان بە پانی چوارمەتر و چارەکێك لە دیوارە هەژدە مەترو نیوی و کە هاتوونەتە پێشەوە.

دیواری لای رۆژئاواو رۆژهەلات، بە تیرەی هەژدە مەترو نیو پێکهاتووە لە ریزێك ستوون 48 و بیست و چوار تاکی کە جگە لە پێنج کۆڵەکەیان نەبێ هەموو رووخاون و کەوتوون.

جگە لەوانەی باسکران پلەکانەیەك هەیە لە گۆشەی باکووری خۆرهەلات و پاشماوەی سەرچاوە ئاوێك و حەوزێکی چوارگۆشە نزیك لە لوتکەی بەرزاییەکەوەیە، کە بە گوێرەی بەڵگەکان لە سەدەی حەوتەمی کۆچیدا ئاوی سەرچاوەکە و حەوزەکە وشك بووەو جۆگای ئاو و ئاوەڕۆ لە سەردەمە کۆنەکان و سەدەکانی سەرەتایی سەردەمی ئیسلامەوە لە شوێنیاندا دانراون.

لە سەردەمی هاتنی موسوڵمانانەدا ئەم شوێنە ئاگری تێبەردراوە و پاشماوەی خۆڵەمێش و خەلۆزی دار تێکەڵ بە خاك بەو چاڵانەدا کە هەڵکەنراون بەڵگەی ئەم ئاگر تێبەردان و سووتاندنەن.

لەگلەڵ بەرەو پێشەوە چوونی خاك و خۆڵ و لادان و پشکنین بە درێژایی دیوارەکان، بەردە کەوتووەکان لەگەڵ ریزێك کۆڵەکە و ستوون و پارچەکانیان، پاش ئەوەی خاك و خۆڵەکەیان لێکرایەوە، سەرلەنوێ لە شوێنی خۆیانە دانرانەوە و وێنەی هەموو پارچەکان گیران.

### شوێنی ستوونسازی لە پەرستگای کەنگاوەردا

شێوازی دروستکردنی ستوون لە پەرستگای کنگاوەردا، لەگەڵ هیچ کام لەوانەی سەردەمەکانی یۆنان، یا ئێرانی سەردەمی ساسانی لە یەك ناچن و بەراورد ناکرێن لەگەڵ یەکدا، چونکە ئەندازەکانیان یەك بە دووە، قەوارەی پایە ستوونەکە 180 سانتیمەترەو

قەوارەی خودی ستوونەکان 130 و هەندێ جاریش 135 سانتیمەترەو بەرزایی ستوونەکە لە خوارەوە تا سەرەوە 3,55 مەترە، کە ستوونی لەم جۆرە هیچ پێشینەیەکی نییە، لەم حاڵەدا بەراورد کردن لەلاکان و بەشەکانی تەواوی ستوونەکە لەبەرچاو گیراوە.

ماوەی نێوان دوو ستوون بە خودی ستوونەکانیشەوە هاوسانە لەگەڵ 4,75دا و مەودای نێوان دوو ستوونەکەش هاوسانە لەگەڵ 3,55 مەتردا. ئێستا ئەگەر 60 سەنتیمەتری بەرزایی سەر ستوونەکە بخەینە سەر ئەم ژمارەیە دەبێت بە 4,14 مەتر، کە بە لە بەرچاوکردنی شێوازی بەشەکانی ستوونەکە، دەتوانین تەختەی سەر ستوونەکەش بژمێرین کە ئەویش نزیکەی 60 سانتیمەتر بەرزایی هەیە، بەم شێوەیە، ئەندازەی یەك ستوون لەگەڵ بەشی لای سەرەوەو لای خوارەوەیدا هاوسانە لەگەڵ تەوەری دوو ستووندا، جێگربوونی ستوونەکان لەسەر یاسای بەرامبەر بوون، کراوە وەك بەرامبەر بوونەوەی (24) ستوون لە هەردوو لای پلەکانەی باشوورەوە، کە ئەمیش بە نۆرەی خۆی بۆشاییەکی بێ ستوونی لە خۆگرتووە بە درێژایی 94 مەتر، قەوارەی ئەم دیوارە 9,32 مەترەو نیوەی تیرەی دیوارەکانی دەوروبەرە. لە سەدا 65 لە دوو رووی رۆژهەڵات و رۆژئاواو هەموو لای باکووری دیواری ناوبراو لە وەختی خۆیدا ناوچەیەکی چوارلای حەوز و سەرچاو و ئاوی سەرووی بەرزاییەکە بووە لەکاتی دەسکاری کردنیا لە سەردەمەکانی ئیسلامدا وێران کراوە ئاوی ئەم چاوگە و حەوزە بەناو جۆگە و ئاوەڕۆکاندا رۆیشتووەو لەژێر دیوارەکانەوە چووەتە دەرەوەی بەرزاییەکە.

بەشی سەرەکی جۆگە و ئاوەڕۆکانی سەردەمانی کۆن و سەرەتای ئیسلام لەکاتی هەڵکەندنا لە شوێنی خۆیان دەرکەوتوون.

## نیشانە و نووسینە هەڵکەنراوەکانی سەر تاشە بەردەکان

لەسەر بەردەکانی ناو دیوارەکانی دەوروبەردا کە گەچاوی بوون و لە هەندێ شوێندا کەوتبوون، سێ جۆرە نووسین و نیشانەی هەڵکەنراو هەبوون کە پەیوەند بوون بە سێ سەردەمی مێژوویەوە:

1- هەندێ لەو نیشانانە لەگەڵ نیشانەکانی بەردەکانی (پاسارگاد) یەکسانن و بە گوێرەی لێکۆڵینەوەی شارەزایانی خەت و نووسینە ئیتاڵییەکان، نیشانەی بەردکارەکانی لیدیاییەکان

کە لە سەردەمی کوروشی گەورەوە بەکارهێنراون (سەردەمی کۆن و هەخامنشییەکان). ئەم جۆرە نیشانانە لەو سەردەمەوە بەکارهێنراون و لە بیناو ساختمانە بەردییەکاندا وەك نەریتێکی ئەو سەردەمە هەڵکۆڵراون.

2- هەندێ نیشانە کە لەو کاتەدا لەناو ئارامی و سامییەکاندا باوبووە کە خۆیان نیشانەی سەردەمی پارتین. ئەم سەردەمە هاوکاتە لەگەڵ کاتی تەواو کردن و دروستکردنی سەرلەنوێی پەرستگای سلوگی/ پارتی کە وەستایان لەو ناوچانەوە هێناوە بۆ کارکردن لە پەرستگاکەدا.

3- لە سەردەمی سێیەم و گۆڕین و سەرلەنوێ دروستکردنەوەی پەرستگای سەر بەرزاییەکە و کردنی بە ئاتەشگایەك، چەند نیشانە و نووسینێکی جیاجیا کە پەیوەندی هەبوو بە سەردەمی ساسانییەکانەوە لەسەر گابەردەکان هەڵکەندرابوون کە بەشی زۆریان لە ماوەی ساڵەکانی 459-485ی عیساییدا لە سەردەمی پیرۆز شاو دواتر هەڵکەندراون، نووسینەکان بە گشتی ناوی (پیرو پیرۆز)یان پێوەیە، دوکتۆر Gerpp -Gropp، شارەزاو پسپۆڕی نووسینی سەردەمی ساسانی کە لە هەندێ لە وەرزەکاندا بە هاوڕێیەتی دەستەی کۆنناسی تەختی سلێمان، سەیرێکی ئەم نووسینانەی دەکرد، لای وایە کە ئەو نوسینانە دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی سەردەمی ساسانی و دواتر، پرۆفیسۆر فلادیمیر گریگورویج لوکونین کە بەرپرسی بەشی دراوەکانی سەردەمی ساسانی بوو لە مۆزەخانەی ئەرمیتازی لینینگراد و لە ساڵی 1353ی کۆچی هەتاویدا بوو بە میوانی من لە کنگاوەر، ناوی جیاو هەڵکۆڵراوەکانی بە هی سەردەمی خەسرەوی پەروێزدا وەناوە کورتە نووسینێکی لە ساڵی 1977دا بڵاوکردەوەو دانەیەکیشی بۆ من نارد. پاش خوێندنەوەی مۆرێکی لە قوڕ دروستکراوی سەردەمی ساسانی کە لە کنگاوەر دەرکەوت بەهۆی دوکتۆر گرووپەوە خوێندرایەوە، گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە لە سەردەمی شاە پیرۆزدا، ئاتەشگایەك لە سەروو بەرزاییەکەی کنگاوەرەوە هەبووە پەیوەندی هەبووە لەگەڵ ئاتەشگای موغەکان و جەمسەری ئاتەشگای گەورەی نەهاوەندا.

هەڵکەندنی ناوچەکە و بوونی شوێنگەلێکی پیرۆز، پەیوەندی ئاتەشگای گەورەی هەمەدان (ئەهمەتان) و نیماوەند (نەهاوەند)ی سەلماندووە نیشانە و نووسینەکان و ناوە تاکەکانی لە هەرسێ سەردەمەکەدا لەسەر بەردەکان هەڵکەنراون و بێگومان قوربانی و نەزرکردنی باوەڕداران لە پێناوی دابینکردنی بەرژەوەندییەکان بۆ بنیادنانی پەرستگا بووە، لە حاڵەتێکدا نیشانەکانی سەر بەردەکانی کۆشکی خەسرەوی پەروێز لە بێستووندا (پاشماوەی بەردە پەرت و

بڵاوەکانی پەروەندیدار بە دیوارەکەی خسرەو) نیشانەی بەردەکانە وەك ئەو نیشانانەی کە لەسەر بەردەکانی تەلاری گەنجینەی (تەختی جەمشید و پاسارگاد کە لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوەو بەگشتی نیشانەی بەردکاران بووە.

لەبەر ئەوەی بینای کنگاوەر تایبەت بووە بە شوێنی خواپەرستییەوە و لە سەردەمی ساسانییەکاندا کراوە بە ئاتەشگا، یارمەتی و کۆمەکی خواپەرستان ڕۆڵی هەبووە لە نوێکردنەوەو دروستکردنەوەیدا، دیارە لە هەر سەردەمێکدا، باوەڕداران لە نوێکردنەوە و دروستکردنی شوێنە پیرۆزەکاندا بەبێ ناوبردنی خۆیان یارمەتیانداوە تا ئەمڕۆش ئەمە هەر هەیە، هەر لەبەر ئەم هۆیەیە کە هەموو نیشانە و ئەو ناوانەی هەڵکەنراون لە هەرسێ سەردەمەکەدا لەسەر ئەو بەردانەی دیوارەکانیان پێ پڕکراوەتەوە هەروا بە نەزانراوی ماونەتەوە، ئەگەر کۆشکێك وەك ئەوەی بێستوون دروست بکرایە یا وەك تەختی جەمشید ئەوا نووسینەکان لەسەر بەردێ:ی سافکراو هەڵیان دەکۆڵی.

## دروستکردنی پەرستگا سەردانە پۆشراوەکانی سەردەمی هەخامەنشییەکان لە سەرەتاوە تا ساڵی 404ی پێش عیسا

لە سەرەتادا، کنگاوەر وەك شوێنێکی گونجاو لە شێوەی ئاسایی و پەرستگا سەردانەپۆشراوەکانی هەخامەنشییەکان، دانرابوو چونکە ئەو شوێنە بەو هەموو جوانییە کە خوا پێی بەخشیوە لەگەڵ کانیاوی ئاوی شیرین و بەرزایی، بەکارهێنراوە بۆ بەرپاکردنی ئاتەشگای پیرۆز بۆ ئەوەی ئەرکە ئایینییەکان بە ئاسانی جێبەجێ بکرێن.

لە ناوچەی مادی گەورەدا و لە دەوروبەری گۆڕە پیرۆزەکانی سەر شاخەکان کە پێشینەیەکی کۆنیان هەیە، بە پێویست زانراوە بیناگەلێك دروست بکرێ کە پیرۆزی شوێنەکە زیاتر بکات و هەست بەوە کراوە کە لەلایەنی سیاسی و ئابوورییەوە لە قەراخ ئەو ڕێگایانەی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا لە ناوچەی دەسەڵاتی شاهەنشاییەوە سوودمەندە.

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەردەشێری یەکەمی هەخامەنشیدا ساڵانی (465-424)ی پێش عیسا، هیرودۆت مێژوونووسی یۆنانی دەستی کرد بە گەشتێك لە ناوچەی ڕۆژئاوای فەرمانڕەوایی شا لە ئاسیا بچووکدا و دەستی کرد بە نووسینی کتێبێك لەسەر بیروباوەڕی

ئایینی ئێرانییەکان دەنووسی (دروستکردنی شوێنی قوربانی کردن و پەرستگا لای ئەوان نەبووە بە نەریت و ئەوە بەڕێوڕەسمێك دەزانن کە لە ئەنجامی نەزانی و کەم فامییە و پەیدابووە، بە پێچەوانەی یۆنانییەکان. ئەوان باوەڕیان بەوە نییە کە خواکان وەك مرۆڤ وان،

هەروەها باوەڕیان بە ئاهورامزدا هەیە کە هێمای گومەزی ڕەنگ شینی ئاسمانە و گەورەی زانایە. ئەوان داب و نەریتیان وایە کە بچنە سەر بەرزترین لوتکەی کێوەکان و لەوی لە خوا بپاڕێنەوەو قوربانی بۆ بکەن بۆ خۆر، مانگ، زەوی، ئاگر، با، و هەموو دروستکراوەکانی خوا، ئەمانە تاکە ئەو خوایانە بوون کە بەبێ پەیکەر ئێرانییەکان لە سەرەتادا پەرتوویانن و قوربانیان بۆ کردوون).

پارسەکان (هەخامەنشییە پێشووەکان) و مادەکان بە گوێرەی بەڵگە مێژووییەکان لە سەدەی هەشتەمی پێش عیساوە، بۆ پەرستنی خوا دەچوونە شوێنە بەرزەکان و تا ئێستاش لە سەدەی بیست و یەکدا زەردەشتییەکانی ئێران لەکاتی زیارەت کردن و جەژنە کۆنەکاندا دەچنە کوێستانەکان ئەرکەکانیان جێبەجێ دەکەن، بەلای ئێرانییەکانەوە قوربانی کردن بەرات و بەخششێکی ساکارو سادە بوو لە نان و سەوزە و نزاو سروود.

(ئیسترابو) دەربارەی قوربانی کردنی ئاژەڵی لای پارس و مادەکان دەڵێ: قوربانییەکانیان لە دەرو دەشت جێبەجێدەکرد و وایان بە چاکدەزانی کە لە شوێنێکی بەرزو سەکۆیەکدا بێت، ئەوان نان و سەوزەیان لە شوێنێکی پاکدا بە ناوی ئەو خوایەوە کە خۆیان مەبەستیان بوو دادەنا و بەرامبەر بە ئاگرەکە دەستیان دەکرد بە خواپەرستی.

ئەو لە کتێبی پانزەهەمی خۆیدا دەگێڕێتەوە دەڵێ بەردی بینای پەرستگای گەورەی پارسەکان لە (زیلا) کە کۆرشی گەورە لە ناوچەکانی رۆژئاوای ئاسیای بچووکدا دروستی کرد، لەسەر تەپەو گردێکی دەستکرد بووە کە بە هەرچوار دەوریا شوورەیەکی ساکاریان دروستکرد و هەموو خواپەرستەکان بۆ قوربانی کردن و خواپەرستی سەردەکەوتنە سەر ئەو تەپەیە و لەسەر بەرزاییەکە کە ڕێوڕەسمی ئایینی خۆیان جێبەجێدەکەن و بە ئامادەبوونی موغەکە و خوێندنی سروود و دوعا و نزا. پیرۆزی کێوەکان بەهۆی بوونی پەرستگاوە نەبووە، هەر لەبەر ئەوەشە (نووسینەکەی داریۆش لەسەر شاخی بێستوون پەیوەندی هەیە بە (گاوسان)ەوە. داریۆش لەو پەرستگایانەی کە (گئوماتا) وێرانی کردبوون بەناوی (ئایادان) کە بە دانانی شوێنی قوربانی کردن و خواپەرستییە لە نووسینەکەدا باسی کردووە. لە زاراوەی پارتییەکاندا (ئایازانا) و (ئایزن)یش گوتراوە. لە زمانی بابلیدا ئایاداناواتە ماڵی خوا، بە ئیسلامیش پێیان

گوتووە (سیان ناپ-پانا)، ئەویش هەر بە مانای ماڵی خوای سەرنەگیراوی پارسییەکان کە لەو شوێنەدا ئەو پارسانەی سەر بە ئایینی زەردەشتی، لە تەنیشتی کوانوی ئاگردا لە شوێنێکی سەرنەگیراودا دەستیان دەکرد بە جێبەجێکردنی ئەرکە ئایینییەکان.

لە زمانی پارتیدا هەم گوتراوە (مەهێن) کە لە ئەرمەنییەوە وەرگیراوە. لەگەڵ ئەم حاڵەتەشدا گوتراوە (بغینە) شوێنی بوغ کە بە پەرستگاکانی ناهید گوتراوە. هەروەها لە زاراوەی پارتەکاندا گوتراوە (بوغ ئیل) کە لە زمانی عیبرییەوە وەرگیراوە بە مانا ماڵی خوا.

(بەرزە مەوان) لە فارس کۆنەوە وەرگیراوە (بەرز مەنیی) کە شوێنێکە بۆ جێبەجێکردنی ڕێوڕەسمی ئایینی بۆ ئەو کەسانەی باوەڕیان بە ئایینی زەردەشتی هەبووە. بەم جۆرە هەموو بەیانییەك لە شوێنێکدا کە تەنیا دیوارێکی شێوە حەساری بۆ کرابوو سەرکردەی ئایینی ئاگرێکی ئەکردەوە. ئەم شوێنەی خواپەرستی تایبەت بوو بە سەربازە زەردەشتییەکانی ئێرانەوە کە لەگەڵ ئەردەشێری یەکەمدا چووبوون بۆ میسر. ئەو پەرستگایە لە ساڵی حەوتەمی فەمانڕەوایی ئەردەشێری یەکەمدا واتە ساڵی 458ی پێش عیسا دروستکراوەو لە ساڵی 1903دا نووسینەکە کە بە زمانی ئارامی بوو لە شاری ئەسوان لە میسر دۆزرایەوەو لە ساڵی 1966 زانای رووسی (بوگولیوبۆڤ) تابلۆکەی خوێندەوەو مەسەلەکە بڵاوبوویەوە ئێستا ئەو تابلۆیە لە مۆزەخانەی قاهیرەیە.

لە نێو تابلۆکانی تەختی جەمشیددا، بەردێکی نووسراو دۆزرایەوە لە نزیك تەختی جەمشیدەوە دەگەڕێتەوە بۆ (خشایار شا)، لە بڕگەی پێنجەمی نووسراوەکەدا هاتووە: لەم وڵاتەدا شوێنێك هەبوو بۆ پەرستنی دێوەکان، پاشان لەسەر خواستی ئاهورا مەزدا، من ئەو پەرستگایەم وێران کردو بە خەڵکم ڕاگەیاند لەمەودوا نابێ کەس دێو بپەرستێ، لەو شوێنەدا کە پێشتر دێویان ئەپەرست، من لە جێگای ئەوەدا بەخۆ بە کەمزانی و بچووکییەوە (ئاهورامەزدا) و (ئارت)م دەپەرست. لە بڕگەی دوای ئەوەدا هاتووە: ئاهورامەزدا و ئارت بپەرستە، گیرشمن لای وایە کە مەبەست لە ئاماژە کردن بۆ خشایار شا پەرستگاکەی (نوشیجان)ە لە مەلایر. بەڵام ئەستروناخ لە گۆڤاری ئێران ژمارە 12-1974 بۆچوونەکەی گیرشمەن بەڕاست نازانێ.

لە نێو سنوورە سیاسییەکاندا، شوێنی ئەنجامدانی ڕێوڕەسمی ئایینی و ئاگرکردنەوە لە ئاتەشگاکاندا هەبووە، بەڵام هیچ جۆرە پەیکەر و نیوە پەیکەرێك لەو شوێنانەدا نەزانراوە، چونکە هیچ کاتێك لە ساڵنامەکانی ئاشوورییەکاندا بەڵگەیەك نەهاتووە باس لە تاڵانکردنی

پەرستگاکانی سەردەمی پارس و ماد بکات و باسی بردن و گواستنەوەی پەیکەری خواکان بکات، کەچی شەڕو شۆڕ و تاڵانکردنی پەرستگاکان و بردن و گواستنەوەی پەیکەری خواکانی بابلی، ئیلامی، ئاشووری، ئورارتویی لەو شوێنانەدا شتێکی باوبووە،

لەبەر ئەوە نەریتی خواپەرستی لە شوێنی سەرنەگیراو و کوانووی ئاگر، بەبێ بوونی پەرستگای سەرداپۆشراو لە سەردەمی مادو پارسەکاندا وەك خۆ ماوەتەوە، هەروەها گۆڕستانی ژێر زەوی و ڕێوڕەسمی شاردنەوەی مردوو لە کوپەداو هێمای ئاگرو کەوان و ئاهورا مەزداو خۆرو مانگ و ئەستێرە لە هەردوو سەردەمەکەدا لەگەڵ جیاوازییەکی کەمدا، چوون یەك بوون.

کۆن ناسانی چل ساڵ پێش ئێستا، کە لە شوێنەواری پاسارگاد خەریکی لێکۆڵینەوە بوون، لەسەر سەکۆی پیرۆزی شوێنەکەدا دووپایەی بەردیان دۆزییەوە کە هێمای کوانوی ئاگر و ئاوبووەو ئەوەشیان ڕاگەیاندووە کە ئەو سەکۆیە شوێنێك بووە بۆ جێبەجێکردنی ئەرکی ئایینی لای پەیڕەوانی ئایینی زەردەشتی. دیارە پێش ئەم زانا دێرین ناسانە کەسانێکیتر وەك ئارومان، هرنسفلد، گرار و چەندینیتر دەربارەی بەکارهێنانی ئەو پایە بەردانە، بۆچوونێکی لەو جۆرەیان هەیە و کوروشی گەورە لە سەدەی شەشەمی پێش عیسادا بە شایەکی ئازادیان داناوەو بڕیارێکی داوە کە موغەکانی زەردەشتی، هاوڕێ لەگەڵ موبەدە پارسییەکان لە فەرمانڕەوایی تازە سەرهەڵداوی کوروشدا ڕۆڵی ڕێبەرانی ئایینی بگێڕن بە یەکەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا کە پەرستنی زەردەشت و ئاهۆرامەزدا لە سەردەمی کورۆشی گەورەدا، لە ریوایەتە مێژووییەکاندا باس نەکراوە، بەڵام نووسراوەکانی داریۆش و خەشایار شا هەموو جارێك بەناوی ئاهورا مەزدا دەستی پێکردووە کەچی هیچ ناوێك لە زەردەشت نەبراوە. ئەو یۆنانییانەی کە لە سەدەی شەشەمەوە ڕاستەوخۆ ئاگاداری کاروباری ئێرانییەکان بوون، باسی ئەوەیان کردووە کە شاکانی هەخامەنشی، ئامۆژگاری و ڕێنماییەکانی زەردەشتیان جێبەجێ کردووە. لە میانەی ئەو باسکردنەی هێرودوت دەربارەی ڕێوڕەسمی ئایینی ئێرانییەکان لە سەدەی پێنجەمی پێش عیسادا پەیڕەویان کردووە، هاتووە کە لە راستیدا لەگەڵ نەریت و ڕێوڕەسمی ئایینی زەردەشتیدا چوون یەك بوون.

ئێمە دەبێ چاوەڕێی ئەنجامی کنە و پشکنین بین لە هەمەداندا کە گرنگترین شوێنی مادەکان بووە لەگەڵ تەپە و قەڵای سەقز کە لە دوای ڕۆژدا ئەندام دەدرێ، بە گوێرەی ئەمە مادەکان و پارسەکان لە شوێنی پاك و کراوەی بەرزو چوارگۆشە و لە کەناری سەرچاوە ئاوییەکان، دەستیان کردووەبە ئاگرکردنەوە لە کوانوویەکی سێ پلەکانەداو بە دڵسۆزی

دەستیان کردووە بە جێبەجێکردنی ئەرکە ئایینییەکان و خواپەرستی و لە ڕێوڕەسمی جەژن و بۆنە وەرزییەکاندا دەچوونە سەر لووتکە بەرزەکان. لێرەوە دەتوانین ئەوە پەسەند بکەین کە بە خۆڕایی نییە ناوی غستان واتە شوێنی بوغەکان کراوە بەناوی کوێستانی پڕ شکۆی بێستوونی ئەمڕۆ.

ئەم شاخە کە لەناو جەرگەی سەر زەوی مادەکاندایە و کەوتووەتە سەر شاڕێی ئاسیای ناوەڕاست-خوراسان، هەمەدان، کرماشان، بۆ کۆبوونەوەی هەموو خێڵ و تیرەکان گونجاو و لەبەرچاو بووە. سەرچاوەی ئەو ئاوەی کە لە بنی ئەو شاخەوە دێتە دەرو هەڵدەقوڵێ، ئەو شوێنەی بە شێوەیەکە سروشتی بۆ پەرستنی خوا ئامادەکردووە. لە هەمەدانەوە تا دەگەیتە کرماشان دەتوانیت دایبنێیت بەسەر زەوی کانیاو سەرچاوەی زۆر. کانیاوی بێستوون لەژێر شاخەکەوە لە ژێر تاقی بێستوونەوە دەرئەکەوێ. لە کنگاوەر سەرچاوەی فش، ماران، و سەرچاوەگەلێکی زۆر لەژێر زەوییەوە هەڵدەقوڵێ بەشێوەیەك کە لەهەر شوێنێکدا هەندێجار چەندین کانی هەڵدەقوڵێ و هەر شوێنێك 200-100 مەتر پان و قووڵە کە ئاماوەکانی ئەمانە هەمووی دەڕژێنە ناو رووبارەکانەوە.

## دروستکردنی پەرستگای سەرداپۆشراوی ئەناهیتا

## لە سەردەمی ئەردەشێری دووەم هەخامەنشییەوە تا 358-404 پێش عیسا

بە گوێرەی نووسینی (پلوتارك)، ئەردەشێری دووەم کوڕی داریۆش لە پەرستگای پاسارگاد کە پەیوەندی هەیە بە ئانای تیسی خوای یۆنانییەکانەوە ڕێوڕەسمی زەردەشتیانەی تاج لەسەر نانەکەی، بەهۆی موغە پارسییەکانەوە ئەنجامدراوە. لە پاسارگادی ئەمڕۆدا پەرستگایەك جگە لە سەکۆ پیرۆزەکە لەگەڵ کوانوو ئاگردانە چەند پلەیەکدا و پایەیەکی بەردین کە هێمای ئاناهیتایە هیچ بینایەکیتر نییە. لەبەر ئەوەی شا باوەڕی بە ئایینی زەردەشتی بووە لەگەڵ جۆرە پەیوەندییەك لەگەڵ ئاناهیتادا، هیچ دوور نییە کەوا بیر بکرێتەوە، کە لە هەمان شوێندا، دوای ئەوەی کە دەسەڵاتی وەرگرتووە، خەیاڵ لەوە بکاتەوە پەرستگایەکیتر دروست بکا بۆ خوای ئێرانی-ئاوێستایی ئاناهیتا (ئانافی تیس)، هەرچەندە موغە پارسییە زەردەشتییەکان لەگەڵ دروستکردنی ئەو پەرستگایەدا نەبوون، بەڵام لە دواییدا ناچار بوون لە بەرامبەر شادا، لە تەنیشت ئاهۆرا مەزدا، ئاناهیتا و میترا دابنێن، تا کار وایلێهات لە

ڕۆژئاوای ئێراندا، پەرستگای سەربەخۆ و تایبەت بۆ ئەناهیتا دروست بکرێ. کەچی ئەردەشێر لە سەکۆکەی تەختی جەمشیددا شوێنێکی نوێی بۆ خۆی زیاد نەکرد و تابلۆیەکیشی لەسەر هۆی بەجێنەهێشت، بە پێچەوانەوە لە دووری چوار کیلۆ مەترەوە لە شووش پەرستگایەکی ئاگرپەرستی دروست کرد و هەروەها چوار تابلۆ لە شووش و یەك تابلۆ لە هەمەدان هەڵکەندووەو بە پێچەوانەوەی شا پێشووەکانی خۆی و باو و باپیرانی خۆیەوە، کەتیبە و تابلۆیەك لە شووش و یەك تابلۆ لە هەمەدان کە دەپارێتەوە لە ئاهورامەزداو ئاناهیتاو میترا، هەڵکۆڵیوە لەسەر بەردی تابلۆکە، بەڵام ئەو شایانەی پێش ئەو تەنیا ناوی ئاهورا مەزدایان بردووە ئەردەشێر ئەم ڕێوڕەسمەی خستووەتە ژێر پێی خۆی و لە دوو تابلۆدا ناوی ئاناهیتاو میترای هێناوە لەگەڵ ناوی ئاهورا مەزدادا. مێژوونووسان باوەڕیان وایە کە ئەردەشێر لە ژێر کاریگەری (پری ساتیس)ی دیکیا ئەم ڕێوڕەسمەی خستووەتە لاوە.

بەهەر حاڵ ئەردەشێری دووەم جگە لە پەرستگای ئاناهیتای هەمەدان و شووش، پەرستگای ئاناهیتای (هی پای پا) لە دووری بیست و پێنج کیلۆ مەتر لە باشووری ڕۆژئاوای (سارد) دروستکرد و بە دوای ئەودا وەجاخ زادە پارسەکان.

ڕۆژئاوای ساردو پاش ئەو وەچاخزادەکانی پارس و ناوچەکانی لیدیە (باشووری ڕۆژئاوای ئەنادۆڵ)، سێ پەرستگایتری ناهیدیان دروستکرد بە ناوەکانی (سەری چەم)، (گوڵ مەڕ مەڕە)، (فیلادلفیا) وەك چاولێکەری. کوروشی بچووك، برای ئەردەشێری دووەم، کە بیروباوەڕێکی وەك ئەردەشێری هەبوو، لەو ماوەیەدا کە فەرمانڕەوای لیدیە بوو واتە ساڵی 401 تا 407ی پێش عیسا، پەرستگای ئاناهیتای (هیرەکومە=گوندی پیرۆز)ی دروستکرد کە کەوتبووە سەر ڕووبارێك. زۆرتری ئەو پەرستگایانەی ئەناهیتا کە ئەردەشێری دووەم بەجێیهێشتن لە شارگەلێکدا دروستکراون کە ئاوەدان بوون و تاوەکو ئێستاش هەر ئاوەدانن، وەك ئەو پەرستگایانەی لیدیە کە لە چەند دێڕی سەرەوەدا باسکران و لەناو سنوورە سیاسییەکاندا وەك پەرستگای ناهیدی شووش و هەمەدان کە هەردووکیان خاوەنی تابلۆ و نووسراوی ئەردەشێری دووەمن.

پروسوس، پیاوی ئایینی و مێژوونووسی بابلی لە سەدەی سێیەمی پێش عیسادا لەم بارەوە دەنووسێ: پاش ماوەیەکی دووردرێژ کە ئێرانییەکان تەنیا ناوی ئاهورامەزدایان دەبرد، دەستیان کرد بە پەرستنی پەیکەرگەلێکی شێوە مرۆڤ، ئەردەشێری کوڕی داریوش دەرگای ئەم نەریتەی کردەوە، ئەو یەکەمین کەسە کە پەیکەری ئەفرودیت ئانائی تیسی لە بابل و شووش و

ئەکباتانە و باکتریاو دیمەشق و سارد دروستکردو خەڵکەکانی بانگ کرد بۆ پەرستنیان. لە (پولبیوس)یش گێڕاویانەتەوە کە (ئانتیوکوسی سێیەم)ی سلوگی لە ساڵی 209ی پێش عیسادا، هێرشی کردە سەر پەرستگای ناهید لە هەمەدان و تالآنی کردو چی خشتی ئاڵتوون و زیوی تیابوو لەگەڵ داری بنمیچەکە و رووکەشی ستوونەکانی گواستەوە.

سەبارەت بە پەرستگای ئاناهیتای کنگاوەر لە سەردەمی هەخامەنشییەکاندا هیچ زانیارییەك لە بەردەستدا نییە. کتێبەکەی (ئێزیدور خاراکسی) بەناوی (ئیستگاکانی پارت) تەنیا پەیوەندی هەیە بە ساڵی (37)ی پاش عیساوە کە باسی رووداوەکان و پەرستگاو رێگاکانی پارتی و هەروەها پەرستگای ئارتمیس لە کنگوبار لەو سەردەمەدا دەکا. ئاناهیتا، خواکانی ئاو و خواکانی ئاویستایی کە ئەدەشێر بەو ناوانە لە نووسینەکانی خۆیدا ناوی هێناون، هێمای رووباری ئاو زۆرو سەرچاوەکان ناوەکەی لە سێ بەش پێکهاتووە، شێدار، بە تواناو بەهێز، پاك و بێگەرد، بە گوێرەی ئەوەی کە لە (ئابان یەشت)دا هاتووە، ئاناهیتا وەك پاسەوانی ئاوی بەهەشت و خەیاڵییەکە سەرچاوەی هەموو ئاوەکانی سەر زەوییە، ناهید لە ئابان یەشت کە جوانترین و شاعیرانەترینی یەشتەکانە،

سەرچاوەی هەموو ئاوەکانە کە بۆ خۆشحاڵی و رازی بوونی ئەو چەندەها قوربانی کراوە، بۆ ئەوەی ئاوی سەرچاوەو کانییەکان زۆر بن و دانەوێڵە و سەوزە گیاو مەڕو مالآت زیاد بکەن و لە ئەنجامیشدا زاوزێ و بەرهەم زۆر ئاسان دەبێت، ئەو خاوەنی هەزار دەریای بچووك و هەزار رووبارە کە هەریەك لەوانە بەدرێژایی مەودای رۆیشتنی چل رۆژ رۆیشتنی سوارچاکێکە. (یەشت101-5)

لەپێش زەردەشتدا، سك و زاکردن و بەرهەمهێنان پەیوەندی هەبوو بە (ئەشی)یەوە کە هاوتای ئاناهیتای ئاوێستایی و خوشکی (سروش)ی هاوتای میترایە کە بە گوێرەی ئەفسانە ئێرانییەکان هەردووکیان کوڕی ئاهورامەزادن و لە خوای نیوە نێرو مێی (زەروان) پەیدا بوون کە دروستکەری چاکەو خراپەیە لە جیهاندا، لە گەڵێك لەسەری سنجاقە برونزییەکاندا کە لە درزو پەنای خشتی دیواری پەرستگای (سرخدم)ی لوڕستان کەوتوونەتە دەست، ئەشێ لە حاڵەتی مناڵ بوون یا راوکردندایە، نەخشەکانیش بریتین لە مەڕەکێوی، گاکێوی، گوڵە هەنار، ماسی کە ژنە نەزۆکەکان نەزریان دەکرد بۆ ئەوەی مناڵیان ببێ، ئەو نەخشەیەی لەسەر کلآوی (ئانتیوکۆس) کراوە لە (نەمردو داغ)دا میوەی درەختی هەنارەکە لای زەردەشتییەکان مانای

بەرهێنان و سکوزار دەگەیەنێ و لە بۆنە تایبەتەکاندا خواردوویانە، لە بەڵگە بابلی و ئیلامییەکاندا، ئەم خوایە بە (ئیشتار) و (نانا=نەنەی) ناوبراون کە خوای عیشق و شەڕەو لە ئەفغانستانی کۆندا ئەم خوایە ناوی (ئای خانم) و لە (سوغد) بە (نەنەخاتوون) ناوبراوە.

(پلوتارك) کە ژیاننامەی ئەردەشێری دووەمی نووسیووەتەوە (ئەناهیتا)ی بە (ئانائی تیس، دیانا، ئارتمیس) ناوبردووە ئەم ناوانەشی کاتێ بەکارهێناوە کە ئەردەشێر،

(ئاسپازیا)ی وەك ژنێکی خزمەتگوزار دانا بۆ پەرستگای (ئارتمیس)ی ئەکباتان کە خاوەنی ناوی (ئانائی تیس) بووە. زۆرترین ئەو پەرستگایانەی لە سەردەمی ئەردەشێری دووەمدا لە (لیدیە) دروستکراون پەیوەندییان هەیە بە (ئاناهیتا)وە، خەڵك ئەو پەرستگایانەی بە ناوی (ئارتمیس) یان پەرستگای پارسی ناوبردووە، هەندێجار گووتوویانە ئارتمیس ئانائی تیس و هەندێ جاریش ئارتمیسی پارسیان پێوتوون. ناوی ئاناهیتا و میترا لە ئاوێستاییدا بەشێوەی (ئاپولو ئارتمیس) وەك براو خوشك لە یۆنانی و بەرامبەر ئەفسانەی ئێرانی کۆن (ئەشی و سروش)ە،

پووختەکەی ئەوەیە ئارتمیس ئانائی تیس، شێوەی یۆنانی-ئاسیایی ئاناهیتای ئاوێستاییە، لەگەڵ ناوبردنی جۆراوجۆری ئەم خوای ئاوانە بە جۆرێکی گشتی شێوەی ئێرانی ئەم وشەیە لە زاراوەی یۆنایی (ئانایتی) و پەهلەوییەکەی (ئاناهیت) و ناهیدە فارسییەکەیە.

لەگەڵ باسکردنی ئاناهیتای ئاوێستایی بە پەیوەندی لەگەڵ ئاو و ژیان و مانەوەدا، دەردەکەوێ کە بینایەکی گەورەی لە جۆری بینای کنگاوەر لە دەوروبەری هەزار و سەد ساڵ پێش هاتنی ئیسلام لە شوێنێك و بەرزاییەکدا دروستکراوە کە لە ژێریدا سەرچاوەو ئاو هەبووە کە نیشانەی ژیانە و هۆی ژیانی لە بەردێکی گەورەو تایبەت بە بواری ئایینی دەرهێناوە. ئەم بینا ئایینییە کە لە شوێنێکی بەردەڵان و بەرزایی کنگاوەردا لە سەدەی پێنجەمی پێش عیسادا کراوە وەك پەرستگایەکی سەردانەپۆشراو سەرنجی خەڵکی راکێشاوە. لە سەرەتادا بە بەردی گەورەو بچووك بە شێوەی سێ بەرزایی چوارگۆشە یا سێ چینی پلە لەسەر پلە. بەم جۆرە چاڵاییەکان بە خاك و خۆڵ پڕکرایەوەو بەرزاییە تاریکەکان تەخت دەکرێن (ماکێتی بەردینی بەرزاییەکە بە شێوەی سێ پلە کەوتوونەتە دەست).

لە ئایینی ئەفسانەیی ئێرانی کۆندا، بنیاتنانی یەکەم شاری ئاوێستایی (ورجمکرد)ە، کە ئاهورامەزدا فەرمانی داوە بە (یاماخشییە-جەمشید شاە) کە دروستی بکا، و دەڵێ: (ئەی جەم هور چهر، کوری و یونگهان، سەختترین وەرزی زستان روودەکاتە ئەم جیهانە ئەوەندە تووش و سەرمایە مردنی بە دواوەیە)،

خانوو و باخێك دروست بکە کە هەریەك لە چوارگۆشەکەی بە درێژایی یەك (ئەسپرس=ئەسپریس) بۆ ژیانی خەڵك بە چوارگۆشەیی، لە ناویا ئاوی سەرەو ژێر بە جۆگایەکدا لەوێ باڵندەی سەوزە خۆشحاڵ، خانووگەلێکی لەسەریەك، تا کۆتایی...، ئەم کارە بە پاشنە پێوەو بە دەستی بورز بکوترێتەوە. وەر (وەردنە) بە مانا گوندو شارەو لە ئاوێستای دواییشدا (ویس) هاتووە، (وەر) بە مانای باخ و دیوار و خانووە، بەڵام لێرەدا دیمەنی شارو گوند دەبەخشێ. وشەی ئەسپرسا و ئەسپریس بۆ پێوانە و بەرامبەرە بە درێژی گۆڕەپانێکی ئەسپ تاودان.

### هەندێ شیکردنەوە:

أ) رووبەری چوارگۆشە (یەکەمین شێوازی شارەکان بووە لە ئێرانی کۆنی سەردەمی مادو پارس و هاوچەرخی زەردەشت و چوارگۆشە بووە.

ب) دابەشکردنی ئەم رووبەرە چوارگۆشەیە بە سێ بەش لە بەرزترین شوێنی لووتکەکەی.

ج) بەشی ناوەڕاست. د) بەشی خواروو.

لە راستیدا ئەم شارە ئەفسانەییانە سێ چین خەڵکیان تیا ژیاوە، پیاوە ئاینییەکان لە سەرەوە، پیاوانی سوپا لە ناوەڕاستدا جوتیارەکانیش لە چینی خوارەوە دانیشتوون. نەخشەی هەموو ئەو خانووانەی لە سەردەمی مادو پارسەکاندا کە هاتوونەتە ئەم خانووانە دروستکراون چوارگۆشە و لەسەر بەرزاییەکان بوون کە نموونەیان لە پاسارگاد، تەختی جەمشید، سەر مەسجید، کنگاوەر هاوشێوەی بینای ئورارتوییەکانە. پەرستگاکانیش لەسەر بەرزاییەکان و تاشە بەردەکان لە شێوەی دیوارێکی چوارگۆشەدا دروستکراون کە لەسەر بەرزترین لوتکەی شوێنەکەدا ئاگردان یا پەیکەری رۆژی تیا دانراوە لەم شوێنە بەرزو پیرۆزەدا لە کۆتایی سەدەی پێنجەمی پێش عیساو سەردەمی ئەردەشێری دووەمی هەخامەنشیدا لوتکەی بەرزاییەکان بە زۆری تایبەت بوو پەرستگای سەرداپۆشراوی ئەناهیتاوە. لە لوتکەی بەرزاییەکەی کەنگاوەردا لە بەرزایی (32) مەتر سەکۆیەك لەگەڵ وردە بەردی رێك نەکراوی کۆن لە ژێر خاکەکەدا دۆزراوەتەوە.

## وردبوونەوە لە کەلتووری بیناسازی

## پاش لە ناوچوونی هەخامەنشییەکان تا سەرەتای سەردەمی ساسانییەکان

## واتە مێژووی 331 تا 224ی پێش عیسا

بوونی دوو رووداوی یۆنانی و ئێرانی لەگەڵ یەکتریدا، هەرچەند بوو بەهۆی ئەوەی یۆنانییەکان بەشێوەیەکی کاتی دەسەڵات بگرنە دەست، بەڵام ئەو دەسەڵات گرتنە دەستە شتێکی تەنیا رووکەشی بوو و بەردەوامیش نەبوو و نەیتوانی درێژە بکێشێ و ئەو بزووتنەوەیە لە ناوەوە رابگرێ، چونکە دوای ماوەیەکی کورت بە تەواوی کلتووری هیلینی خستە ژێر کاریگەری خۆیەوە کە نموونەکەشی لە بیناکانی (ئانیتۆش)ی نەمرود داغ و سوریە و وڵاتی نێوان دوو رووبار کە لەسەر حەفتا کەوتووەتە ژێر کاریگەری شێوازی بیناسازی هەخامەنشییەوە، بەشی زۆری بیناکانی شلوگی، سامی، کۆشانی، کە بە شێوەی پەرستگای سەردانەپۆشراو و نیوە پەیکەریان تێدایە، وەك بینای هەترە، پالمیرا، دورا، ئاشوور، سرخ کتل، ئای خانم، بردە نیشاندە، سەرمەسجید و شامی مال ئامیر.

ئەمانە هەموویان پەیڕەوی شێوەی بیناسازی هەخامەنشی چوارگۆشەیان کردووە، لەم رەوتە مێژوویەدابوو کە پارتەکان لە سەدەی یەکەمی عیسادا کەوتنە خەیاڵی زیندووکردنەوەی رابوردووی ئێرانی هەخامەنشی و سەردەمی ئەردەشێری دووەم، بەم کارەشیان گورزێکیان سرەواندە پەیکەری بێ گیانی کلتووری هیلینی و کلتووری ناوبراویان لە هەموو شوێنەکاندا پەکخست،

چونکە لەو سەردەمەدا لە سندەوە تا قەراغی دەریای فوراتیان خستە ژێر دەستی خۆیانەوەو سەرکەوتن بەسەر شێوازی بیناسازی ئایینیدا و خۆیان رزگار کردو لە بواری بیناسازی و پەیکەرسازیدا، خۆیان لاداوە لە لاسایی کردنەوەی ئەوان.

## پەستگاکانی ئاناهیتا لە سەردەمی ئەشکانییەکاندابیناکردن لە رووبەری چوارگۆشە لەسەر بەرزاییەکان

ئەشکانییەکان کە ئەردەشێری دووەم بە باپیری خۆیان دەزانن لە زیندووکردنەوەی رابوردووی هەخامەنشی و بنیاتنانی پەرستگای ناهید هەوڵێکی زۆریان خەرجکرد، لە هەندێ شوێنی خوزستان، شووش، شووشتەری، ئەو شوێنانەی بەختیارییەکان تیا دانیشتبوون و

هەروەها، ڕێگاکانی باشووری کوێستانی زاگرۆس، چەند پەرستگای وەك پەرستگای ئیزەد ئارتمیس و ئاناهیتای ئێرانی و نانایا=نەنەی بابلییان کرد بە شوێنی خواپەرستی خۆیان.

ئانتیۆکوسی سێیەم لە ساڵی (187)ی پێش عیساو ئانتیۆکوسی چوارەم لە ساڵی 164ی پێش عیسا، بە نیازی تاڵانکردنی ئەو پەرستگایانە کەوتنەڕێ، بەڵام هەردووکیان لە دەوروبەری ئەسفەهاندا، لەلایەن نەتەوەکانی ئەلیمایی پارتییەکانەوە تووشی شکست هاتن و هیچ نەگەیشتن بە مەرامی خۆیان.

چەند پەرستگایەکیتری ئارتمیس و نانایا لە بەرزاییەکانی سەر مەسجید، مەسجید سلیمان و هەروەها لە شامی مال ئەمیر (ایزە) هەبوون. ئەو کەلوپەلانەی کە کنەو پشکنین و هەڵکەندنی کۆنناسی کەوتوونەتە دەست، هەم پاشماوەی پارتی و هەم یۆنانین، بەم شێوەیە پاش سەدەی یەکەمی عیسایی کە پارتییەکان دەسەڵاتی فەرهەنگی هێلینی یان تێکوپێکدا، پەرستگاکانی خۆیان بە ئیزەد ئاناهیتا و ئاگردان رازاندەوەو زیاتر روویان کردە دروستکردنی بینای چوارگۆشەیی و هەیواندار، لە نەسا، (عیشق ئاباد)، پەرستگایەکیان دروستکرد ئەشکانییەکان پاش سەدەی یەکەم و دووەم لە بەرپابوونی ئارامی، لەوێ پەرستگایەك و گۆڕستانێکیان دروستکرد. لە سەردەی یەکەمی پاش عیسا نەخشەی دیوار و خانووی چوارگۆشەیی لە باشووری شاری نەسادا خرایە لاوەو هەیوانی کەوانەیی شێوەیان دروستکرد پاشان هەمان نەخشەیان لە وڵاتی ئاشووردا (وڵاتی نێوان دوو رووبار) بە شێوەی چوارگۆشە، لەگەڵ چوار هەیواندا کە دەیڕوانی بەسەر حەوشە ناوەندییەکەدا دروستکرد، کە پاشتر مزگەوتی چوار هەیوانی ئەم نەخشانە وەك نموونەیەك پەڕەوکرا.

لە سەردەمی پارتییەکانا پەرستگای ئاناهیتا لە شووش و ئەکباتان کە ئەردەشێری دووەم (385 تا 404)ی پێش عیسا خستبووە کارو رووی تێکردبوو ئیتر نەما، زڕەنگە بەهۆی ئەوەوە کە ئاتەشگاکان گرنگی زیاتریان پێدەدرا، نەخشی بینای کنگاوەریش هەر چوارگۆشە بێت و ڕێگەی چوونە ناوەوەی پەرستگاکە، لەو پلەکانە دوولایەوە بوو بێت کە لە باشوورەوە دەتوانی بچێتە سەر بەرزاییەکە و بەرزترین خاڵی سەکۆکە شوێنێك بووە کە لە سەردەمی پارتەکاندا بە ناوی ئەو پەرستگایەوە ناونرابێت.

بێگومان دەبێ ئەوە بڵێین کە پلەکانەی دوولا، پاشماوەی پارسییەکانە لە بیناساوی ئێراندا و هاوتای ئەوە لە شوێنێکیتر نەبینراوەو وێنەی نییە و نەبووە، نەخشی چوارگۆشە و پلە پلە، ئاگر، ئاو و هەوا، پلەکانەی دوولا لەسەر بەرزاییەکان لە سەرەتای هاتنی پارسەکان بۆ ناوچەی هەخامەنشییەکان هاتە ئاراوە

که نموونەی دەرکەوتووی ئەو بینا چوارگۆشەییەی و ستووندارەکانی پاسارگادو -کۆشکی بەرعام- هەروەها بیناکانی تەختی جەمشید و شووشە.

لە سەردەمی ئەردەشێری دووەمەوە، جگە لە نەخشەی سەرداپۆشراوی پەرستگای ئاناهیتا، نەخشەیتر لە شێوەی پەرستگای سەرداپۆشراوی ئاگر لە بیناسازی هەخامەنشیدا بووە بە باو کە نموونەی بەناوبانگی نەخشەی پەرستگای چوار گۆشەییەکەی (شووش)ە کە بە چوار ستوون و ڕاڕەوێك بۆ هاتووچۆ و هەیوانێکی دوو ستوونی.


سەرچاوە

سیف الله کامبخش فرد

اپار تأریخی ایران

چاپ اول/ 1380، ل167-194

# تیشکێك دەربارەی سەردەمی ژیانی زەردەشت

دەربارەی سەردەمی ژیانی زەردەشت لێکۆڵەران لەسەر پێنج (گاشا) یان (گاهانی پێنجگانە) چەندان تیۆری جۆراوجۆرو ناتەواویان خستوونەتەڕوو کە گەڕان بە دوایاناو لێکۆڵینەوە لەسەریان لە راستیدا دووچاری سەریەشانی کردووین.

داستانە ئاساییەکان سەردەمی ژیانی زەردەشتیان بە سنووری 300 ساڵ بەر لە هاتنی ئەسکەندەر دیاریکردووە بە مانا سنوورەکەی دەبەنەوە بۆ نیوەی دووەمی چاخی حەوتەم تاوەکو سەرەتای چاخی شەشەمی پێش زایین واتە بۆ ساڵەکانی 660 تا 583ی پێش زایین ئەم داستانە لەسەر ناوەڕۆکە پارسییەکە دروستکراوە کە نێوانی (بەندەهشن و دوو بەشەکەی) گرتووەتەوە کە تیایاندا لە دایکبوونی زەردەشت لە مانگی (3) رۆژی شەشەمی مانگی فەروەردین دیاریدەکات کە سەرەتای بەهاربووە لە هەزارەی چوارەمی پێش زایین و تیایدا دونیا دانراوە، بۆ ئەمەش داستانی خەیاڵی ئایینی بەدەستەوە هەیە.

یەکێك لەو بەڵگانەی کە وەڵامە بۆ ئەو داستانە و کاری پێکراوەو بەڕاستی ئەوەی هێناویە دایناوەو چەسپاوە (ویشتاسب) باوکی داریۆشی یەکەمە و (گوی ویشتاسب)، (کی گشتاسب) فەرمانڕەوای ئایینی، یان گەورەی قەومەکەیە و هاوسەردەمی زەردەشتە. ئەمە بۆ کاتێك دەبێت ئەگەر ئەو دوو ناوە بۆ کەسێك بێت و لە سەردەمی داریۆشدا ژیابێت، بۆ ئەمە یەکەمیان بەردە نووسراوەکەی داریۆش هەر بەو جۆرەیە لە ئاوێستادا (ویشتاسب) هاتووە، بەڵام بە (گوی و یشتاسب) باسینەکراوە چونکە بەو شێوەیە نەبووە، دووەم ناتوانین بەو جۆرەی باوەڕ بکەین کە زەردەشت پەیامبەری خواپەرستانە چونکە لە خودی سرودەکانی ئاینیدا (ویشتاسب) کە پارێزگاری لە ئاسایشی شار کردووەو فەرمانبەری داریۆش لە بەردە نووسراوەکەی خۆیدا ناوی ئەوەی بە پەیامهێنەر و دادپەروەری گەورەی سەدەمی خۆی نەهێناوە؟ لەلایەکیترەوە زەردەشت بەپێی ئەو داستانانەی لەناو ئایینی پارسییەکاندا هاتووە هەر لەناو ئەواندا ژیانی بەسەربردووەو (گاهان) خۆشی بە زمانی ئەوان نووسراوە کە بەشێکە

لە (زمنای بەردە نووسراوەکەی هاخامەنشی یان پارسی کۆن) کە پێویستە لە سرودەکاندا ئەوە تێڕوانین بکەین کە لە ئاوێستادا (گوی ویشتاسب) کوڕی ئوروت ئەسپەیە کە (لە هرئەسپە)یەو لە مێژووی هاخامەنشییەکانیشدا بە ویشتاسبی باوکی داریۆشی کوڕی ئارشام خوێنراوەتەوە.

بەرامبەر بەو داستانە زاناکان و ئاوێستاناسان لێکۆڵینەوەیان لەسەر کردووەو پشتیان بە بەڵگەکانی کۆمەڵناسیی و زمانناسیی و هەموو ئەو (ئاگاهانە)ی هەن بەستووە، ئەمانە بەو ئەنجامە گەیشتوون کە سەردەمی ژیانی زەردەشت دەکەوێتە نێوان 1500 تا 800ی پێش زایین، پێشتریش ئەم بابەتە باسیکراوە و بۆ سەردەمێکیان بردووەتەوە لە سنووری هەزارەی یەکەمی پێش زایین کە لەگەڵ رۆژگاری کۆچی ئارییەکاندا بۆ سەر خاکی ئاسیای ناوەند بۆ بەرزاییەکانی ئێران هاوکات بووەتەوە.

(تیدیسکۆ) هەموو ئەو بەڵگانەی داوەتە دواوە یان ئەو تیۆرەی کە سەردەمی زەردەشتی بردۆتەوە بۆ هاخامەنشییەکان بەڵگەی بۆ ئەمە پەنابردنی بووە بۆ (گاهان) کە مەرجەکانی کۆمەڵایەتی و رامیارییان تیادان بە تایبەتی سروودەکان کە لە بنەمادا لە قۆناغی هاخامەنشییەکاندا دەرنەکەوتوون.

لە سەرچاوەی شوێنی لە دایکبوونی زەردەشتەوە هەر بەو جۆرە تیۆری جۆراجۆر هەیە، بەڵام رای جیاواز دەربارەی رۆژگاری ژیانی بەدەستەوە نییە گرووپێك شوێنی لە دایکبوونی ئەو بە (باختەر)دا ئەنێن، کۆمەڵێکیتریش لەدایکبوونەکەی دەبەنەوە بۆ خۆرهەڵاتی ئێران (بە مانا هەمان سەرزەمین کە ئایینی زەردەشتی تیادا بڵاوبووەتەوە)، ژمارەیەکیتریش رۆخی دەریاچەی (چیچست) (ورمێ) یان ئارۆمیە؟) بە شوێنی لەدایکبوونی دائەنێن، بەشێکیتریش وادەبینن زەردەشت لە شاری کۆنی (رگای) یان (رغای) واتە (رەی ئەمڕۆ) چاوی بە دنیا هەڵهێناوەو لە گەورەبوونیدا کۆچی بۆ ئێران کردووە.

لایەنگرانی هیچ یەکێك لەو تیۆرانە بەڵگەی رۆشنیان بۆ چەسپاندنی بەرگری لە رای خۆیان بەدەستەوە نەداوە، زۆرتریش قسەکانیان روونکردنەوەکانیان لەسەریان نادروستانە بووە. لە خودی ئاوێستاش لە (گاهان)دا ئەوەی لە بەشەکانی ئاوێستای نوێدا هاتووە لەو بارەیەوە لەبەردەستدا نییە.

لە جوگرافیای داستان و ئەفسانەکانی ئایینی ئێرانییەکانیشدا لە (ئێران ویج) شوێنیان بەڕاستی نەزانراوە، پێشتریش خاك و رووبارو دەریاچە و دەریا و کێوەکان کە کەتوونەتە خۆرهەڵاتی ئێران شوێنیان بۆ دانراون، بەڵام ئەمانە پرسی لەدایکبوونی زەردەشت لەناویانا رووناك ناکاتەوە تەنیا ئەوەندەیە ناوچەی بڵاوبوونەوەی ئایینەکەی دیاریدەکات.

بەڵگەکانی زمانناسی هەتاکو ئێستا نەیانتوانیوە ئەو تەمومژەی لەسەر لابەرن چونکە ئەوەی هەیە لە لێکۆڵەران و ئاوێستاناسان بەرامبەر بەوەی (گاهان) بخەنە پاڵ کەسی زەردەشت

نەیانتوانیوە بزانن زمانی سروودەکان لە کوێوە هاتووە هەرچەندە لێکۆڵینەوەی جیاجیاشیان لەسەر کردووە، بەڵام زۆرینەیان ناچنەوە سەر یەکتری بۆیە زاناکان بەزۆری باوەڕیان وایە زمانی (گاهان) یەکێکە لە زمانەکانی خۆرهەڵاتی ئێران وەکو بزانم، بەڵام نەمتوانی وەڵامی ئەو پرسیارە بدەمەوە کە: ئایا ئەو زمانە زمانی دایکی زەردەشت بووە یان لە کۆچکردنیا بۆ خۆرهەڵاتی ئێران پێدەچێت لە کۆمەڵگادا بەکارهێنرابێت و زمانی رەسمی و ئەدەبیش بووبێت بۆ سروودە ئاینزاکان بەکاری هێنابێت؟

بەو پێیە ناچارین بەدوای لەدایکبوون و ژیانی بنەماڵەی زەردەشتدا بەگەڕێین، ئەم زانیاریانەش لەسەر ئەندامی لێکۆڵینەوەکانی پێشووتری ئاوێستاناسان وەردەگیرێ لەو شوێنەی زەردەشت ئایینەکەی بڵاوکردووەتەوە لە خۆرهەڵاتی ئێران بۆیە بە بەڵگەوە دەڵێم: زەردەشت کۆنترین دادگەر و شاعیر و خاوەنی بیری ئێرانی بووە لە شوێنێك لەسەر زەمینی ئێران واتە لە خۆرهەڵاتی ئێران دەرکەوتووەو ئایین و پەیامی خۆی ئاشکرا کردووە.

مێژووی سروودەکان کۆنترین بەشی (گاهان)ەکانن لە ئاوێستاد کە بۆ رۆژگارێك دەگەڕێنەوە زەردەشت لە ژیاندا بووە واتە وەکو سەردەم نزیکە لە 1500 تا 800ی پێش زایین کە لەوانەیە بەو شێوەیە بێت، بەڵام هەتاکو ئێستا نازانین کە ئەو سروودانە بۆ یەکەمین جار بە چ زمانێك یان بە نووسینێك بووە؟ ئایە وێنەیی بووەو دوایی گۆڕاوە بۆ نووسین و لەو شێوەیە پەیدا بووبێت.

هەندێك لە ئاوێستاناسان لەسەر ئەو رایەن کە رۆژگارێك زەردەشت لە ژیاندا بووە لەنێوان سەدەکانی 16 تا 9ی پێش زایین تا ئەو کاتە نووسینی ئەلفبایی لە ئێراندا نەبووەو سروودەکانی زەردەشت و داستانە کۆنەکانی بەسەدان ساڵ لە سنگدا ماوەتەوە تا ئەو کاتەی لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکیتر رۆشتووە تاوەکو گەیشتووە بە سەردەمی هاخامەنشی کە نووسینی ئارامە تیادا دەرکەوتووەو لە گەلانی دانیشتووی فینیقیپە و بابل وەریانگرتووە، یان لەوانەیە بۆیان ماوەتەوە.

گرووپێکیتر کە دەستەیەکی کۆنترن باوەڕیان وایە کە نووسینی ئەلفبایی بەر لە هاخامەنشییەکانیش لە ئێراندا هەر بووە، بۆ چەسپاندنی رایەکەیان وەکو نموونە تا بلیتەکانی سۆمەری و بەشەکانیتری بەڵگەی بەهێزیانە.

بۆیە دەتوانین بڵێین: ئەگەر ئەم تیۆرە بەو شێوەیە وەربگرین و بسەلمێنرێت ناتوانین مێژووی یەکەمین نووسینی وێنەیی (گاهان) و بەشەکانیتری ئاوێستا دوورتر لە سەردەمی هاخامەنشییەکان نووسینەوەی ئەم پەرتووکە باسبکەین.

ئەوەی لە باسە ئاساییەکانی ئایینی زەردەشتیشا گەیشتووە ئەوە دەگەیەنێت کە ئاوێستا بە ئاوای ئالتوون لەسەر رووی دە هەزار پێستی خۆشکراو نووسراوەو لە شوێنی تایبەتی خۆی دانراوە. بەلعەمی لەو بارەیەوە دەنووسیّ:

((بەو شێوەیە زەردەشت لەکاتی پادشایەتی (گوشتاسب)دا دەرکەوتوو پەیامەکەی کە لە خوای گەورەوە وەریگرتبوو بلاّویکردەوە، مووغەکانیش بە پادشایەتییەکەی رازیبوون کە (30) سالّی لەو کاتەدا بەسەر بردبوو، کاتێکیش زەردەشت لەو نزیکبۆوە دوای ئەوەش دە سالّیتر پادشایەتیکرد، زەردەشتیش بەهۆی زانیارییەکانی توانی لە دلّی پادشادا شوێنی خۆی بگرێت، باوەڕهێنانیش بە دەعواکەی کە ئاسمانییە سەرچاوەکەی لە چاکە و خراپەوە سەرچاوەی هەلّگرتووەو بانگی بلاّوکردنەوەی داوە.

(گوشتاسب) داوای لە بنووسەکانی کرد ئەوەی زەردەشت دەیلّیّ لە چاکە و خراپە وەحییەکە لە ئاسمانەوە بۆی هاتووەو بە ئاوی ئالتوون بینووسنەوە لەسەر دوانزە هەزار پێستی گاو فەرمانەکەی جێبەجێکرا.

بەو جۆرە (گوشتاسب) ئەو پەرتووکە پیرۆزەی لەناو گەنجینەکەیدا دانا کە خانوویەك بوو لەبەرد دروستکرابوو، بەلاّم ئەمڕۆ لەناوا نەماوەو ئەو کەسانەش لایانە ناتەواوەو هەمووی نییە.

بەپێی باسە ئاساییەکە پەرتووکە پیرۆزەکەی پەهلەوی هاوشێوەی (دینکەرت) و (بەندەهشن) و (ئارداویراف نامە)یەکە لە هێرشێکی ئەسکەندەر بۆ سەر ئێران سووتاوە، خراپی ئەو کارەش دەخەنە پالّ ئەو کەسەی کە نازناوی نەفرەت لێکراویان داوەتیّ. جارێکیتر لە رۆژگاری ئاشکانییەکاندا ئاوێستاکە سامانێکی گەورەی نەتەوایەتی بوو بلاشی یەکەم (ئەشکی بیست و دووەمی پادشای ئاشکانی کە لە (78-51پ.ز) پادشایەتی کردووە فەرمانیدا ئاوێستا کۆبکەنەوەو سەرلەنویّ بینووسنەوە لەگەلّیشیا ئەو داستانانەش کۆکرانەوە کە لە سنگی خەلّکیدا ماونەتەوەو دەیانخەنە پالّ زەردەشت. ئەردەشێری بابەکان یەکەمین پادشای ساسانی بوو (226-241ز) کە فەرمانڕەوایەتی یەکەی لەسەر ئایینی زەدەشت بنیادناو گرنگی تایبەتی بە ئاوێستدا. بەپێی ئەوەی لە (دینکەرت)دا هاتووە، ئەردەشێر فەرمانیداوە بە (تەنەسوور) کە گەورەی ئایینی و دادوەر بووە لە ئایینەکەدا لە رۆژگاری فەرمانڕەوایەتییەکەیدا ئاوێستا کۆبکاتەوە بۆ ئەوەی لەو سامانەدا بەشی هەبێت.

دوای ئەردەشێر جارێکیتر لە رۆژگاری شاپووری دووەم (310-379ز) کە لە جێنشینانی ئەو بوو فەرمانیدا بە (ئازەرپاد مەهر ئاسپندان) کارەکە ئامادە بکاو بە شەپەرت و بڵاوەکانی ئاوێستا لە شوێنی خۆیاندا دایان بنێتەوەو ئەویش کارەکەی تەواو کرد و ئەو بەشانەش کە مانا بەخش نەبوون لە ئاوێستادا نووسینییەوەو پەرتووکی (خوردە ئاوێستا)ی لەسەر هەموو ئاوێستا دانا.

سەرئەنجام لە کۆتایی رۆژگاری ساسانییەکاندا بە مانا لە سەدەی شەشەم یان حەوتەمی زیینی بۆ نووسینەوەی ئاوێستا لە شێوەی نووسینی پەهلەوی دۆزرایەوەو تەواوی بەشەکانی ئەم پەرتوکە بەو رێنووسە دوای کۆکردنەوەیان نووسرانەوە. ئاوێستای رۆژگاری ساسانییەکان (345700) واژەیە و (زەند تەفسیری ئاوێستا)ش (2094200) واژەیە، بەڵام لە ئەمڕۆدا بەشەکانی (گاهان) و (وەندیداد) لەبەردەستدان کە بەشێکن لە چوار بەشی ئاوێستا و ئەوانیتر فەوتاون کە (83000) واژەیە.

لە پەرتووکی پەهلەوی (دینکەرت) لە (نەسکی) بیست و یەکدا کە خراوەتە پاڵ ئاوێستای کۆن ئاخاوتنەکانی زەردەشت بە ئێمە گەیشتووە، بەڵام ئەمانە لە رستەی (نەسکە)کاندا لەدەستچووە، ئەوەی کەوتووەتە دەست (نەسکی) بیست و یەکە، کە دەخرێتە پاڵ ئاوێستا و بە **(3) دەستە بەخشکراوە:**

1- نەسکەکانی گاپانیك لە زانست و کاری بەهەشتدا.

2- نەسکەکانی داتیك لە زانست و دادو کاری دنیاییدا.

3- نەسکەکانی (هات مانسریك) لە ئاگاداری و نزاو سروودە ئایینییەکاندا.

هەموو ئاوێستاش ئێستا پێکهاتووە لە شەش بەش کە ئەمانە دەگرێتەوە:

1- گاهان.

2- یەسنە.

3- یەشتەکان.

4- ویسپەرد.

5- خوردە ئاوێستا.

6- وەندیداد.

لەم وتارەدا هەریەکێك لەو بەشانە و شێوەو ناوەڕۆکیان لە شوێنی خۆیاندا قسەیان لەسەر دەکەین.

دوای هاتنی ئیسلام، بەزۆری پەرتووکە کۆنەکانی ئێران لەوانە ئاوێستا بەهۆکاری نەمانی زمان و ئەدەبیاتیان و نووسینی پەهلەوی ئاوێستایی و خراپی نێوان و پارچە بوونی ئایینی خواپەرستان و ئایینی نوێی ئێرانییەکان لە گۆڕەپانەکەدا دووچاری پەرت و ناڕێکوپێکی بوو. لەو شێوەیەدا بارودۆخەکە مایەوە هەتاکو سەدەکانی چوارەم و پێنجەمی کۆچی جارێکیتر ئاوێستا کەم و زۆر بەهەمان ئەندازەی رۆژگاری ساسانییەکان رووی لە چاکبوون بۆوە.

ئەوەبوو نەتەنیا پەرتووکی پەهلەوی (دینکەرت) کە لە سەدەی سێیەمی کۆچی بەرامبەر نۆیەمی زایینی لەلایەن (ئازەرفەرن بەغ) پیاوی ئایینی هاوسەردەمی خەلیفەی عەباسی مەئموون کۆکرایەوە بەڵکو پەرتووکە گەورەکەی ئاوێستای کۆنیش بە دوو (نەسك) (کتێب) بووە سەرچاوەو لەبەردەستدا بوو. جگە لەوانەش ئاماژەکانی کەسانی وەکو (مەسعوودی) و (ئەبو رێحانی بەیروونی) لە سەرچاوەی بەشەکانی داستانی ئەفسانەیی و دانراوی ئایینی خواپەرستی نیشانیدەدات کە ئەوانە بە شێوەیەکی راستەوخۆ بەهۆی کەسانیترەوە ئاوێستایان بەدەست نووسیوەتەوە کە هەر یەکێك لەوانە گەورەتر و زیاترە لە ئاوێستای ئێستا بە بابەت و بەشەکانییەوە.

بەڵام لە سەدەی شەشەمی کۆچی بەدواوە جارێکیتر بارودۆخەکە دژوار و لەبەرچاو بوو بۆ ئاوێستا لە ئێراندا، ئەوەش دواکەوتنێکی بۆ ئەم پەرتووکە کۆنە لەگەڵ هەندێکیتر لە نووسراوەکانی خواپەرستاندا لە پەرستگاکانی ئاگردا دروستکرد ئەوەبوو بە نهێنیان نیوە نهێنی ئەمانە لای زەردەشتییەکان مانەوە کە تەنیا لە بۆنە ئایینییەکاندا خانەوادەکانیان بەکاریان دەهێنان، مەرجەکانی دادوەریش لە کۆمەڵگادا قەدەغەکاری دروستدەکرد بەرامبەر هەموو دۆستدارانی فەرهەنگی کۆنی ئێرانی لەناو ئەم نامە کۆنانەدا.

لەلایەکیترەوە وەکو بزانین لە سەدەر یەکەمی کۆچی (بەرامبەر سەدەکانی حەوتەم و هەشتەمی زایینی) کۆمەڵێك لە ئێرانییەکان کە پابەندبوون بە ئایینی کۆن و نەیاندەویست ئایینی خۆیان واتە باوك و باپیریان بەجێبهێڵن بەهۆی خراپی باری ژیانیان بەپێی ئەو مەرجە نوێیانەی هاتبووە گەردەنیان بۆ ئەوەی ژیانیان بگوزەرێنن چارە ئەوە بوو رابکەن لەجیاتی ئەوەی میوانبن بۆیە وردە وردە بەرەو وڵاتی هیندستان کۆچیانکرد و لە بەشێکی ئەم وڵاتەدا مانەوەو رزگاریان بوو لە بەڵا. ئەوانە جگە لە پەرستگای ئاگر کە هەیانبوو شێوەی پەرستگای ئاگری (فەرەن بەغ)ی فارسیان بۆ هیند بردو لەوێ لە جێگای ئەو ئاگرەکەی رووناکی ئەدا، جگە لەوەش بەشێك لە نامەی فەرهەنگی و ئایینی کۆن لەوانە

چەند بەشێکی ئاوێستا ئەوانەشیان بۆ ئەو وڵاتە بردو گرنگی زۆریان پێدا و لە شوێنی تایبەتی دایاننان. بەو جۆرە ئەو کۆچە لەلایەن کۆمەڵانی ئێرانییەوە بۆ هیندستان یاد ئەکرێتەوەو هەتاکو ئێستاش پەیوەندی نائاشکراو بە نهێنی لەنێوان ئەوان و زەردەشتییەکانی دانیشتووی ئێران (بەتایبەتی ئەوانەی یەزدو کرمان) بەردەوامە و ئەوانە بۆ نیشتمانەکەیان و هاوبەشییان لە ئایینێکی کۆندا بە هۆکاری سەفەر و پێکهاتنەوەیان لە نێوان ئەو دوو وڵاتەداو بە یەکگەیشتنەوەیان لە قوتابخانەی سەرەتایی ئایینی و فەرهەنگی و ئەوەی لە نووسراویش لەو رێگایەوە بۆ هیندستان لەگەڵ خۆیاندا بردوویانە لای پارسەکان پارێزگاری لێکراوە. لە سەدەی شانزەی زایینی بەدواوە هەندێ لە ئەوروپاییەکان کە بەدوای لێکۆڵینەوە لە زانستی ئاوێستاو ئایینی کۆنی ئێرانییەکاندا دەگەڕان، هاتوونەتە ئێران بەتایبەتی لە سەدەی هەژدە تا بیست لەوانە کەسانی وەکو (ئانکتیل دووپرون) و (دارمستتر) و (جاکسن) و هیتر، بەدوای ئەوانەشدا کەسانیتر بۆ هیندستان چوون تا لە نزیکەوە بگەن بە پارسییەکان و دەستیان بگات بە سەرچاوەی فەرهەنگ و ئایینی کۆنی ئێرانییەکان. لەو رێگایەوە بوو کە (ئاوێستاناسی) بوو بە لقێك لە زانستی شوێنەوارناسی و بڵاوبۆوەو کەوتە بەردەست، بەو هۆیەوە لەو سەرزەمینەدا بەسەدان پەرتووك و نامەو راپۆرت و نووسین بە زمانە جیاجیاکان بڵاوبوونەوە.

ناوەڕۆکی دەستنووسەکانی ئاوێستا کە تا رۆژگاری ئێمە ماونەتەوە بە شێوەیەکی گشتی پێکهاتوون لە دوو جۆر:

**ئەلف:** ناوەڕۆکی ساکار کە بۆ نزاو نوێژو جەژنی زەردەشتییەکان تەنیا (یەسنە) بەکاردەهێنن یان تێکەڵاو لە (یەسنە) و (ویسپەرد) و (وەندیدار) وەرگیرابێت.

**بێ:** ناوەڕۆکی پەهلەوی کە بەشێك لە بەشەکانی ئاوێستایە و بە پەهلەوی ئامادەکراوەو نووسراوەتەوەو پێشتریش دەستنووسەکانی ئاوێستا لای کۆمەڵە جیاجیاکان لە هیندستان و ئەوروپا پارێزگارییان لێکراون. لە وڵاتی شوورەویش کتێبخانەی گشتی (سالتیکف شچدرین) دەستنووسی هەندێك لە بەشەکانی ئاوێستای تیادا پارێزراوە.

سەرچاوە

جلیل دوستخواه/ اواستا/ کهن ترین

سرودها و متنهای ایرانی/ جلد اول

# تیشکێك بۆ سەر ((وەندیداد)) و ئایینی مووغەکان

سەرەتا بەر لەوەی بچینە ناو باسەکەوە بەپێویستی دەزانین چەند خاڵێك بخەینە بەرچاو بۆ وەبیرهێنانەوە.

**یەکەم:** (وەندیداد) بابەتی باسەکانی لەسەر بنەمای فیکریی و خواناسی واتە یەزدان پەرستی بووەو پرسەکانیتریشی دەربارەی فەرمانەکانی شەرعی و ئایینی زەردەشتییە و لەگەڵیا خاڵەکانی زمانناسی و بابەتەکانی بەشەکانیتری ئاوێستاشی لەخۆ گرتووە، ئەوانە جیاوازی گەورەو زۆرن بە بەراوردی لەگەڵ ئاوێستادا هەن، کەسێکی ئاساییش کە دەیخوێنێتەوە بۆی دەرئەکەوێت کە روو بەڕووی ئەو جیاوازیانە دەبێتەوە.

**دووەم:** ئەو جیاوازییەی هەیە لە نێوان (گاپاکان)ی واتە سرودەکانی زەردەشت و بەشەکانیتری ئاوێستادا هەمان ئەو جیاوازیەن کە پێشووتر لەناو (وەندیداد)ەکانیشدا لە ئاوێستای دواییدا هەبووە بە مانا لە (یەسنا) و (ویسپەرد) و (یەشتاکان) و (خوردە ئاوێستا)دا بوونیان هەبووە. بەو جۆرە ئەو پرسانە لە (وەندیداد)یشدا خراونەتە بەر باس و لێکۆڵینەوە چونکە زۆرینەی پرسەکانی بە هیچ شێوەیەك لە بەشەکانیتری ئاوێستادا ناونیشان و ئاماژە بۆ کردنیان نییە. ئەمە لە حاڵێکدایە کە هەموو بەشەکانی ئاوێستا پرسەکانی هاوبەشییان بەشێکن لە (گاپاکان). بۆیە ئاداب و رێوڕەسم و پەرستنیان و رێگادان بە ئادابی پاککردنەوە تایبەتمەندییان لە (وەندیداد)دا هەیە.

**سێیەم:** ئەوەی لە ئاداب و دەستوور و فەرزەکانی ئایینی (وەندیداد)دا هەن لەناو بەشەکانی ئاوێستاشدا بە هەمان شێوەن، بەڵام دژ بەیەکن.

**چوارەم:** ئەو سەردەمانەی دوورن رێوڕەسم و سنووری شەریعەتە دانراوەکان لەم سەرچاوەیەدا واتە (وەندیداد) بڕیاری رازیبوونی زەردەشتییەکانی لەسەر نەدراوە بۆیە بەپێی ئەوەی لەناوەڕۆکیانا جێهێڵراوە لە رووی زمان و تێگەیشتنیان لە ئاوێستادا ئاگادارییان لێیان نەبووەو پیرۆزی پەرتووکەکەش کە بەشێکە لە ئاوێستا خۆی بەو جۆرە ناساندووە کە لە دەزگای مووبیدەکانەوە دەرچووە، ئەوەش فشارێك بووە بۆ سەر خەڵکی بۆ ئەوەی رێزیان لێبگرن. ئەوەی کە لەم پەرتووکەدایە لە شەریعەتی مووغەکانی ماد بەپێی ئەو توانایەی لەبەردەستیانا

بووە لە سەردەمی ساسانییەکاندا هەموو کاری رامیاری و ئایینی و کۆمەڵایتی لەگەڵ کارەکانیتری وڵات کە هەمووی (22) کارە لە دەستیانا بووە. رۆحانییەکانی زەردەشتیش کەمایەتییەك بوون و مووغەکانیش کە بە شێوەیەکی ئوسوولّی زانیاریمان لەسەریان تەواو لەبەردەستدا نییە دەنگێکی نهێنی بوون پێشەوایەتیان بەناوی ئایینی زەردەشتییەوە کردووە مووغەکانیش سوودیا لە رۆحانییەکانی زەردەشتی، یان میترایی مادی یان زروانی دیووە.

**پێنجەم:** زۆرینەی لێکۆڵەرانی ئاوێستاناسی لە ئەوروپادا بۆ ئەوەچوون بوونی ناوی موبیدەکان و پارسییەکان لە (وەندیداد)ی زەردەشتییەکانی ئێراندا (وەندیداد) بە بناغە و دارِێژەری ئایینی زەردەشتی دەناسن کە لە ناویا شەریعەتەکانی زەردەشتی دەبینن. هەڵبەتە لە تێڕوانینی هەندێك لە لێکۆڵەرانی وەکو (نیبیرگ) و (شپیگل) و (میلس) و (زیهنەر) کەسانیتر ئەوەیە (وەندیداد) پاشماوەی ئاسەواری مووغەکانە، بۆ ئەولایەنەش روونە کە مووغەکان عەشیرەتێکن لەو شەش عەشیرەتانەی ماد کە فەرمانی ئایینی و کارەکانیان بە باشی ئەنجامداوە، بەڵام ئاریایی نەبوون.

**شەشەم:** لە هەموو سەردەمەکاندا دوای کۆتایی ساسانییەکان بەتایبەتی لە سەدەی چوارەمی کۆچی بەدواوە تێبینی دەکرێت شەریعەتی مووغەکان کە لە (وەندیداد)دا نووسراوە، هەتاکو ئەو کاتەی پێویستبوو سەرچاوە بووەو رەواجی هەبووە، بەڵام سەرچاوەیەکی تەواو و کۆتایی نەبووە بۆ لەبەرچاوگرتنی چونکە خودی سەرچاوەکە لێکۆڵراوەتەوەو تەفسیری لەسەرکراوە، پەرتووکی زۆریش هەن لەسەر بابەتەکانی ئەویان نووسیوە. لەلایەکیتریشەوە مێژوونووسان و گەورەی میللەتان و ئاینزاکانیش کە دەربارەی زەردەشت هەندێکیان نووسیوە، لەگەڵ داواو شەریعەتەکانی ناو ئەم کتێبەدا رووبەڕوو بوونەتەوە بەو بەڵگانەی کە هەبوون.

لە سەرەتای رۆژگاری سەفەویدا گەشتیارەکانی ئەوروپایی بەرەو رووی زەردەشتییەکان لە ئێراندا بوونەتەوەو پەرتووکی وەندیدادیش رەفتاری لەگەڵ مردوودا گۆڕیوە وەکو دانانی لەبەر خۆر و هەڵکۆڵینی گۆڕی بەردین و باوەڕی دووانەیی بۆ ئەوانە وەندیداد رای جیاوازی داوەو سنووری شەرعی و ئادابی پاککردنەوەی بۆ داناوە، بەو جۆرە نووسینەکانی ناو ئەم پەرتووکە بەزۆری گومان لە بنەمای ئایینی زەردەشتی دەکات چونکە فشار و دەمارگرژی تیایدا نەدراوەو زەردەشتییەکانیش لە هەوڵدا نەبوون بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان و بە ئەنجامگەیاندنیان.

**حەوتەم**: راکان لەسەر جوگرافیای (فەرگورد) بەر لە وەندیداد ئەوە دەگەیەنێت کە گومانێك نییە زەردەشت لە خۆرهەلاتی ئێران، یان باکووری خۆرهەلاتی لەدایکبووبێت و ئایینەکەی تیایدا بلاوکردبێتەوە.

ئەو شوێنەی زەردەشت ئایینەکەی تیایدا دەرکەوت ئایینی میترایی سەرچاوەی ئیمان و پەیوەندییەکانی مرۆڤ بووە. ئاینزاکانی فریشتە و خۆریش کە لە یەشتی سیانزەو نۆزدەیەمن رووبەڕووی یەکتری بوونەتەوە، پەرستنی ئاینزای ((بەغ بانووی گەورە))، (ئاردەویشوور ئاناهیتا) کە یەشتی پێنجەم تایبەتی بەوداوە پەیوەستە بە بلاوکراوەکانی ئایینی میترایی (ئائیرنیم ڤەیدجە)ی سەرزەمینی زەردەشت، شوێنی لەدایکبوونی ئایینی گاپائییە. ئەم سەرزەمینە کە بە دواداچوونی بۆکراوە دەکەوێتە پشتی رووباری (جەیحوون) لە خوارزم واتە باکووری (سوگدیانە) و (مەرگیانە)یە.

زەردەشت ئایینی خۆی لەو سەرزەمینەدا داناو بلاویکردەوە. فشاری نائاساییشی بەرووی ئایینی نویٚ لە تەرەفی ئایینی میتراییەوە بۆوە. پەیڕەوانی ئایینی زەردەشتیش بۆ بلاوکردنەوەو گەیاندنی ئایینەکە ریٚگای بەرەو باشووری رووباری (جەیحوون)یان هەلبژاردو تیٚدەکۆشان بۆ ئەوەی فەرمانرەوایانی ناوخۆیی لە دلەوە لەگەلیا بن. زەردەشت لە شوێنی خۆی لەژێر فشاری گرووپە روحانییەکان و مووغەکانی میترایی بووە بۆیە بەرەو باشوور رێگای گرتەبەر. لەم کۆچەیدا لە رۆخی رووباری سەیحوون تیرەی (فریانە) کە لە تۆرانییەکان بوون پێشوازییان لێکردووە. (کۆی ویشتاسپ) کە میرێکی ناوخۆیی بەهێزبووە زەردەشتی بە پیاوی خۆی داناوە بۆیە پلەو پایەی داوەتی و بەهێزی کردووەو ئەنجوومەنی ئایینی بۆ ئامادەکردووە. بەو جۆرە ئایینی زەردەشت سەرکەوت لە بلاوکردنەوەیدا و بەرەو (سوگدیانە) و (مەرگیانە) و (باکتریە) و (نیسایە) و (ئاریە) رۆشتوو لە سەرتاسەری ناوچەکەدا شوێنی نفووس و دەسەلاتی ئایینی میترایی رتەوە. کاتێك بۆ یەکەمجار (وەندیداد) نووسراوەتەوەو رێکخراوە ئایینی (بەرەگە) (رەی) گەیشتبووە خۆرئاواو نفووسی بلاوبوو.

(رەی) مەرکەزی ئایینی مادەکان و مووغەکان بوو و ئایینەکانیتریش لەژێر ئالای ئەم ئایینییەدا بوون و هێزو توانایان هەبووە. بەو خۆیەوە ئایینی زەردەشتی بەرەو خۆرئاوا رۆشتوو بلاوبۆوەو مووغەکانی مادیش لەوان جیاوازبوون و لەو رەسەنایەتییەی خۆیاندا بەرەو خۆرهەلات رۆشتوون و یەکەمین ئایینی بەربلاو بوون کە دەرکەوتوون.

مووغەکان چ کەسانێك بوون؟: بە نیگەرانییەوە هەواڵی مێژوونووسانی کۆن بە رەشبینییەوە لەوانە ئەدوێن، ئەمانە هەموویان، یان زۆرینەیان بە درۆزن ناوزەد کراون، سەرچاوەکانیش دەوڵەمەندە بەو لێکۆڵینەوانەی لەسەر ئەمانەکراون کە لەبەردەستدان. هەڵبەتە لە بنەمادا لێکۆڵینەوە پێوانەی پێویستە و رەوایە و عەیبی تیادا نییە لە چەند سەرچاوەیەکەوە بەجیا باسیانکرابێت.

هێرۆدۆت لە مێژووی خۆیدا راپۆرتی لەسەر مادەکانداوەو لای ئەو ئەوانە لە شەش بنەماڵە یان عەشیرەت پێکهاتوون. بە سەیرکردنی ناوەکانی ئەو شەشە رووی لێکۆڵینەوە لە مانایاندا یەکدەگرنەوە، ئەوانە لە بارودۆخ و ئەحواڵی مێژوویی و جوگرافی و هەموو تایبەتمەندییەکانی مادەکانا بوون، بۆیە ئەم داستانە بەڕاست دەزانرێت. لە شەش عەشیرەت یان عێل بەپێی داستانی ناوبراو پێکهاتووەو بەم شێوەیە باسیانکراوە:

1- (بووسای) لە ئێرانی کۆندا بە (بووسا) ناوی هاتووە.

2- پەرتە کینووی بە واتەی هێرۆدۆت لە ئێرانی کۆندا بە (پارتیاکانایە) ناوی براوە کە لە (پاتیاکاوە) وەرگیراوە، ئەم عەشیرەتە لە سنووردا دانیشتوون.

3- شتریۆخاتیس، کە شێوە ئێرانییە کۆنەکەی (سراڤاڤاتا) یان (سراڤاڤانتا)یە بە مانای ناسراو دێ.

4- ئاری زەنتۆ، رۆشنە کە لە ئاریی و زەنتۆ پێکهاتووە بە مانای هەشیرەتی ئاریایی دێت بە مانا ئازادەکان یان چاکەکان و نەجیبزادەکانی دەوڵەتی ماد.

5- باودیڤۆی کە شێوەی ئێرانییە کۆنەکەی (باودیایە)یە.

6- مەگۆی یان مووغ (Mages) شێوەکانیتر کە بەزۆری بۆ ئەو واژەیە بەکارهێنراون یان ئەوانەی لە باسەکاندان بەزۆری سەرچاوەن بۆی. ئەوانە هەمان ئەو مووغانە بوون کە لە رۆژگاری کۆندا دەربارەیان شتی زۆرباسکراوە.

مێژوونووسان و نووسرانی یۆنانی و رۆمیش لە کۆندا و هەتاکو ئەمڕۆش لە پەرتووکەکانیاندا دەربارەیان لێکۆڵینەوەی زۆریان کردووەو بەباشی باسیان نەکردوون. ئەوانە هەمان ئەو کەسانەن کە بە پیاوی ئایینی بتپەرستی و جادوو و پزیشکی و رامیاریی و ئەستێرەناسی و فاڵچی پێش وەخت بیرکردنەوەی خراپ و توانای زۆریان لە ئادابی پاککردنەوەو پەیڕەوی یاساو توانای ماندوو نەبوون و گۆشەگیری ناو خێزانیان یان عەشیرەتەکەیان کە تیایدا ژیاون هەبووەو ناوبانگەیان لە دنیای کۆندا رۆشتووەو هەتاکو ئەمڕۆش ئەو سیفاتانەیان هەر ماوەو بەوانە بەناوبانگن. دەربارەی ئەوەی کە ئایا

مووغەکان مادی ئاریایی بوون یان بەزۆری شوێنی باس و لێکۆڵینەوەن. بەڵگە هەیە کە تیرەکانی مادی ئاریایی بوون، بەڵام دەربارەی مووغەکان بەزۆری گومانێك هەیە لەسەر ناوی کەسەکان و ناوی شوێنەکانیان بۆ ئەوەش تێگەیشتن هەیە کە خاکی مادەکان بەر لە هاخامەنشییەکان لە سەردەمی ئاشوورییەکاندا تیایدا گەلان و میللەتانی غەیری ئاریایی هەبوون.

ئارییاییەکان لە کۆمەڵگای سنووورداری خۆیانا توانیویانە باڵا دەستبن. میللەتان و گەلانیتری وەکو: خوورییەکان و خالدییەکان و کاسییەکان و گوتییەکان و لۆلۆبییەکان لەو خاکە پان و بەرینەدا لەگەڵیانا ژیاون هەروەکو چۆن لەسەر زەوی پان و بەرینی ئاریایی هاخامەنشیدا هەر بەو جۆرە ژیاون. خووی دڕندانە و ستەمکردنی زۆر بە زۆری لەناو ئەو مرۆڤانەدا هەبووە. ئەو رۆحیەتەش بە زۆری لەناو مووغەکانیشدا دەرکەوتووەو زۆر زبرو رەقبوون. وەندیدادیش نیشانەیەکی دەرکەوتووی ئەو رۆژگارەیە و یاسانامەیەکە کە بنەماکەی بۆ بەر لە زەردەشتییەکان دەگەڕێتەوە، سەرەتا لە ئێرانی خۆرهەڵات و ئەنجوومەنی (گاپان)ی بێگانەدا دەرکەوت.

مووغەکان و شیوێنی نەژادیان: لە راستیدا مووغەکان لەناو دامەزراوەی مادەکاندا بوون و خاوەنی تواناو نفووسی زۆر بوون و پایەکانی رۆحانیی و پیاوانی ئایینی لە دەستی ئەوانابوو. بە قسەی (هێرۆدۆت) کاروباری ئایینی و هەڵسوڕێنەرانی دەرباری (ئیختوویگو) (ئاستیاگسی پادشای ماد) بوون. هەرچۆنێك ناوی ئەم پادشایە دێتە پێشەوەو فەرمانەکان و قەرینەکانیتری دەخەینە بەرچاو پێدەچێت (ئاسکێتی)بێت. هەرکاتێك وتووێژ لەسەر ئەم مووغانە دەکرێ ئەمانە بەناونیشانی خاوەن پلەو پایەی رۆحانیەت و پیاوانی ئایینی باسیان دێتە پێشەوە.

هەڵبەتە ئەو لێکۆڵینەوانەی لەسەریان کراوە بەڵگە لەسەر ئەوە دەرئەخەن ئەمانە عەشیرەتێکی پادشایی بوون لە دەرباردا و قسە و نووسراویش لەو بارەیەوە هەن بۆ ئەوەی دەیەوێت. ئەمانە چ لە سەردەمی مادەکانا و چ لە رۆژگاری هاخامەنشییەکان و دوای ئەوانیش تا رۆژگاری ساسانییەکانیش لە ناوچەکاندا زۆر بڵاوبوون کە بەناونیشانی رۆحانییە تایبەتییەکان یاد دەکرێنەوە.

لە (رەی) (رگە) بەڵگە هەیە لە کۆتایی سەردەمی مادەکاندا بە ئایینی زەردەشتی ئاشنابوون. ئەوانە کاری جیاوازیان بەشێوازی خۆیان ئەنجامداوەو لە (وەندیداد)دا دەرکەوتوون.

دوای نەمانی سەردەمی ماد لە رۆژگاری هاخامەنشییەکاندا تواناو نفووسیان لەدەست رۆشت. توانای ئەوان بە مەرگی (کەمبوجییە) و هاتنی پادشا (گاوماتە)ی خاوەنی مەنسەبەکانی مووغ بۆیان گەڕایەوە، بەڵام داریۆش کە لە لقێکیتری هاخامەنشییەکان بوو

بەسەر ئەودا سەرکەوت و کووشتی (بە مانا گاوماتە) ئەو کوشتنە بەزۆری مووغەکانیشی گرتەوە. دوای ئەوە مووغەکان هاتنە ژێر ئیتاعەت. ئەمانە لە رۆژگاری هاخامەنشییەکاندا تەنیا قانع بوون کاری ئایینی بکەن و پایەی رۆحانییەتیان هەبێت، بەڵام دوای داریۆش بەدەمارگرژی زۆرەوە هێزو توانایان بۆ گەڕایەوە.

دوای کەوتنی هاخامەنشییەکان و هێرشی ئەسکەندەر لە نزیکی (تەختی جەمشید)، لە (ئەستەخر)، زنجیرەیەکی بچکۆڵەی دەوڵەتی پادشایی دامەزران، و دراویان لێداو پادشاکانیان خاوەنی مەملەکەت بوون، ساسانییەکانیش لەو خانەدانانە بوون و دەوڵەتی ساسانیان دامەزراند، و ژیانەوە، و ئەوانە بوون شێوازی ((پادشا-پیاوی ئایینی)) حکومەتی بەهێز و توانایان هێنایەڕوو، بەڵام دەمارگرژی ئایینیان سەرئەنجام ئەستێرەی ئەوانیش کوژایەوەو گەورەییان کۆتایی هات.

ئەوەی کە هەیە و لەبەرچاوە، مووغەکان یەکێك بوون لە عەشیرەتە بە تواناکانی ماد بەو بەڵگە زۆرانەی لە بەردەستدان کە پێدەچێت ئارییی نەبووبن بە مانا لە رۆحانیەکانی کۆنی دەوڵەتی ماد بوون بە سیحر و جادوو، و بەشەکانی زانستی پزیشکی و ئەستێرەناسیی و دەستگرتنەوەو فاڵگرتنەوەو تاوەکو سنوورێکیش لە زانستی کیمیا ئاگاداربوون، بەپێی هەموو ئەو زانیاریانەی کە بوویانە دەسەڵات و تواناو نفووسیان نزیك بە گەورەکان بووە لە ئەشراف و میرەکانی دەرباری ماد. ئەوانە بەپێی یاساکانی تایبەت ژیاون کە زۆر بە رەق و گران جێبەجێیان کردووە. ئەم یاسایانە دڵنیایی پاکییە کە تێکەڵ بە شتی خراپ نەبووەو بە گەورە ژمێردراون. دادوەرییەکانیان و سەرپێچییەکانیان بەلای ئەوانەوە خەڵاتکردنیان بووە. خۆیان جیاوازتر لەوانیتر جیاکردووەتەوە. هەتاکو لەناو مادەکانیشدا جیا لەوانیتر ژیاون. ژنهێنانیان بەزۆری نزیك بە خۆیان بووە تا بەو رێگایە تێکەڵاو نەبن و خوێنیان بە پاکی بمێنێتەوە. مێژوونووسانی وەکو (دینەوون) ئەوانە وەکو مادەکان و پارسەکان بە ناونیشانی قەومێکی سەربەخۆ باسدەکات. لەوانەیە بەزۆری واهەستبکەین مووغەکان وەکو هاخامەنشییەکان رۆژگارێك عەشیرەتێکی دەسەڵاتداربوون چۆن دەبێت لە رۆژگارەکانی مێژوویدا واتە لە سەردەمەکانی مادو هاخامەنشی و دوای ئەوانیش بووبنە فەرمانبەر لە دەرباری پادشاکان و توانایان لە کارەکانیانا بەزۆری دیاربووەو تەنیا پادشاش یارمەتیدەریان بووە. لە سەردەمی پادشا گەورەکانی مادو هاخامەنشی، لە شوێنی خۆیان داینراون، کاریان ئەنجامدانی رێورەسمی ئایینی و بەجێگەگەیاندنی

دروشمەکان و قوربانی بوو، بۆ پادشاکان. لە تەشریفاتی ساڵی نوێشدا گوێزانەوەی ئاگری پیرۆز بوو لە کەژاوەیەکی شاهانەدا. ئەمانە پادشاکان راوێژیان پێکردوون واتە نزیکیان بوون، هەروەکو چۆن پەیوەندیان بە نزیکی خۆیانەوە هەبووەو ژنیان لێخواستوون.

سەرئەنجام باشترین بەڵگە بەو جۆرەی هەیە و ئیدیعای ئەکەن ئەوەیە هەنگامێك شۆڕشی (گاوماتەی) مووغ دژی کەمبووجییە بەرەو رووی بۆوە چۆن داریۆش توانی سەرکەوتن بەسەریا بەدەستبهێنێ لەکاتێکدا لە وڵاتەکەیدا چەندان کێشەی هەبووە؟ یان بۆچی لە ئەیالەتەکانی هاخامەنشیدا پایەدارەکان و فەرماندەکان بێ ئەوەی بەرهەڵستی دەسەڵاتی بکەن رێزیان لێگرت.

بەڵام بۆ وەبیرهێنانەوە لەو شوێنانەی گەڕان و پشکنین دەربارەی مووغەکان کراوە بۆ وەرگرتنی زانیاری لە سەریان سەرئەنجام نەگەیشتوونەتە ئەوەی زانیاریان لە سەریان دەستبکەوێت. وادیارە ئەو شوێنانەی رۆحانیەکانی بتپەرستی تیایدا ژیاون کارگەرێتی ئاداب و رێوڕەسم و بیروباوەڕی نێوان دوو رووبار رۆڵی هەبووە لەسەریان، لە ئێرانیشدا ئەوانە بەردەوامیان داوە بە ئایینی (مەزدیەسنا) و بە ئاین بوونیشیان پەیوەندی بە ئایینی زەردەشتەوە نەبووە، ئەمەش بارێکی گرانی بۆ ئایینی نوێ واتە زەردەشتی دروستکردووە بۆ ئەوەی پەیڕەوانی زروانیی و میتراییی رابکێشن بۆ پەروەردەو رێوڕەسمی مەراسیمی ئایینی خۆیان بەمانا زەردەشتی. لە هەموو سەردەمەکانیشدا ئەمانە هەردەم لە ئێراندا قەوارەیەکی گچکە و چینێکی سنووردار لەو مووغانە هەبوون، بەڵام لە رۆژگاری ساسانیدا بەهێزو دەسەڵاتەوە هاتنە ناو دەسەڵاتەکە و بوونە هەڵگرانی ئایینەکە بەناوی زەردەشتەوە کە دووربوون لێوەی. کارو چالاکییەکانیشیان لە نامە ئایینییەکانیاندا و یاساو رێساکانیاندا دیارن. بە نیگەرانییەوە دوای رووخاندنی بنەماڵەی ساسانییەکان بەدەستی ئەعرابەکان ئەمانە بەناوی پاسەوانەکانەوە بوونە پارێزەری پاشماوەی میراتی زەردەشتی.

سەرچاوە

هاشم رچی/ وەندیداد/ جلد اول

چاپ اول 1376/ چاپ سورە/ لا65-70

# لە کام رۆژگار لە ئێراندا ئایینی زەردەشت بڵاوبۆتەوە؟

لە بەشێکی مێژووی دەرکەوتنی زەردەشتدا بەو ئەنجامە گەیشتین کە ئەو (واتە زەردەشت) هەتاکو ئەو کاتەی لە ئێراندا کۆمەڵگا دروست بووەو دەوڵەتی دامەزراو هەبووە لە ناوچەیەك لە سنووری باکووری ئەفغانستان سەرقاڵی گەیاندنی ئایینەکەی و بڵاوکردنەوەی بووە. مێژووییەکی نووسراو بۆ ئەو سەردەمە لەبەردەستدا نییە و ئاسەوار و هێماکانیش کە بەدەست گەیشتوون بە هیچ شێوەیەك ئاماژە بە فەرهەنگ و سیستەمی کۆمەڵایەتی ئەو مرۆڤانە نادەن. بەو پێیە ئەوەی لە گاتاکان و ویداکان و ئاسەوارێ کە لەوەوبەر ئاماژەیان پێدراوە لەو قۆناغەدا دەتوانین بڵێین هەتاکو ئەو کاتەش دەوڵەت و کۆمەڵگای پێشکەوتوو شارنشینی دەرکەوتوو نەبووە.

لە رۆژگاری ژیانی زەردەشتیشدا عەشیرەتێك کە (ویشتاسپ) سەرکردەیان بووە، ئایینی ئەو وەرگیراوە، بەڵام ئاسەوارێك کە پەنای ببرێتە بەرو بەردەوامی هەبوونێت دوای مەرگی زەردەشت و ویشتاسپ روون نییە و لەبەردەستدا نییە، بەهۆی بوونی ئەفسانەی ئاوێستای دواییش نەمانتوانی لەو رووەوە دڵنیایی بدەین. بەهەمان شێوە لە فەسڵی لادان لە ئایینی (زەردەشت)یشدا جارێکی دیکە پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە، چونکە ئاوێستای دواییش دروستکراوی مووغەکان و موبیدەکانە کە چەند چاخێك دوای زەردەشت بەردەوامیان پێداوە، نامە نووسراوەکان یان تەواو رێکخراوەکانیش تیایانا زانیارییەکانیان لەسەر ئەو سەردەمە هەتاکو ئەمڕۆش کەمتر هەیە و لەبەردەستدان، ئەوەش کەمتر رەوشە زانستییەکە و حەقیقەتی دەرکەوتنەکەی رووناك بووەتەوە. بەو شێوەیە براهمکانی هیند لەناو دونیای داستان و ئەفسانەکاندا لە مەیدانەکەدا رۆژیان کردۆتەوەو حەقیقەتی پەیامی (زەردەشت)یش نەلای ئەوان قابلی هەست پێکردن بوون نە لاشیان سوود بەخشبووە، بەڵام ئەوەی لە مێژوو و ئاسەواری کۆن رایەك بە ئێمە دەدات بوونی پەرستگای ئاگرە کە بۆ یەکەمین جار لەسە خاکی ماد هەبووە. پەرستگای زەردەشتییەکانیش بۆ سەردەمەکە هاوشێوەی لە سەردەمی هاخامەنشیشدا دەرکەوتووە. لە سەرچاوەی باوەڕی کۆمەڵگای مادەوە ئاسەواری نووسراو بەدەستەوە نییە کە بوونی زەردەشت بچەسپێنێ، تەنیا ئەوە نەبێت کە لەوەوبەر ئاماژەمان پێدا گەورەکان و پادشاکانی ماد،

هاوشێوەی (فراوەرتیس) و (هۆخشترە) ئەو رایە بەهێزتر دەکات کە فەرهەنگی زەردەشتی چووەتە ناو ئەو ناوچانەوە. لە یەشتاکانی کۆنیشدا ئاسەواری نفووسی ئایینی زەردەشتی لە ئێرانی کۆندا هەبووە لەوانە ئازەربان باسیان بەناوی مووغەکانی ماد جیاجیا هاتووە.

ئەو ئاسەوارە مەزەبییە گەلیانەش کە لە خۆرهەلاتی ئێران شێوەیان هەبووە ماونەتەوە، ئەگەرێکی بەهێزیش هەیە کە لە ناوچەکانی باکووری خۆراسان، یان (بەلّخ) و (مەرۆ)ی کۆن رێکخرابن و لەوێشەوە وردە وردە بەرەو خۆرئاوای ئێران بەهۆی مووغەکانەوە یان باوەڕیانەوە بلاوبووبنەوە. بەهەمان بەلّگەش (یەسناکان) و (یەشتاکان)یش ئەو شێوەیەیان بەخۆیانەوە دیوە. دەربارەی هاخامەنشییەکانیش زانیاری کۆن هەیە کە لە نووسینەکانیاندا باسیان هاتووەو ماونەتەوەو سینیە ئالّتوونەکانیش کە لەوەوبەر ئاماژەمان پیدان و قسەمان لەسەرکردن، مێژوونووسان و نووسەرانی یۆنانی و رۆمیش مۆلّەت بە ئێمە دەدەن کە بەوردی دەربارەی ئەو سەردەمە قسە بکەین.

سەرچاوە

مهندس جلال الدین اشتیانی/ زەردشت فردیسنا و حکومت

چاپ هفتم 1374، لا 308-309

# باسێكی ئاسایی لەسەر زەردەشت

بەپێی باسە ئاساییەکان زەردەشت لە خێزانێك لە بنەچەی سوڵتانەکانی ئاریایی ماد لەدایکبووە. شوێنی لەدایکبوونی ئەو لە ئازەربایجان نزیك دەریاچەی ورمێ بووە. ناوی بنەماڵەکەی (ئاسپیتامە)یەو دایك و باوکیشی (پورووش ئاسپە) و (دوغدو) ناویانبووە. باوکی ئەو پیاوێکی زانای ئایینی بووەو دایکیشی کچی (فەراهیمرو)وە کە یەکێکە لە نەجیبزادەکانی ئاریایی. لەکاتی لەدایکبوونیا ناوی (ئاسپیتامە)یان لێناوە کە ناوی باپیری خێزانەکەیانە و بۆ زەردەشتیش بووەتە لە رۆژی لەدایکبوونی زەردەشت موجیزەو کەرامات بەزۆری روویانداوە. باوکی مامۆستای زەردەشت بووە کە بووەتە زانای. ئەو لە تەمەنی 15 ساڵیدا لە کۆمەڵگادا گۆشەگیر بووەو زۆرینەی کاتی لەناو دنیای بیرو خەیاڵدا بەسەر بردووە. لە تەمەنی 30ی ساڵیدا زەردەشت بووەتە پێغەمبەر و نێردراوەو رووی لە نوری ئاڵتوونی خواییدا درەوشاوەتەوە. لەگاتەکاندا هاتووە ئەو لە کێوی (سبلان) وەحی بۆ هاتووەتە خوارەوە. دوانزە ساڵ ئایینەکەی لە خۆرئاوای ئێران بڵاوکردۆتەوە، بەڵام لەو ئەرکەیدا سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە، چونکە پشتیوانی بۆ دروست نەبووەو گەورەکانی قەومەکەش ئاژاوەیان بۆ ناوەتەوە، بۆیە ناچار بووە شوێنی لەدایکبوونەکەی جێبهێڵێ و بەرەو خۆرهەڵاتی ئێران رابکات بۆ ناوچەکانی (بەڵخ) و (خوارزم). لە (باکتریا) یان (بەڵخ) بەکاری خوایی و چاکەوە سەرقاڵبووە بۆ نەهێشتنی کێشەکان لە کۆتاییدا (ویشتاسب) (گۆشتاسب) ئاهەنشای ئەو سەرزەمینە باوەڕی پێکردو پاراستنی لە دەستدرێژی لە (بەڵخ)یش زەردەشت بەهۆی بڵاوبوونەوەی ئایینەکەی سەرزەمینەکانیتریشی گرتەوە. ئەوانەی دەیانپاراست دوو برادەربوون (فرشوشتەر) و (جاماسب)ی وەزیری دەرباری بوون بەمانا (گۆشتاسب). دوای 35 ساڵ تێکۆشان و گەیاندنی ئایینەکەی بە کەسانیتر لە تەمەنی 77 ساڵیدا زەردەشت لە شەڕێکدا کە لە نێوان (ئارجاسب)ی پادشای (تۆران) زەمین و (گۆشتاسب) روویدا، لەکاتێکدا لە پەرستگای خۆی لە بارەگای (گۆشتاسب) بەرگری دەکرد گیانی لەدەستدا. پیاوکوژەکەی تۆرانییەك بوو بەناوی (برات رکرەش).

سەرچاوە

مهندس جلال الدین اشتیانی/ زردشت

فردیسناو حکومت/ چاپ هفتم 1374، ل57-58

# ئایا زەردەشت یەکتاپەرستبوو؟

زانایان و خۆرهەڵاتناسان لێکۆڵینەوەی وردیان لەسەر ئاوێستا کردووە، لە سرودی 44 کە یەکێکە لە شاکارەکانی پڕ مانای گاتاکان، بەدەرکەوتووترین ئاسەواری فیکری دنیای کۆندا ئەنرێت. زەردەشت لێرەدا پەیامی پڕ مانای خۆی بە زمانێکی شیرین بڵاوکردۆتەوەو تێکۆشاوە خەڵکەکە رازیبکات، ئەم شێوەیە لەگەڵ سروشتی دنیاداو لەگەڵ هەمووواندا دەگونجێت بەو جۆرەی لە کۆنەوە رووی تێکردووە کە دەڵێ: ئەی خواوەند تۆ هەیت و خاوەن کەرەمیت و بەو تەوازوعەت تۆ دەپەرستم، عاشقی تۆ و رێگاکەتم، تۆ چەند دڵخۆشی منت بەو جێگەیە هێناڤ ئەی بەرزی تۆ خالقی، دلم بە خۆشەویستی تۆپڕە. ببینە ئێمە خۆشەویست بووین بە تیشکی راستی و دروستی تۆ، دڵخۆشیم لە بینینی تۆ دایەو دڵمان بە نوری پاکت رووناك بۆتەوە. لە بەندەکانی دواتردا زەردەشت پرسارەکانی خۆی بەشێوەیەك دووبارە کردۆتەوە کە وەڵامە بۆ ئەوانەی خۆیان لە خواوەندی گیان و عەقڵ دەربارەی پرسەکانی شاراوەی ژیان شاردۆتەوە چونکە ئەوانە لەو رۆژگارانەدا پەیوەستبوون بەهێماو نهێنی و جادوو و غەیبییەوە کە پەرستوویانن. ئەو دەپرسێت کە سەرچاوەی جوانترین و باڵاترین ژیانی پاك بۆ کێیە، کام کەس دروستکەرەو سەرچاوەی راستییە و کام کەس کاروانی ئەستێرەکان و هەتاو دیاریدەکات و مانگ بە مانگی نوێ و درەخشان بە مان دەگۆڕێت!! ئەوانە و شتیتر رازەکانی سروشتمان لە تۆ داوامانکرد. کێن ئەوانەی لەسەر زەوین و ئەوەی لەو شوێنەدا لە ئاسمانی باڵادایە؟ کێیە خالقی ئاو و گیا، کێیە بە با هەوا هەڵدەکات و لە ئاوی وەستاو هەور دروستدەکا و باران دەبارێنێت، کێ ئیلهام بەخشی سروشتی پاکە؟ بە ماندووبوونی تاریکی گەورە رۆشنایی دروستدەکاو بۆ مەخلوقات بە شەو و رۆژ لە خەوا، یان لە خەوا نەبێت رووناکی دەبەخشێ و هۆشداریش بە مرۆڤی دانا ئەدا. لێرەدا پرسیارێك و دوو وەڵام رێکدەخرێت: ئایا دەزانیت عەشق و ئیمان بە خواوەند لە تیشکی چاکەو راستی و دروستی کە داوای دەکەیت زۆردەبێت و دەکەوێتە دەستت؟ دنیای بەرهەم ئەوەی خەلقت دەکات، شادی و گەورەییت پێدەبەخشێت، بە تیشکەکەی سروشتی چاك کە ئیرادەی هێزی خواییە و داواتکردووە سەرلەنوێ بەردەوامیت

پێدەداتەوە: کێیە ئەوەی چاکەی ئیمان و ئیرادەو چ کەسێکە عەقڵ و ڕێزو خۆشەویستی باوك لە دڵی منداڵێدا واتە لە ناخیدا دروستدەکات.

لە کۆتاییدا لە بەندی حەوتەم لە دیتنێکی قەتعی و گشتییەوە ئەو پرسارە دەکاو وەڵام وەردەگرێت: ئەی دەسەڵاتداری دادوەربەخش، تێدەکۆشم لە تۆی ئەقڵ و پاکی و تۆی چاکەو بەسەرکردنەوە تێبگەم.

زەردەشت لە بەندەکانیتردا بە عیبادەتی خۆی بەردەوامی دەدات دەربارەی ئیمان و پەروەردەی ژیان و خزمەت بەخەڵك کە لە فەسڵەکانیتردا سەرچاوەی باس و بڕیاردان دەبن و لێرەدا پێویست بە باسکردنیان ناکات.

دەعوەتکردنی مرۆڤ بۆ ئەو سامانە ئایینییە کە لە ڕۆژگاری پێشوودا هەبووەو پێی ئاشنابووین ئەوە هەستکردنی خوجی مرۆڤە بە بیروباوەڕی زەردەشت کە لەو ڕۆژگارەدا هەبووەو بڵاوبۆتەوە. بەرجەستەکردنی ڕێنماییەکانی زەردەشت لەبارەی خالق و ئیرادەی نەخشی خوایی سەردەمێك دەرکەوتوو بووە کە دەتوانین پێوانەی بە تەورات بکەین.

فەسڵی خالق لە تەوراتدا بەدرێژایی چەند چاخێك سامانێکە شاکاری پڕ گەورەیی هێناوەو هەتاکو ئێستاش لەناو سەدان ملیۆن مرۆڤی جیهاندا هەمان نرخی ماوەو لەسەردەمێکیشدا شێوەی ڕەسەنی خۆی وەرگرتووەو (بەنی ئیسرائیل)یش سوودیان لە پەروەردەی شارستانێتی کۆنی میسر وەرگرتووە، هەروەها بەهرەشیان لە پێشکەوتنەکانی سۆمەر و بابل و کۆمەڵگای پێشکەوتووی ڕۆخەکانی دەریای سپی ناوەڕاستیش بینیووە. فەزای لەدایکبوونی تەوراتیش لە دەیان چاخی بەر لە زایینەوە لەگەڵ ئەستێرەناسی و زانستی سروشت و ماتماتیك ئاشنابووە. دروستکەرانی هەرەمی میسری و قولە و زەقورەکانی بابل و سۆمەر و ئەستێرەناسان و زاناکانی نێوان دوو ڕووباریش ڕۆڵیان بەرامبەر بە جیهان لە دنیادا بینیووە بەو تیۆرە پڕ بەهایانەیان کە ئەنجامیانداوەو بەو کارانەشیان شوێنی ستایش و ئافەرینن. ئەمە لەکاتێکدایە گاتاکان لە کۆمەڵگای دواکەوتوو و نەبوونی دامەزراوی پێش کات و سیستەمێك دوور لە هەموو ئەو پێشکەوتنە گەورانەی نێوان مرۆڤی سەرەتایی گلێنەدارو خاوەن زانیاری هەبووە، ئەمە و چەند جارێکیش بیرخستنەوەم بە بەهای تیۆرێك لەکات و شوێنی خۆیدا داوەو دیاریکراوە.

لەم سرودەدا بەشێوەیەکی کۆتا ئاهۆرامزدا خالقی هەموو شتە دەرکەوتووەکانی جیهانە، و هەموو ئەوانەش کە ڕوویانداوە لە دنیای زانست (هەتاکو بچکۆلەترین شتێك کە یارمەتی درابێت یان نەدرابێت. ئەوەش تەنیا لەم سرودەدا نەهاتووە بەڵکو لە سەرتاسەری گاتاکانیشدا تەنیا خالقێك هەیە کە ئاهۆرامزدایە.

خالّی سەرنجڕاکێش لەمەدا خالّقە کە لە گاتاکاندا هاتووە، بەلاّم بە زمانی ئەفسانە نەهاتووە کە بەیانکرابێت بەڵکو بە ئاشکرا واقیعیانە رووبەڕوو بووتەوە.

لە گاتاکاندا ئاهۆرامزدا لەگەڵ هیچ خوایەك، یان خوایەکی پلە دوو هاوبەشی نەکردووە تەنیا چەند ناوێك نەبێت کە لە پەیوەندییەکانیانا بە خواوەند دانراون وەکو (ئاشا) و (هۆمنە) و... کە ئەمانە بەشێکن لە داب و نەریتی ئەفسانە و لەژێر کاریگەرێتی ئاوێستای دواییدا یارمەتیدەرانی (ئاهورامزدا) بوون، بۆ ئەمەش لە باسی (ئامشە ئاسپندان هۆکاری پەیوەست نەبوون لەو بۆچوونەدا بەیانکراوە، بەلاّم لە گاتاکاندا پەیامی یەکتاپەرستی کە لەسەری رێککەوتوون هاودەنگن.

**لۆمڵ دەنووسێ:** ئەوەی لە گاتاکاندا بە زۆری دیارە ئەوەیە کە خوای دانا تەنیا خالّقە و ئەو هەتاکو خالّقی رۆخی تریشە کە لە دەوروبەر هەن. زەردەشت بە ئاشکرا دەڵێ: ئەو خالّقی هەموو ئەو شتانەیە کە لە دنیادا هەن و ناسراون ئەمەش وەلاّمێکە بۆخۆی کە تۆ ئەی (مەزدا) خالّقی هەموو شتێکی و زانیاریت لەسەریان هەیە. لۆمڵ باوەڕی وایە کە هەتاکو لە رۆژگاری ساسانییەکانیشدا ئاهۆرامزدا هەر تەنیا خوای زەردەشتییەکان بووە، بۆ ئەوە ئاماژە دەکات بە گوزارەی قەشەیەکی مەسیحی کە ئەشکەنجە دراوە لای زەردەشتییەکان، ئەم قەشەیە دەربارەی (بەهرام گور) دەڵێ: ئەو باوەڕی بە یەك خوای تاك هەبووە. لۆمڵ دەنووسێ: ئەم پشتگیرییەی بۆ یەکتاپەرستی زەردەشتییەکان زۆر سەرنجڕاکێشە چونکە لە یەکێکەوە بووە دەمار گرژی ناحەزی ئایینی زەردەشت بووەو بە ژمارە ژمێردراون و لەوانەش لە سەرچاوەی زەردەشتییەکانەوە ئەشکەنجە دراون لەسەر عەقیدەکەیان و گوزارەیان داوە.

هێرزفیلد باوەڕی وایە ئەمشە ئاسپنتە)کان لە خواکانن، ئەم ئەنجامەش دەگۆڕدرێت بە تەرزێکی بیرکردنەوەی یەکتاپەرستی کە رەسەنترین تەرزی بیرکردنەوەیەو تەنیا بە کەسی زەردەشتەوە پەیوەستە. ئەو هەموو کات دووپاتیدەکاتەوە (لە گاتاکاندا) کە ناوی هیچ خوایەکی نەبردووە جگە لە ئاهۆرامزدا.

بارتولۆمە دەنووسێ: ئەو نۆ بنەچەیەی کە هەن زەردەشت لە شوێنی ئەوانەدا واتە خوا جیاجیایانە یەك خوای دانای هێنا کە ئاهۆرامزدایەو بووە جێنشینی ئەسڵیان.

پتازۆنە، زانای ئیتاڵیایی باوەڕی وایە کە ئایینی زەردەشت لە بنەمادا ئایینی یەکتاپەرستییە و بەهیچ شێوەیەك (دوالیستی) واتە لەسەر (دوو هێز) نییە. ئەم ئایینە لە

ئەنجامی نوێخوازییەوە هاتووە لەناو باوەڕی فرەخوایەتی و سروشت پەرستی کە ئارياييەکانی کۆن هێنايانە روو و لەژێر کاريگەرێتی ئايينی جولەکەدا شێوەی خۆی وەرگرت.

شفتلوويتس، زانای ئەڵمانی باوەڕی وايە کە ئايينی زەردەشت ئايينی يەکتاپەرستی بووە، بەپێچەوانەی (پتازۆنی) کە باوەڕی وايە نفوسی ئايينی جولەکە لەناو ئايينی ئارياييەکانداية کە ئەمە ناتوانرێت باوەڕی پێبکرێت بەڵکو بە پێچەوانەوە بوونی هۆکارەکانی ئايينی ئارياييەکان لەناو ئايينی جولەکەدا هەيە.

پرۆفيسۆرگرای، لێکۆڵەری ئينگليزی دەنووسیّ: ((ئايينی زەردەشت بە زۆری لە (دواليزم)، و دووربووەو بنەچەکەی ئايينێکی يەکتاپەرستی يەککگرتووبووە.

شدەر دەنووسیّ: فەزای گاتاکان لە چەند خوای ويدايی و ئاوێستايی دوا دواوە تەواو بەتاڵە. زەردەشت تەنيا خوايەکی ناسيووە کە ئەوی بەدانای دڵخۆش ناوهێناوە. ئەو خالّق و دڵخۆشە و هەتاو و ئەستێرەکانی لە کەوانەی خۆی ناردووەو مانگيشی بەخشيووە بە گەورە بوون و ئاوابوون، زەويشی لە خوارەوە داناوەو ئاويشی بە قايمکارييەوە لە ژوورييەوە واتە لە بالآيدا هێشتۆتەوە.

ويل ديورانت، لەگەلّ ئەوانەشدا لەم رۆژگارەشدا تاوەکو ئێستاش لێکۆڵينەوە نوێکان لەو بارەيەوە تەواو نەکراون ئەو دەنووسیّ: ((ئايينی زەردەشت، ئايينی يەکتاپەرستييە و (ئامشەسپەندان)يش لە کۆمەڵەی خواکانن، بەڵام پەيڕەوانی زەردەشت لەوانەی کە هەن لە فەرمانی ئاهۆرامزدا دەرهێنراون کە خالّقی دنيايە و بەڕێوە دەبات. بەو رێگايە پەکتاپەرستی بەو گەورەييەی هۆکاری دروستکردنی ئەو ئايينەی نيشانداوە، بەو جۆرە مەسيحييەتيش بە پەرستنی چەند خوايەك لەناو مرۆڤدا گۆڕاوە)). ئەو بەو جۆرە دەنووسیّ: ((زەردەشت بەوە گەيشتووە رۆخە پيسەکانی بە خوا ساختەکانی زانيووە ئەوانە بەرجەستەی ئەفسانەی هێزداران و بەربەستن لە پێشکەوتنی مرۆڤدا و لەناويانا هەن، بەڵام پەيڕەوانيان ساکارن و ئاسان دێنە بەرچاو و ئەولايان کەسايەتييەکی زيندووی گۆڕاوی دروستکراوە)).

ميلز، ئاماژە بە هەندێك لە لێکۆڵەرانی گاتاکان لە دوو ريشەی جياجياوە ئەدا کە خوايان بە شێوەی (کۆ) باسکردووە، ئەو دەڵێ، لە تەوراتدا تاوەکو ئێستاش خوا ناوی (کۆ)يەکە مانای خواکان دەدات ئەمە لە حاڵێکدا کە ئەو خوايە ئاشکرايە لەگاتاکاندا ناوەڕۆك و ئەوەی

لە پەیامەکەدا هاتووە تەواو دیارە کە مەبەست تەنیا خوایە. ئەو نووسیویە لە گاتاکاندا ئاهۆرامزدا خالّقی هەمە جۆر شتەو تاکە خوایە...

**ئاشپیگل و ویندیشمان.. نووسیویانە:** ((ئەگەر ئێمە بە وردی سەیری گاتاکان بکەین لە کۆتاییەکەیدا بە تاك پەرستی پوختە و تەواو دەگەین هەر بەو جۆرەش پاشماوەی ئاوێستا بەجیا سەرچاوەی لێکۆڵینەوەو بڕیاردان دەبێت لە پەیامێکی روشاو و کەم هەست پێکراو کە بە شێوەی جیاجیا، تازەگەرێتی بەخۆوە دیوە بۆیە دووپاتی ئەوە دەکاتەوە کە ئایینی زەردەشت یەکتاپەرستییەو مانای وشەی ئاهۆرامزداش بە بنەمادا لە گاتاکاندا دیارە کە تاکە خوای ئایینی زەردەشتە و بە هەمان شێوەش (یەهوە) لە چاخی کۆنی تەوراتدا هەبووەو خواش لە مەزەبی ئیسلامدا دیمەن و تواناکەی یەکتاییە.

ماتین هاوگ، خۆرهەڵاتناسی ئەڵمانی بۆ یەکەمینجار (17) هات لە گاتاکانی بەناونیشانی تەنیا ئەمانە چەسپاو و رەسەنن لە پەیامی زەردەشتدا لەوانیتر لە یەسناکانی جیاکردەوە، بەو پێیە باوەڕی وایە کە ئایینی زەردەشت ئایینی یەکتاپەرستییە و (دووالیزم) لە گەڵیا یەکناگرێتەوە، هەر بەو جۆرە نووسیوویە: ((زەردەشت یەکتاپەرستی گەیاند کە بە چەند پلەیەك لە یەکتاپەرستی عیبرانییەکان پوختەترە)).

وەزندۆنگ، گرنگترین سەرسوڕمانێك بەلای یبنەرانەوە لە ئایینی زەردەشتدا جیاوازی بناغەییە لە نێوان رۆح و ماددا، بەپێی دیمەنەکان بەردەوام خوا هیچ شێوە دەست بەستراوییەك بە سیفاتەکانی ئاسایی و ناوبانگی پێشوویەوە نییە، وەکو بزانین.

**ئۆڵمستید دەنووسێ:** ((زەردەشت یەکتاپەرستێکی واقیعی بوو. ئەو ئاهۆرامزدا لای بە مانای واقعی وشە دێت کە تەنیا خوایە کە بە ژمارە دەژمێردێت)).

**گیگەر دەنووسێ:** ((لە ئایینی ئارياییەکانی کۆندا کە لەگەڵ هیندییەکاندا مەزەبی هاوبەشیان هەبووە، خوای زۆریان پەرستووەو توانای سروشتی هەر یەکێك لەوانە بەدەسەڵاتیان لە پێش خواکانیترەوە دەرکەوتوون، بەڵام لە ئایینی زەردەشتدا پاشماوەی ئەوانە بەو جۆرە نییە. تەواوی هێزو توانا جیاکان لای خوای یەکتا بووە کە باڵاترینی هەموویان بووەو لە مەزەبی سروشتییەکاندا کۆکراونەتەوەو لە مەزەبی یەکتاپەرستییەکانیشدا زەردەشت ئەوانەی گۆڕی)). ئەو هەموو کات باوەڕی وابوو ((تەنیا یەهوە خوای جولەکە لە رووی هەندێك سیفاتەوە دەتوانرێ بە ئاهۆرامزدا پێوانە بکرێت)).

## لادان لە ئایینی زەردەشت

لە سروودی 32.9دا هاتووە: مامۆستای (بەد) کە پەروەردەی مەزەبی دەگۆڕێ و مرۆڤ فێری نادروست دەکات ئەوە گومڕابووەو لە ئامانجی ڕەسەنی ژیان لایداوە. ئەو مرۆڤە ئەگەر ڕووبکاتە ڕاستی و دروستی و بیری چاك و پاك ئەو مرۆڤە جارێکیتر دەبێتەوە بە دارێکی ڕێك. ئەی خواوەندی بەتوانا و دڵپاك و دەمڕست پێتدەڵێم دڵ و ڕۆحم لای تۆیە و خۆشەویستی تۆی لێژەتکێ، لە دەرگای تۆ گلەییم کردو پرسیارم کرد..

## لە سروودی 32.10دا هاتووە:

بەڕاستی ئەو مرۆڤەی فەرموودەکانی ئایین دەگۆڕێ و هەرجارەکە، دەڵێ: سەیرکردنی هەتاو و خاك تاوانێکی گەورەیە و ئەوانەی داوای بیری چاك دەکەن و بەدرۆ دەیگۆڕن، ئەوانە لادەرن لە ئایین.

لە بەندەکانی دواتردا ئامۆژگارییەکانی بۆ بەدکارو خراپەکارەو ئەوانەی هەوڵی لادانی ژنان و پیاوانی شەریف ئەدەن، بۆ ئەوانە ئامۆژگارییەکانی دەڵێ: پاداشتی خوا بۆ ئەو لادەرانە ئاماژەی بە پەروەردەی خراپی ئەوانە داوەو مرۆڤیش لە جوانترین شێوەیدا ئەوەی لە توانا هەیتی پێیداوە.

ئەو لادەرانە لە دوا دوادا هێزیان دەخەنەگەڕ بەو شێوەیەی لەلادانەکەیاندا سازیانداوە بەلایانەوە وا باشبووە کەسانتیریش بەرەو خراپەکاری بەرن. لەم سروودەدا زەردەشت بەو جۆرە بۆیچووە کە هەتاکو لە سەردەمی ئارامیشدا پیاوانی ئایینی، یان مامۆستای لادەر لە باوەڕیاندا ئایینییان گۆڕیوە، بەڵام هاتوون لە شێوەیدا جوانکارییان تیایدا کردووە بەو کارەشیان مرۆڤیان لە ڕێگای ڕاستی دوورخستووەتەوە.

لادان لە ئایینی زەردەشت دوای خۆی هەتاکو سنوورێك دیارەو باوەڕیش بەوە هەیە کە لێکۆڵەران لەسەر ئەو ڕایەن کە پیاوانی کڵێسای نەخوێندەوار لە زەردەشتییەت تێنەگەیشتوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی لە ئایینەکەدا هەیە نەیانتوانیوە بڵێن نییە. ئاوێستاناسانیش باوەڕیان وایە بەدرێژایی مێژوو بەناوی زەردەشتەوە ڕاگەیەنراوکراوە، بەڵام

کەمتر لە پەیامی زەردەشت نزیکبوونەتەوە، بەڵام دوای زەردەشت پیاوانی مەزەبی ئاریایی کە زیاتر لەسەر باوەڕە کۆنەکە بوون، بەڵام لە پۆشاکێکی زەردەشتیدا باوەڕی ئایینی زەردەشتیان بە مرۆڤ گەیاندووە.

بەر لەوەی باسی لادان لە ئایینی زەردەشتدا بکەین، چەند نموونەیەك بۆچوونی لێکۆڵەران بەو رووەوە دەهێنمەوە:

نیبورگ باوەڕی وایە ئەو زانیاریانەی کە ئاماژەمان پێدان موغەکان توانیویانە لە کۆمەڵگای مەزەبی لە ئێراندا کاری حکوومەتی بکەن و ئایینییش کە خۆیان لایەنگری بوون دەربڕین لە بیروبۆچوونیان دەکات لەناو ئێرانییەکاندا چونکە پەرتووك و نووسین لەناویانا نرخێکی نەبووەو لایەنگرانی ئایینەکەش لەگەڵ بۆچوونی موغەکاندا بوون.

ئەم چینە لە موغەکان لە منالییەوە مەشقیان لەسەر ئەو شتە مەزەبییانە کردووە، هەر لەسەر ئەوانەش پەروەردەکراون کە توانیویانە شتە دەستوور و مەزەبییەکان لەبەر بکەن. تەنیا هەر ئەم چینەش بوون کە کارە رەشەکانیان واتە خراپەکانیان گۆڕیوە بە یاساو دەستووری مەزەبی، هەرخۆشیان سەرچاوەی ئایینەکە بوون لەناو خەڵکیدا کە ژمارەیان دەرکەوتووبووە.

نیبورگ خۆی بەڵگە بۆ رایەکانی دێنێتەوە بۆ ئەوەش پەنا دەباتە بەر رای (ئابەنووی) قەشەی فەرەنساوی کە پشت بەستووە بە زانیاری زمانەوانی سۆمەری و نیشانیداوە کە لە سەردەمی ساسانییەکاندا زەردەشتییەکان ئاماژەیان بە پەرتووکێك نەکردووە بە هەمان شێوە مەسیحییەکانیش بۆ سەرچاوەکانی خۆیان هەرگیز پشتیان بە پەرتووکێك نەبەستووە لەکای ئایینییاندا.

نیبورگ جارێکیتر دێتە سەر باسی شاگردەکانی قوتابخانە مەزەبییەکان کەلای موبیدەکان ساڵانە پەروەردەکراون و فێری نزای لەسەرخۆ و ئەشعار و دەستووری مەزەبی کراون ئەمەش بەشێوەیەك بووە هەتاکو ئەعرابەکانیش دواتر ئاوێستایان بەناوی (زمزەمە) واتە (نزای لەسەرخۆ) ناوناوە. لە دواییدا نیبورگ بەو ئەنجامە گەیشتووە کە کۆمەڵگای زەردەشتی ئایدۆلۆژی موغەکانیان پەیڕەو کردووەو رۆح و ناوەڕۆکی مەزەبەکەش (میترا) پەرستی بووە بە مانا لەخۆر پەرستییەوە ئایینەکە سەرچاوەی گرتووە.

بارتولومە دەنووسێ: ئایینی رەسەنی ئاریایی کۆن، یان هیندو ئێرانی بەشێوەی (ئەنترۆپومورفیسم) بووە واتە تێکەڵەیەك بووە جیاکردنەوەی هەرگیز ئاسان نەبووە ئەمە بە ساکاری لەگەڵ پەیامی نوێی زەردەشت دایە و رۆحانییەکانی ئایینی ناچارکرد دەست لەو

ئایینە هەڵبگرن بەشێك لەم ئایینە لە رواڵەتدا وەرگیرا چونکە لە باوەڕی مرۆڤەوە سەریهەڵداوە، بەڵام ئەوەی هاتووەو لەبەردەستدایە کە لە بنەچەدا وەرگیراوەو لەناو ئایینەکەدایە پێچەوانەی ئایینی زەردەشت وەستاوەتەوە.

بارتولومە بۆ نموونەی میتراپەرستی واتە پەرستنی خواو خواردنەوەی (هۆم) (شەرابی پیرۆز) و قوربانیکردن باسیکردووە کە زەردەشت بە قورسی دژیان وەستاوە، بەڵام دواتر لەناو زەردەشتییەکانیشدا رەواجی پەیدا کردووە.

هەرتل جارێکیتر لە چەند شوێنێکدا ئاماژە بەلادان دەکات لە ئایینی زەردەشتدا و لەناو ناوەڕۆکی ئامۆژگارییەکانی بەرزی گاتاکانیشدا کە دژی باوەڕی زەردەشتییەکانی ئەم دوا دواییە، دەنووسێ: موغەکان لە سەرەتادا قەشە کۆنەکانی ئایینی ئێرانی دێرین بوون، بەڵام بەهۆی نفووسی ئایینی زەردەشت و پەیڕەوکردن و پاراستنی لە تەرەفی هاخامەنشییەکانەوە سەرلەنوێ ئەوانە خۆیان وانیشاندا رەواجی پێبدەن، بەڵام لە راستیدا ئەو رەواجە هەر بۆ ئایینە کۆنەکەی خۆیان بوو و بڵاویان کردەوە، بەڵام لە رووداا شێوەیان جوانکردووە. بەهەمان بەڵگەکە لە ئاوێستای دواییشدا هاتووە بوونی ئەو شتانە دەمانباتەوە بۆ ئەوەی کە لە غەیری زەردەشتەوە هاتوون. چونکە لە گاتاکاندا هیچ جۆرە ئاماژەیەك نییە دەربارەی ستایشکردنی خواکان و هێزەکانی سروشت وەکو، با، ئاو، خاك، هەتاو، مانگ، کازیوە، بەیانی، ئەمەش دەمەتەقێیەکی لەسەرخۆی دەوێت بەشێوەیەکی دیارو سروشتی. پیرۆزێتی سەگیش کە لای ئێمە شوێنی گاڵتە پێکردنە و لە پاشماوەی بیروباوەڕی دەوارنشینەکانە لەو رووەوە پاشماوەیەك نابینین هەروەها لەسەریان ئامۆژگارش دراوە بۆ دانانی لاشەی مردووەکان لەبەردەمی تواڵەکان و سەگەکاندا و بۆ خواردنی خۆیان و لەزەت وەرگرتنیان لێیان.. ئەو دەنووسێ: لە گاتاکاندا زەردەشت مرۆڤێکی سەرنجڕاکێشە بۆ خێرو چاکەو خاوەن بەزەییە کە هەردەم لە ئاخاوتندایە. کەسێك کە لە شوێنێکی بەرزدا بیردەکاتەوەو خەڵکەکەش ئەوەی هەیانە لە ئەفسانە وەکو هێزەکانی سروشت لەوانە هیچ کەسایەتییەکی خواییان نەدیوەو لە ئادابی دیوانیشدا بەهۆی پەیوەستیان بە مەشتیی و خوێنرێژیان نەفرەت لێکراون و لەگەڵیانا بە سەختی لە ململانێدا بووە..

لە دواییدا (هەرتل) بەو ئەنجامە دەگات: کەسایەتییەکی ئاوا باسکراو کە بە رێگایەکی دژواردا دەڕوات تووشی دژایەتی کردن دەبێت. ئەو ئایینەی دێو پەرستەکانیش بە وتەی زەردەشت هیچ جۆرە رێککەوتنێك ناکەن چونکە خواکانیان لە هێزو تۆخمەکانی سروشتن. بەو

جۆرە هێرۆدۆت وەسفی هەمان ئەو ئایینە دەکات و دەڵێ: هیندو جەرمەنییەکان کە لە ڕێگویدا داهەن لە گاتاکاندا ئاسەواریان نییە.

هەرتل لە سەرچاوە جیاجیاکاندا وادەبینێ کە قوربانی پێشکەشکردن بۆ مردووەکانیان مەستی وەندیدا و ئاوێستای دواییشدا ئاماژەیەك لەسەریان نییە و لە کۆتاییدا ئەنجامێك بەدەستەوە دەدات کە ئەو شتانە پەروەستن بە ئایینی موغەکان نەوەك پەیامی زەردەشت. ئەو دەنووسێ: ((پاراستنی ناوی یەزدانەکان و ئەهریمەنەکان لەویداکاندا هاوشێوەی (یەجتەکان)ی ویدایین کە هاتوونەتە ناو ئایینەکەو ستایشی دیاردەکانی سروشتیش دەکەن وەکو هەتاو، مانگ، ئاگر، با، خاك، ئاو رۆژو شانازیان پێوەدەکەن و ژمارەیەکی زۆریش لە ئەسپ و گاو مەڕ دەکەنە قوربانی بۆیان و شەربەتی (هاومە)ش، ئیزدی خوای گەورە تاوەکو سنوورێك خۆی لێ مەست دەکات کە بۆیان ئامادەکردووە.

**شدەر دەنووسێ:** ((لێکۆڵینەوەو گۆڕینی گاتاکانی سەردەمی ساسانی بۆ زمانی فارسی ناوەندی ناسراو بەگشتی لە بیروبلاوەڕی زەردەشت دووربووەو کاریگەرێتی بەسەریانەوە نەبووە)). شدەر هەر بەو جۆرە باوەڕی وایە کە تیۆرەکانی زەردەشت لە تەرەفی باوەڕپێکراوان نییەو زۆرکەمتر بووە لە پەیڕەوانی پەیامبەرانی ئایینە گەورەکانیتر و هەستی پێکردووە بۆیە نووسیویەتی: ((پەیانی زەردەشت خاوەنی وێنەیەکی یەکتایی و بێ شێوە بووە کە دوای ئەو بە دڵگرانییەوە بەدەست نەوەکانی دوای خۆی تەواو لە کاروانی رەسەنی خۆی لایداوە)).

شدەر لە پێشەکییەی خۆیدا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ قسەکانی زەردەشتدا دەنووسێ: ((لە ئاوێستای نوێدا ئێمە ئاشنای ژمارەیەکی زۆر لە ئامۆژگاریەکان و دەستوورو داخوازییەکانی بووین و بەیەکگەیشتین کە پایەکانی ئایین بچووکترین خزمایەتی بەوانەوە نییە. ئەفسانەکانی مەزەبی لە باڵای ئەو پەیامەدا کە دروستکراون لەو کاتەدا هیچ کاریگەرییەکیان لە راستی مێژوویی نەبووە کە لەبەردەستدا بێت، بەڵام ئاسەوارێك بەدەستەوە مابێت تەنیا لە 16 گاتادا هەن کە گومانی تیادا نییە قسەکانی خودی زەردەشتن کە پشتیان پێدەبەستم. هەڵبەتە ئەو سروودانە بە ژمارە ئاڵۆزترین ناوەڕۆکی ئیندوجەرمانین)).

شدەر پێشتر ئەوانەی لە هونەری شیعریدا داناوە کە بەلای ئێمەوە ئێرانییەکان بۆ جوانی لە پاشماوەی شاعیرە گەورەکان و ناسراوەکانی رۆشنلێ وەکو حافز و سەعدی و عەتار و مەولەوی مامەڵەی لەگەڵدا کردوون کە جێگای سەرسووڕماندن نین.

لۆمل باوەڕی وایە موغەکان کە وەزیفەی کاهینیان بینیوە لە کۆمەڵگای ماددا لە کۆندا، بەڵام دوای زەردەشت پارێزگاری لە بیروباوەڕەکانی زەردەشت نەکراوە لە پەیامی زەردەشتدا و دەستکاری ئایینەکەی کراوەو توخمەکانی بتپەرستی تیایدا دەرکەوتووە.

**زهنەر دەنووسیٚ:** زەردەشت پەیامبەرێك بوو ئەو بە هەمان رادە شایستەی ئەو ناوەبوو کە، **محەمەد** (دروودی خوای لیٚ بیٚت) یان موسا هەیانبوو، بەڵام ئەوانەی دوای ئەو هاتوون بەباشی هەستیان بە پەیامی ئەو نەکردووەو خاوەنی باوەڕی باش و بەڵگەنامەی زیندووش نەبوون کە بتوانن بەباشی یادی بکەنەوە. لە رۆژگاری هاخامەنشییەکانیشدا ئەوەی لەبەرچاو دەبینرا پێچەوانەو لە ئاسنکاریشدا جیاوازبوو لەوەی پەیامبەر لەمەدا (ستایشی خواکانیتر) بەزۆری دەکرا، ئەم دیاردەیە لە چاخی ساسانییەکاندا زیادی کردووەو یاسایەکی وشك دەرچووە کە دەمارگرژییەکەی لەسەر شانی کۆمەڵگابووەو کەمترینی خەڵك توانیویانە ئەو یاسایە وەربگرن. جگە لەوەش ئەو ئایینە بە توانای تەواوی خوای گەورە هاتووەو دروستبووە. زهنەر باوەڕی وایە هەتاکو زمانی ئاوێستاش زمانی زەردەشت بووە کە جوانی و نەرم و نیانی زمانەکە خۆی سەرنجڕاکێش بووەو دەوڵەمەندییەکەی لەدەستدا بووە.

ئەو دەنووسیٚ: ((دەتوانین بڵێین لە پەیامی زەردەشتی زیندووی زیانبەخشدا گرنگی پەیامەکە وایکرد بگاتە جولەکە و مەسیحییەکان،

بەڵام گرنگی و رەسەنایەتی بەو هۆکارە نەگەیاندە لای ساسانییەکان و لەبەر چاوی بگرن و بڵاوبێتەوە بەجۆرێك کە ئایین پاکی و ژیانی خۆی لەدەست نەدا)).

مۆلتۆن باوەڕی وایە کە لە دەرباری هاخامەنشییەکاندا یەشتەکان تووشی ناڕەحەتی بوونەتەوەو زەردەشتیش لەناو ئەو لافاوەدا وەکو حەکیمێکی خوایی بە ئارام بووە. موغەکان لەو رۆژگارەدا هەتاکو ئەو کاتەش ئایینی خۆیان بە تەواوی پیادە نەکردووە، بەڵام بەفرە خوایەتی کۆنی ئێرانییەکان کاریان کردووەو لەوەشدا ناوی زەردەشت سەرنجیانی راکێشاوەو پارێزگاریش لەناوەکە بەدەنگێکی نزمکراوە لە دیدی ئەوەی پەیامبەرەو تەبلیغی کردووە. ئەو دەنووسیٚ: ((توخمە نوێکان کە چوونەتە ناو ئایینەکەوە پەیوەست نەبوون بە زەردەشتەوە بەڵکو لەژێر کاریگەری سەرچاوەکانی سامی، یان نفووسی زۆری رۆحانییە موغەکان کە لەوەو بەر لە شوێنێکی گەورەوە هاتوون مەزهەبەکەیان گۆڕیووە چونکە هەتاکو ئەوکاتەش رۆژی پیرۆزی تەواوی موغەکان دەرنەکەوتووە)).

مۆلتۆن باوەڕی وایە ((دواتر موغەکان نەوەك تەنیا لە ئوسوڵی زەردەشت نزیك نەبوونەتەوە بەڵکو لە پایەی ئایینەکەش دوورکەوتوونەتەوە لەوەش زیاتر بەڵکو هەتاکو لە پایەی ئایینییە کۆنەکەی ئێرانیش ((یان داوە))و لە کۆتاییدا گەیشتوونەتە ئەنجامێك

((سەرەتا باوەڕی فرە خوایەتیان رەوانەی دۆزەخ کردووە، بەڵام دواتر تەنیا ئەوە پێویست بووە کە ناوی تایبەتی ئەو خوایانە بگۆڕن و سەرلەنوێ کراون بە بەهەشتی بەناوی هەمان پەیامبەر کە لە سەرتایەری ژیانی خۆیدا بەو جۆرە بەگەرمی دەنگی خۆی بڵند کردووە کە خوا تەنیایەو هەریەکە)).

ئۆڵمستید لە کۆتایی لێکۆڵینەوەکەیدا بەو جۆرە دەنووسێ: ((کەمێك دوای مەرگی زەردەشت ئەوەی تەواو بووە لە کارەکانی پێچەوانەکەی دروستبۆتەوەو پەیڕەوکراوە، بەو پێیە ئەو هەڵچوونە شێوەی خوای بەخۆوە گرتووە. گاتاکانیش بەهۆی ئەو جیابوونەوەیە ساکاری خۆیان لەدەستداوەو شێوەی هێماو نهێنییەکانیش کە لەبەر دەستدان بە ئاوازی کڵێسا گۆڕاون. بۆیە خواکان زۆربوون و تەشریفاتێك بۆ ئەوانە کە مەزەبی (پاگانیسم) (بتپەرستی باوەڕ بە خوای بەزۆر) لای ئارياییە کۆنەکان ماوەتەوەو ئادابێکیش کە ئەو خۆی لەو رووەوەو بەو جۆرەو سەرسەختانە بە دڵنیاییەوە مەحکومی کردبوو. دوای (پاگانیسم)ی ئارياییی بەشێکی بەهۆی ئایینی موغەکان کە بەربەرییەتێکی کۆن بوو پاشماوەکەی مابۆوە بووە سەرچاوەی بڕیار وەرگرتن.

هەموو کاتێکیش پەیڕەوانی زەردەشت حسابیان بۆ (هاومە)ی پیرۆز کردووە کە لای زەردەشت ئەو ((شەرابە بە پیس و مەست بوون)) ناوی بردووە، بەڵام سەرلەنوێ لە رێورەسمی (میترا) پەرستیدا هاتۆتەوەو قوربانی کە زەردەشت بە توندی دژی وەستاوە بۆیان کردووە، هەروەها دووبارە پەرستنی خوا ئاناهیتا دەرکەوتووەتەوە لە دواییدا گرووپێك کە هەبوون و خۆیان ئەو شەرابەیان بە پەیامی واقیعی ئەو دانابوو. لەگەڵ نزمبوونەوەی مەزەبە میللییە کۆنەکاندا کە باشترین مەغزایان لە رەگ و ریشەی بیرو خاڵەکانی هاوشێوەی تازەو نوێ و هێزبەخش وەرگرتووە کە دەتوانین بڵێین کاریگەری ئە بزووتنەوە ئایینییەی دوای خۆی لەسەری هەیە لە گاتاکانی زەردەشتیدا ئەم یەکگرتنە نییە کە خاوەنی دەنگی زەنگی یەکەمینی ئینجیل بێت.

(گیگەر) و (ئاشپیگل) و (ویندیشمان) دوای لێکۆڵینەوەکانیان لەسەر گاتاکان و بەراوردکردنیان بە (یەشتاکان) گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی کە تەواوی خواکان و فریشتەکانی هاوشێوەیان وەکو (ئاناهیتا) و (ورتەرغنا) و (تیشتریا) و (هائاومەسراوشە) و (فرەوشیان) یا

وەکو رۆحە باوك و باپیران ئەمانە دوای زەردەشت دروستکراون و ئایینی زەردەشتیش سوودی تەواوی لە یەکتاپەرستی وەرگرتووە، جگە لەوانەش زەردەشت لە بوونی (میترا) و (ئاناهیتا) ئاگادار بووە، بەڵام هەرگیز ڕێگای نەداوە خاوەن هێزو دەسەڵاتبن. ئەوانە لە (یەشتاکان) و بەشەکانی ئاوێستای نوێشدا نیوە خوا بوون هاوشێوە مرۆڤ،

هەروەها لەسەر شێوەی ئاژەڵیش وێنەکانیان بە تەنکراون، لەناو فرە خوایەتی (ئانترۆپۆمۆفیزم)ی گاتاکانیشدا تەواو بێگانەن. جارێکیتر ناوبراوان دەنووسن: ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ مێژوو چینێك بەناوی موغەکان سوودیان لە مەزەبی زەردەشت وەرگرتووە، بەڵام لە هەمانکاتیشدا لادەربوون لەوانە هەشە لە پاشماوەکانی زەردەشت کە بە ڕەسەنی ماونەتەوە لەوانە سرووودەکانی (وەحی) کە بۆ زەردەشت هاتوونەتە خوارەوە، بەڵام دواتر لەلایەن جادوکەرانەوە تێکەڵاوی کاری جادوبوون بۆ چاکبوونەوە لە نەخۆشی یان نزایان بۆ مردوو خوێندووە، بەڵام دوای زەردەشت ئەو ئایینەی کە بیرەکەی لە زانست و زانیاری باوك و باپیران وەرگیرابوو دراوەتە دەست فەرامۆشکەران.

لە ڕاستیدا ئەو کارانەی دوای مەرگی زەردەشت ئەنجامدراون پێچەوانەی کارەکانی ناوبراو بووەو لادەران وانیشانیان داوە کە هاوشێوەی ئاوێستاو یەکتاپەرستی زەردەشت مامەڵەیان کردووە.

گرووپێك کە سەرچاوەکەیان هاوشێوەی ئاوێستا بووە بە مانا مەزەبی ئارياییەکان بەر لە گاتاکان هەبووەو سەرچاوەی لێکۆڵینەوەو بڕیاردانیش بووە ئەوە بەڵگەی ڕێککەوتنێك ئەدات لەگەڵ خواکانی مەزەبی کۆندا کە بەشێوەی ئاشتی لە نێوانیانا بەستروە.

لە بوونی (زەردەشت)یشدا ئەم خوا زۆرانە هێزێکی سروشتی گەورەبوون لە ڕوودا ئەوی لەناوی بردوون یەکتاپەرستییەکەی زەردەشت بووە کە چەند چاخێك بەر لە (مەسیح) بڵاوبۆتەوە، ئەو خوایانەش شایەتی ڕەواج و بازاڕ گەرمی خۆیان ئەدەن کە هاوشێوەی تەرزی (ئاهۆرامزدا) بوون.

(سێر پێرسی سایکس) باوەڕی وایە کە نفووسی موغەکان لەناو ئایینی زەردەشتدا بە ڕۆشتنی کات ئامۆژگارییە جوانەکانی تێکەڵاوی ئەفسانە و ئاداب و ڕێوڕەسمی بێ سەروبەربوون، ئەم کارانەش تایبەت بووە بە ڕۆژگاری دەسەڵاتی ساسانییەکان. (گیبۆ) دەنووسێ: لە ڕۆژگاری ساسانییەکاندا وەکو پاشماوە تەنیا ناوی زەردەشت مابوو تێنەگەیشتنیش لە مانای پەیامی زەردەشت هۆکاربووە لە دروستکردنی (72) تیپی جیاجیا کە بەناوی زەردەشتەوە هەبوون.

(دهالا) دوای ئەو لادانەی لە ئایینی زەردەشت پەیدابووەو گۆڕینی باوەڕە ئاینییەکە و گەیاندنی کارەکانی بە دۆعا و نزاو جادوکردن.. دەنووسێ: ((لەم گەیشتنەی ئیرادەی ئایینەکەیە، بەردبووە بەهۆی دەستکەوتی مادی و باوەڕهێنان بە ئاوێستای نوێ و هاتی چاخی پەهلەوی بەدوایداو لادانی ئایینەکەش لەو قۆناغە لە ڕێبازی تەواوی ڕەسەنی جارێکیتر ئەو دەنووسێ: ((ئەو واقیعە بووە سەرچاوە بۆ پشتگیری لە هەموو لێکۆڵەرە خۆرئاواییەکان لە هەمان کاتیشدا مزەبی زەردەشتی بۆ چاکسازی بووە لە بیروباوەڕی ئێرانییە کۆچەرییەکاندا، بەڵام ئەم گۆڕانکارییە زۆر دەوامی نەبوو ئەوەش بەهۆی کاریگەری دژە ریفۆرمێك پەیدا بوو کە دوای مەرگی پەیامبەر هاتووەو کارەکانیش سەرلەنوێ پێەوانەبوونەتەوە. دروستبوونی ئەم کارانەش هۆکارەکەی نوێبوونەوەی ژیانی مەزەبی بوو کە لەمەوبەر (زەردەشت) لە هەوڵدابوو بۆی ئەوەشی بەهۆی ئەو پەیامەوە بوو کە هەیبوو گۆڕانکاری بکات.

لەو هەوڵەیدا پەیامبەرانی خواکانی ئیندو ئێرانیش پایەو نفووسیان لە دەستداو لە شوێنی نفووسی ڕۆحانییەکان دەرکەوت کە بەو هۆیەوە ئەو تاج و تەختەی لەدەستیاندا بوو لە نوێوە بۆیان گەڕایەوە، نفووسیشیان کە کەمێك رازیبوونی ویلایەتەکانی ناوخۆی ئیمپڕاتۆریەتی ئاهۆرامزدای لەسەر بوو، بڕیاری لەسەردراو بلاْبۆوە.

ڕێوڕەسم و دروشمی ڕەگوڕیشەی ئەو ئایینەش لای مرۆڤ لەوە قوڵتر بوو کە ناچار بکرێت بەزوویی و ساکارانە نێوانەکە چۆڵ بکات، ئەوەبوو دوای ڕۆحانییەکان ناچاربوون بەهۆی کەسایەتی گەورەو سەرکەوتووی زەردەشتەوە دوای مەرگی بەو دنیا فراوانەی دەرەوەی بگەن. (بویس) باوەڕی وایە کە پەیڕەوانی زەردەشت هەتاکو ئەمڕۆش بە ئایینێکی لادەرەوە پابەندن و بەناوی زەردەشتەوە کاردەکەن، ئەو کارانەشیان لەگەڵ ئامۆژگارییەکانی زەردەشتدا یەکناگرنەوە. ئەو دەنووسێ:

پەیامبەری ئێرانی کۆن هەڵگری پەیامی ئایینی یەکتاپەرستی ژیر و پڕ ڕەوشتی بەرزو پیرۆز بووە، تاوەکو سنوورێکیش لە دروشمەکانیدا لەگەڵ پەیڕەوانی خۆیدا بە ئارام بووە لە هەمان کاتیشدا دوور بووە لێیان، هەرچەندە ئەوانە بە ئامۆژگارییەکانی ئەو کاریانکردووە، بەڵام بەزوویی لە سەردەمێکدا نەیانتوانیوە درێژە بە کارەکانیان بدەن بۆیە بەزوویی لە کاروان لایانداوەو گەڕاونەتەوە بۆ باوەڕەکانی بەر لە زەردەشت.

ئەو باوەڕی وایە: ((یەکێك لە گرنگترین بەشەکانی ئامۆژگارییەکانی زەردەشت کە کاریگەری زیندوویان هەبووە لەسەر بیری مەسیح باسی قیامەتە، ئەو ئامۆژگاریانەش کارتێکردنی لە مەزەبەکانی دوای خۆشی

هەبووە وەکو (بوزی) و (عیسایی) و (ئیسلام). لەوەوبەر لە کۆبوونەوە جیاجیاکاندا ئاماژەم بەوەدا وەکو یادکردنەوەیەك بۆ ئەو شتانەی کە پەیوەستن بە ئایینی لادەرو تا چ سنوورێك لەوەستانیا بووەتە بەرد بووە لە کۆمەڵگایەکدا کە کاریگەری بنەڕەتی هەبووە. بەداخەوە هیچکام لەو ئایینە یەکتاپەرستیانەی جیهان لەلادان نەپارێزراون و بەدرێژایی رۆژگاریش لە ئامانجی رەسەنی خۆیان دوورکەوتوونەتەوە. ئایینی جولەکە و عیسایی بەهۆی نەبوونیان لەسەرچاوەی رەسەن و پەیامی حەقیقیاندا بۆ یەکاریگەری لادان لە دامەزراوەکانیانا بەدرێژایی مێژوو تێکەڵاوی خەرافیات و شتی لادان بووە کە پێوەیان ئالوودە بوون و بوونەتە بەشێك لە بابەتە تەشریفات و هەمە جۆر دروشم و لەناویانا ماونەتەوە.

لە سەرچاوەی ئیسلامیشدا بوونی قورئانی پیرۆز کە پەیامی واقیعی (محەمەد)ەو مێژووی رووداوەکانی سەردەمەکەی لەخۆگرتووە بۆ زانیاری پەنای دەبرێتەبەر کە پڕە لە رەسەنایەتی، بەڵام دەرکەوتنی توێژێکی رۆحانی کە هەڵسوڕێنەری مەزەبە جیاجیاکان بوون بەهۆی رێوڕەسمی تەشریفاتی و ئاداب و بڵاوکردنەوەی خەرافیات توانیویانە بەردەوامی بە ژیانی خۆیان بدەن.

لە سەرچاوەی لادان لە ئایینی (مەزدیەسنا)شدا کە بابەتی باسەکەمانە لەم نامەیەماندا ئەو شتانە دەبینین و قسەمان لەسەریانە. گاتاکانیش کە تەنیا یادگاری زەردەشتن و بەشێکن لە پەیامی ئەو لە ناو ئایینەکەدا کەسانێك دەبینین کە پۆشاکی رۆحانیەکانیان پۆشیووەو سەرپەرشتی ئایینەکە دەکەن، تیۆرەکانیان لە کۆمەڵگادا بەناوی ئایین بڵاودەکەنەوە. ئەم واقیعەی دروستیانکردووە هۆکارێکی موناسیە بۆ ئەوەی ئیبداع بکەن لە خەرافیات و دۆعاو نزای پاڕانەوە بۆ ناسینیان بەناوی ئایینی زەردەشتەوە تا دەربکەون.

لەوەوبەر ئاماژەمدا لە گاتاکاندا ئاسەوارێك نییە لە ئاداب و رێوڕەسم و دروشم کە بەشێکن لەو پەیامە کە تەواوی پێچەوانە و دژی باوەڕو ئاداب و رێوڕەسمی مەزەبی کۆمەڵگای ئەو رۆژگارە نەبووبن. پێکهاتەی فەلسەفی و بیری گاتاکانیش بۆ مرۆڤێك دانراوە کە باوەڕی بە مەزەبی کۆچەری و بتپەرستی و خەرافیات بووەو بۆی ماوەتەوە. ئایینەکە بەو هۆیە بووەتە بەرد بووەو لە رۆژگارە نوێکەدا نامۆ بووە بۆیە تەنیا بە رۆشتنی کات ئومێدی گەورە بۆ دەست لێبەربوونی دروستبووە.

بە شیکردنەوەی ئایینی جولەکە و بە رۆشتنی چەند چاخێك وردە وردە دەرئەکەوێت (یەهوە)ی خوای عەشیرەت کە گۆڕاوەو بووەتە خوای جیهان. لەمەدا پەیامبەرانی (بەنی ئیسرائیل) بەپێی تیۆری یەکتایی لەژێر کاریگەرێتی ئایینی ئێرانییەکاندا بوون کە بەرەو رووی

ئایینەکەیان بووەتەوە، بەڵام گەلی جولەکە ئامادە نەبووە ئەم تەرزە بیرکردنەوەیە لە باوەڕیاندا جێگیر بکەن. لە سەرچاوەی زەردەشتیشەوە گەلێك هۆکار هەبوون کە پەیامی ئەو دوای مەرگی بە تەواوی فەرامۆشکراوە.

1- زەردەشت جێنیشینانی دەرکەوتووی خۆی کە پەیامی ئەویان لەبەر کردووەو پاراستووەو بلاّویانکردۆتەوە، بەڵام بەپێی ئامۆژگارییەکانی تێنەکۆشاون کارەکانیان فراوان بکەن. نەخشەیەکیش کە پەیامبەرانی بەنی ئیسرائیل بەناوی هۆکاری بیرخستنەوەو یادەوەری پەیمانی (یەهوە) یان وەرگرتووە بۆیە ئایینی جولەکە بەردەوام کاریگەری گەورەی هەبووەو ئایینەکەش هەر بەو شێوەیە لەو هۆکارانە بێبەش نەبووە.

2- عەشیرەتی ویشتاسپ بەپێی توانایان و زۆری نفووسیان سەرکەوتوو بوون لە بلاّوکردنەوەی خێرای ئایینی زەردەشتدا.

3- زەردەشت لە رۆژگارێکی کۆندا لە ناوچەیەکی دوور دەرکەوت کە هیچ جۆرە پەیوەندییەکی بە مەڵبەندەکانی شارستانییەتەوە نەبووە بۆیە ناوی ئەو لەو رۆژگارەدا لە دنیای شارستانیەتدا بە نەناسراوی ماوەتەوە.

4- ئایینی نوێی سەرسووڕهێنەر کە لەگەڵ پێداویستییەکانی رۆحی مادی مرۆڤدا یەکدەگرێتەوە هۆکار بوو بۆ بزووتنەوەیەکی دیار لە کۆمەڵگادا بە ئامانجی بلاّوکردنەوەی ئایینەکە و گۆڕانکاری تیایدا.

بەجۆرێك کە لەوەوبەر ئاماژە هەیە ئایینە گەورەکانی جیهانیش هەر هەموویان بەو هۆکارانە لەناو وڵاتانی گەورەو خاوەن نفووس و دەسەڵاتدا و لە ناو خاکی خۆیاندا بلاّوبوونەتەوە.

ئایینی زەردەشتیش لەکاتی سەرهەڵدانیدا بە تەنیا ئەو هۆکارانە نفووسی بۆ پەیدا نەکرد مایەوە تاوەکو دەرکەوتنی دەوڵەتی گەورەی هاخامەنشی (550-330 پ.ز) کە لە خاکی پارسدا ژیاوە. زەردەشتیش نیشانەکانی لە مێژوودا هەیە و لە فەرهەنگی ئاوێستاییشدا کاریگەرێتی هەبووە.

ئێرانییەکانیش بەر لە هاخامەنشییەکاندا لەسەر خاکی پارسدا ژیاون و نیشانەکانی ئەوانەش لە مێژوودا لە فەرهەنگی ئاوێستاییدا کاریگەرییان هەبووە، بۆیە هیچ گومانێك ناتوانێت جیاوازی بنەڕەتی لە نێوان ئێرانییەکان و هیندوانەکان دروستبکات چونکە لە

ریشەیەکەوە سەرچاوەیان هەڵگرتووە، بۆ ئەوەش تەنیا لە قاڵبێکی فەرهەنگی ویدایی و فەرهەنگی ئاوێستایی دەتوانین بەرەو روویانبکەینەوە.

هەرچەندە ئاوێستا دووبارەکردنەوەی وتەکانی پەیامی زەردەشت نییە، بەڵام وردە وردەو لەسەرخۆ بنەماو پایەی ئایینەکە بەرەو لادان چووەو ناتەواوی تێکەوتووە لەوەی کە هەبووە. کاریگەری نارێکی گەیاندنی پەیامی زەردەشتیش هۆکاربووە کە بنەماو واقیعیەتی ئایینەکەی تیایدا لەبەرچاو نەگیرێت ئەوەش لە دایکبوونی فەرهەنگێکی نوێی لێکەوتەوە کە هەمان فەرهەنگی ئاوێستایی بوو، بەڵام بە درێژایی کات جێگیر نەبوو چونکە رەنگی گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵگای ئێرانی بەخۆوە گرتبوو. نەگەیشتن بە گاتاکان و فەرامۆشکردنیان لەلایەن رۆحانییەکانەوە، لەدەستدانی واقیعی زانیارییەکان بوو لەسەر زەردەشتییەت بۆ ئیبداع کردن و دۆزینەوەی شەعایر و باوەڕە نوێکان بوو کە تا چاخێکیش بەر لە دۆزینەوەی گاتاکان جێی سەرنجدانی خۆرهەڵاتناسان بوو. ئاوێستای دواییش ئەدەبیاتی پەهلەوی و ئایینی زەردەشتی بە ئێمە ناساند کە باوەڕی کۆچەری لە ئاداب و رێورەسمی کۆن بەدرێژایی مێژوو بەناوی خواپەرستییەوە خرابوونە ناوی. هەتاکو ئەمڕۆش پارسییەکانی هیند کە تاکە کۆمەڵگای زەردەشتین هەمان باوەڕو شەعایری خەرافییان هەیە و بەناوی ئایینی زەردەشتەوە کاری پێدەکەن. زاراوەی گاتاکانیش کە زمانی رەسەنی پەیامی زەردەشتە چەند چاخێك دوای مەرگی زاراوەکە لە ئەدەبیاتی ئاوێستاییدا زانیاری نوێی لەخۆگرتووە، بەڵام لەگەڵ کاتاکانی دواییشدا جیاوازی هەبووە. لە سەردەمی مادو هاخامەنشییەکانیشدا نەوەك تەنیا زاراوەی تایبەت بە مرۆڤ ئەوەی هەبوو گۆڕاوە بەڵکو زمانی مەزەبی بەگشتی شێوەی نوێی بەخۆوە گرتووە. لەم بوارەدا ئایین شوێنی خۆی تەواوکردەوەو توانیوویەتی خۆشی پشتاو پشت بچەسپێنێ بۆیە دەتوانم بڵێم ئایینەکە هەرگیز بە ساکاری نەماوەتەوە یان فەرامۆش نەکراوە. زمانی ئایینییش پایەی ئایین دائەمەزرێنێت و هەتا کاتیش بڕوات ئایین پاشماوەی هەر دەبێ و زمانەکەشی پایەدار دەبێت.

لە سنووری دوو هەزار ساڵ بەر لە ئێستا بەسەر مێژووی ئینجیلەکاندا رۆشتووە، بەڵام زمانی ئەوانە کە بە زمانی کڵێسا گۆڕاوە هەتاکو ئێستاش هەر زیندووە. ئەگەر زمانی کۆمەڵگای مەسیحی شێوە زمانی ئینجیلەکانی وەرنەگرتایە:

**یەکەم:** ئەگەر ئەم نامانە بە زمانی عیبری بوونایە کە بەپێی داستانەکان عیسا بەو زمانە قسەی کردووە رێك نەدەخرا.

**دووەم:** ئەو داوایانەی شەرحی حاڵە و باسیاندەکرێ ئەگەر بگۆڕدرێن بۆ زمانەکانیتر ئینجیلە سەرتاییەکانیش لەگەڵیا دوور دەبن لە رەسەنایەتی و دەگۆڕین.

**سێیەم:** هەنگاوێك کە مەسیحی لە ئەوروپادا زۆر بوو قەومێك کە بە زمانی عیسا، یان عیبری قسەیان دەکرد بە گەورەترین دوژمنی عیساییەکان دەناسران. زمانی تەوراتیش دوای (3) هەزار ساڵ بەو هێ.ەی خۆی مایەوە کە هۆکارێك بوو بۆ یەکیەتی و مانەوەی قەومی جولەکەی لە خۆی کۆکردەوە.

گاتاکان وەکو ئینجیل و تەورات بە زمانی ئاسایی رێکنەخراون بەڵکو کۆمەڵێك سروودی پڕ ئاماژەو زاراوەن کە گۆڕینیان بە ساکاری ئاسان نییە. ئەم سروودانە لەناو لایەنگرای زەردەشتدا بەشێوەی نزا خوێنراون و لە خوا پاڕاونەتەوە لەکاتی نوێژدا. ناوەڕۆکی نزاکانیش نەگۆڕ بوون و گۆڕانیان تیادا نەکراوە بۆ سوودی خاوەن باوەڕو لەسەر شێوەی خۆیان ماونەتەوە.

(دهالا) باسی نزای گاتاکان دەکات کە رستەو شێوەی زمانیانی گۆڕیوون بێ ئەوەی بتوانێت لێیان تێبگا یان رستەکان مانای چ بەدەستەوە ئەدەن. ئەم گۆڕین و گۆڕانکاریانە دەکرێ لە شێوەیەکدا بەرەو رووی یەکتری بکرێنەوە چونکە ئەو مەزەبە بۆ ماوەیەکی دوور بەبێ هیچ دامەزراوێك توانیوویە خۆی بپارێزی و بڵاویش ببێتەوە

بێئەوەی هەڵگرانی مەزەبەکەش لە نێوانەکەدا مابن. ئەگەر گۆشتاسپ کەمێك گرنگی بە رامیاری دەوڵەتەکەی بدایە و سوودی لێ ببینایە و رێگای راستی نیشان بدرایە و دامەزراوەکانیان هەڵگری پەیامی زەردەشت بوونایە و پێشەکێش گاتاکان بە زاراوەی رەسەن بۆ نەوەی نوێ بگۆڕانایە بەو جۆرە بڵاوبوونەوەی مەزەبەکە رۆژ بە رۆژ فراوانتر دەبوو. زمانی گاتاکان لە دیدی پەیڕەوانی زەردەشت زمانی دۆعا و پەیوەستکردن بە دنیای عەیب و نهێنییەکانییەتی و هەرگیز بە پێویست نەزانراوە فەرامۆش بکرێت. ئەم ناوەڕۆکە لەبەرچاوی عامەی خەڵك و پیاوانی ئایینیان پیرۆزترین و بەنرخترین یادبووەو نەتوانراوە وادابنرێت بەو ساکارییە بەدەستی فەرامۆش بسپێردرێت گەرچی زمانی کۆمەڵگاش گۆڕاوە.

ئەوەی من دەیبینم نە تەنیا بڵێم زمانی گاتاکان فەرامۆشکراوە بەڵکو هەموو لێکۆڵەرانیش لەسەر ئەوە کۆکن کە لە ڕۆژگارەکانی خوێندنەوەی گاتاکانیشدا موغەکان و موبیدەکانی زەردەشتی بە دروستی لە مانای تەواوی تێنەگەیشتوون.

دوای مەرگی ویشتاسپ و زەردەشت ئەگەر کۆمەڵگای برایان و ئەنجوومەنی (ئاخوتی) زەردەشتی نەبوونایە ئایینەکە لەو کاتەدا توانای بەردەوامی نەئەبوو لەناو عەشایر و کۆمەڵگاکانیتردا کە نفووسی هەبێت، خودی ویشتاسپیش ئەگەر گاتاکان نەبوونایە گوماناو دەبوو لەگەڵ کەسانیتردا و ناویان لە مێژوودا دەرئەهات هەروەکو چۆن مێژوو لەبەرامبەر هەزاران سەرۆك عەشیرەت و عەشیرەتیتردا بێدەنگە.

لە گاتاکاندا جارێکیتر ویشتاسپ فەرمانڕەوایەکی دەرکەوتوو نەبوو ئەو یەکێك بوو لەگەڵ ژمارەیەك لە یاوەرانی زەردەشت وەکو (فەرش)، (ئوشترە)، (جاماسپە)، ئەوانە لە لایەنگرانی بوون کە ژمارەیان زۆربوون.

ئەو لە ئاوێستای دواییشدا لەگەڵ باوەڕدارانی کڵێسا و ویشتاسپ کە پادشایەك بوو هەتاکو شاهەنشایەکی دەرکەوتووش بوو کە لە ناویانا زەردەشت وەکو نیوە خوایەك دیاربووە.

لێکۆڵینەوەیەکی سیستماتیکی لەسەر ئاوێستای دوایی دەریئەخات ئەوەی لە گاتاکاندا هەیە بەناوی ئەدەبیاتی زەردەشتی کە تا ئێستا بەدەستمانگەیشتووە باوەڕیان پێناکرێت و شوێنی گومانن. پلەی ڕەسەنایەتی ئەو نووسراوانەش لە پەیامی زەردەشتدا پەیوەندی نزیکی بە کۆنیانەوە هەیە، هەرکاتێکیش لەسەرچاوەکە یان کۆنترو نزیکتر بوون بە هەمان ڕێژە پوختەتر دەرئەچن.

بەپێشکەوتنی زانست و مرۆڤ و گەورە بوونی شارستانییەت و تیۆرە زانستییەکانیش خەرافیاتی ئاوێستا هەر کەمینە کردووە بەڵکو زیاتر درەوشاوەتر بووە، بەهەمان شێوەش ئایینەکانیتریش چارەنووسیان هەر بەو جۆرە ڕۆشتووە.

ئەم ڕووداوە، نیشاندەری چۆنیەتی ئەو ئایینەیە کە بە میراتی ماوەتەوەو پەیوەندی نییە بە زانین و شارەزایی خەڵکەوە.

پەیامی زەردەشت کاتێك واتا و ناوەڕۆکی دوگماو حەق بەستوو کە بەهۆی لێکۆڵەرەوە نازەردەشتییەکان بەبێ لایەنگریی و دوور لە ڕاسپێری ساکارو بێئاگایانە دەستیانکرد بە لێکدانەوەو شیکردنەوەی گاتاکان. هەرچەندە ئەم لێکدانەوەو شیکردنەوەیە دوور بێ لە

کاریگەریی وتەکانی ئاوێستا ئەنجامەکەی راستتر ئەبێت بە جۆرێك کە کەمترین کاریگەریی لە وتەکانی ئاوێستا بە تەواوی بابەتە تێکدەدات و پێچەوانەی ئەکاتەوە.

ئەو هۆکارانەی باسمانکردن دەتوانین بەهۆیانەوە هۆکاری لادان لە ئایینی زەردەشتی بەدەست بهێنین. بەدەستهێنانی ئەوانەش لای لێکۆڵەران دەبنە هۆکار کە لادان لە بینای پەیامی زەردەشت ئەوە دەگەیەنێت کە رووبەڕووی کێشەکان بۆتەوە.

بۆ شیکردنەوەی شێوە لادان لە ئایینی زەردەشت واباشە هەموو ئەدەبیاتی زەردەشتی بخەینەبەر باس و لێکۆڵینەوەو لەگەڵ گاتاکاندا پێوانەیان بکەین خودی ئەو کارەش پێویستی بە دەیان نامە هەیە. بۆیە کاری نووسین لەو جۆرە پێناچێت تەنیا هەر بۆ بەسەربردنی کات بێت. بەناونیشانی شتێك نموونەی خەرارێکە بە چەند سەرچاوە ئاماژە دەدەم.

ئەولنە لەو کەسانەبوون وەکو گەڕۆکەکان لە گەڕاندا بوون و لایەنگری زەردەشتی گەورەبوون. ئەم ئاوێستایەی دواییش کە باوەڕدارانی کلێسایی باوەڕیان پێبووە (ویشتاسپ) لایان پادشا بووە یان شاهەنشایەکی دانراو و (زەردەشت)یش بە هەمان شێوە نیوە خوایەك بووە.

لێکۆڵینەوەی (سیستماتیکی) لەسەر ئاوێستای دوایی ئەو راستییە نیشاندەدات کە غەیری گاتاکان ئەوانەی بەناوی ئەدەبیاتی زەردەشت هەتاکو ئێستا بە دەستگەیشتووە بۆ ئەوە ناشین باوەڕیان پێبکرێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم نووسراوانە لە پەیامی زەردەشتدا لەڕووی کۆنیانەوە پەیوەندییەکی نزیکیان هەیە هەروەها لە سەرچاوەیەکی کۆنیشەوە هاتوون و پوختەن، بەڵام لای مرۆڤ لەگەڵ پێشکەوتنی زانست و گەورەبوونی شارو تیۆری زانستیدا ئەمانە نەتەنیا خەرافیاتی ئاوێستایان کەم نەکردۆتەوە بەڵکو بەردەوام لە زیادبوونیشدا بووە بە هەمان شێوە بەرامبەر ئایینەکانیتریش بەختیان هەروا وابووە. ئەمانە بەو جۆرە لەناو ئایینەکەدا بوون و پەیوەندییان بە زانست و وریایی مرۆڤەوە نەبووە. پەیانی زەردەشتیش سەردەمانێك بووەتە بەرد بووە بەهۆی ئەوەی کەوتووەتە بەردەستی لێکۆڵەرانی غەیری زەردەشتی کە نائاگایانە بوونەتە سەرچاوە بۆ لێکۆڵینەوەی نازانستی و بڕیاردان لەسەری بە تێکەڵکردنی بەزانستی غەیری مەزەبی، بەو جۆرە بەناوی لێکۆڵینەوە کاری خۆیان لەسەر گاتاکان ئەنجامداوە بێ ئەوەی سەرکەوتن بەدەستبهێنن. لێکۆڵینەوەش لەسەر ئاوێستا زۆر پێویستە بکرێ چونکە هەتاکو ئێستا کە نەکراوەو لادەرانیش رۆڵی تێکدەرانەیان تیایدا بینیووە. ئەگەر ئەو هۆکارانە باس بکەم دەتوانم لە هۆکاری لادان لە ئایینی زەردەشتی تێبگەم. لای لێکۆڵەرانیش ئەو

هۆكارانە تەواو نەزانراوە كە ئەوەش رووبەڕوونەوەی لادانە لە بنەمای پەیامی زەردەشت كە بە چەند شێوەیەك دێنە بەرچاومان.

بۆ توێژینەوەو چۆنێتی لادان لە ئایینی زەردەشت بە باشی دەزانین لێكۆڵینەوە لەسەر هەموو ئەدەبیاتی زەردەشت بكەین لە هەمانكاتیشدا لەگەڵ گاتاكانیشدا بەراوردیان بكەین تەواوكردنی ئەم كارەش دەیان نامەی دەوێت.

بەو جۆرە كاركردن لەسەر ئەو نووسینانە پێویستە و ئەنجامدانیشی بۆ كات بەسەربردن نییە. هەستان بەو كارەش بەناونیشانی مشتێك نموونەی خەرارێكە كە لێرەدا ئاماژە بە چەند سەرچاوەیەك دەدەم.

لەوەوبەر بەیانمكرد نزیكترین ئاسەوارێك بە رۆژگاری گاتاكان (یەسنای حەوت بەشە) كە (سەنای 35-42) دەگرێتەوە یان (هەپتا هائیتی)یە. بەهۆی ئەوەی بەشێوەی زاراوەی گاتاكان دارێژراوە كە پەخشان ئامێزە. ئەمە سەرنجراكێشترین (یەسنا)یە لەوانە كە نزیكن بە رۆژگاری زەردەشت كە تیایاندا لادان دەبینرێ و كاریگەرێتی دێوپەرستی و فرەخوایەتیش هەیە.

(ویداكان) كەمە كەمێك لەو (یەسنا)یەدا تیشكیان داوەتەوەو بوونەتە پردی نێوان گاتاكان و ویداكان كە بەو جۆرەی لێهاتووەو ئەو دیمەنەی وەرگرتووە. (هاومە)ی سەرچاوەی نەفرەت و خۆشی كە خەڵكی دەخاتە ناخۆشییەوە زەردەشت سەرلەنوێ داوای مەرگی بۆ كردوون بۆ ئەوەی پاك ببینەوە، یان لەم شوێنەدا فریشتەی رزگاركەر دەبینی لە وەسفیدا ((هاومەی رەنگ ئاڵتوونی ئاگاداركردووەتەوە كە خۆی چاك بكات دەنا (هاومە)ی مەرگ پاكیدەكاتەوە واتە باشیدەكان، (هاومە)ی ژیانیش نزای خێری بۆ دەكات))...

(نیبۆرك) باوەڕی وایە لادان لە ئایینەكەدا لەو رۆژگارەدا گەیشتووەتە پلەی خۆی ((خراپی ئەم مەشروبەش لەبەر ئەوە بووە مەستی هێناوە بۆ ئەمە نەفرەتی ئاگرو كاریگەرێتی زەردەشتیشی بەسەرەوە بووە، بەڵام دواتر لە كۆمەڵگای زەردەشتییەكاندا هۆكار بەدەستەوە هەیبووە كە سەرلەنوێ پیرۆزێتی خۆی بەدەست بهێنێتەوە)). لە یەسنای (38)دا ئاهۆرامزدا چەند ژنێكی هێناوەو خاك و ئاو و توخمەكانیتریش بەشێوەی خوا لە حەرەمسەرای ئەودابوون. لەم یەسنایەدا كچەكانی ئاهۆرامزدا ئاخاوتن دەكەن. لە یەسنای (36)دا ستایشی ئاگر دەركەوتووە، لەویداكانیشدا خوای ئاو ژنی (وارونا)یە، بەڵام لەم یەسنایەدا خوای ئاو

جارێکیتر هاوسەری ئاهۆرامزدایە، لە ویداکانیشدا ژنەکانی (وارونا) بە (وارونانی) ناویان هاتووە، بەڵام لە یەسنا حەوت بەشدا ژنەکانی ئاهۆرامزدا ناویان بە (ئاهورانی) براوە.

لە ویداکاندا (وارونا) خاوەنی هێزی نهێنی (مایا)یە و هەر لەو سۆنگەیەشەوە (مایین) ناوی بووە، لە (هەپتاهەنگی)دا ئاهۆرامزدا خاوەنی (مایا)ی خۆی بووە، یان (هومایین).

لە ویداکانیشدا (وارونا) نیزامی پێدراوە کە تەرەفداریەتی، لە یەسناکانیشدا (ئاشە) جارێکیتر لە تەرەفدارانی ئاهۆرامزدایە بە مەرتەبەی فریشتەی دەرکەوتوو. (ئامشەسپەندان)یش بۆ یەکەمجار بەشێوەی فریشتەکانی خوا ناوی براوە.

لە ویداکاندا (وارونا) هێنەری خۆشی و رووناکییە و حەوت بەشەکەی خۆرو رووناکیش لاشەی خوا مەزدایە.

ئەوەی لە سەنای حەوت بەش بەرچاو دەکەوێت ئاهۆرامزدایە، کەمە کەمێك (وارۆنا) نزیك دەبێتەوە لەمەدا (زهنەر) باوەڕی وایە کە ئەو دوو خوایە خوایەکن بە دوو ناو. (دهالا) دەنووسێ: لە یەسنای حەوت بەشدا رۆحی پەیامی زەردەستی دیوە.

دوای زەردەشتیش وردە وردە یەشتاکان و یەسناکان ئەو وشکی و بەرد بووەی هەیانبووە لایەنەکانی رۆحانی و زانستی و خواناسی تیایانا رۆشتووەو قورسیکردوون و شێوەی مادییان بەخۆوە گرتووە. ((ئامشە ئاسپنتەکانیش)) شێوە مرۆڤانەکەی تیادا نەماوەو نزا شوێنی باوەڕی رۆحانییەکانی گرتووەتەوە.

یەشتاکان کە دوای یەسنای حەوت بەش دێت بەشە کۆنەکانی کە لە سەردەمی زەردەشتەوە نزیکترە، تیایدا (ئامشائاسپدان) بەشێوەی خەزێنەی ئاوی خوایە و لە هاتنی (میترا)دا لەگەڵ سوپای بەهێزی ئاناهیتا دەبنە دوو خالقی بە توانا کە تیایانا سەرچاوەی ستایش کۆدەبێتەوە. (فرەوشییەکان) کە هەمان رۆحی باوك و باپیران بوون یادکردنەوەو پەرستنیان لەناو ئارییاییەکاندا سەرلەنوێ دەبینین و قوربانی و پەرستنی خوای (هۆم)یش رەواجی پەیدا کردووەتەوە.

لە یەشتی پێنجەمدا ئاهۆرامزدا فەرمان بە زەردەشت دەدات بچێتە خەڵوەتەوە، لە ئەو داوا دەکات کە سوپای پەیوەست بە خواوەند ستایش بکات. ئەو کە بە توانایە رووبارەکانی بەرداوەتەوەو هاژەیان دێت، سەرچاوەی کانیاوەکانی پڕ ئاو کردووە، گوڵی زۆر کردووەو مێرغوزاری فراوانکردووە، تەواوی تۆوی پیاوەکانی داناوەو ئامادەیکردووەو رەحمی ژنەکانیشی ئامادەکردووە.

لەشکری بەهێزو پاکی بێگەردی لە هەزاران ئاو بڵاوەداوەتەوە... لە دەروازەی هەر ئاوێکدا خانوویەکی ئاڵتوونی بەسەد پەنجەرەو هەزار کۆڵەکە بە ئاڕاستەی دە هەزار هەیوان دروستکردووە، لەم خانووانەدا لەشکر پێخەفی نەرمونیانی هەیە و لە ئایامیدان. ئەی زەردەشت ئەو بە بەرزی باڵای هەزار کەس وەکو تیرێك چۆن لە کەوان دەرئەچێت ئاوا لەشکر لەلاشەیەکی قەشەنگدان لە بنەمایەکی گەورەدا لە جلکی ئاڵتوونی چنراودا دەرکەوتوون. گوارەی ئاڵتوون لە گوێچکەیاندایە و گەردنیەندی ئاڵتوونیش لە گەردەنیاندایە. نێوانی مەمکە ئاڵتوونییەکانیان تووندو تۆڵن و بەجوانی بەرجەستەکراون. تاجی ئاڵتوونی هەشت گۆشەی بازنەیی و شێوە رازاوە بە هەزار ئەستێرە لەسەریاندایە و فەروەیان لە پێستی سێسەد سمۆرە پۆشیووە. (میتۆلۆژیای هیندی، ئێرانی، یۆنانی).

لە یەشتی دەیەمدا یان میترایەشت (مەهریەشت) ئاهۆرامزدا لەگەڵ زەردەشت قسە دەکات، بیری دەخاتەوە کە چۆن میترا (خۆر) لە تواناو پەرستندا هاوسەنگی خوایە. خواکان لەم یەشتەدا لەو خاکە پان و بەرینەدا خولقاون و هاتوون. یەزدانی مەلاییکە و هێزێك کە قورسایی هەبێت لە رۆحی میترا هێرشی بردۆتە سەر ئەهریمەن و شکستی بە ئەوداوە.

خوامیترا لە گەردوونەکەیدا کە ئەسپە سپییە بەهێزەکان رایدەکێشن سوار بووەو قەڵغانی زیوی بەدەستەوە گرتووەو جلکی پولەکەداری ئاڵتوونی لەبەردایە و بە قامچی لە ئەسپەکانی دەداو بە ئاسماندا دەڕوات. گۆپاڵی بەسەد گرێ سەد تیغ لە ئاڵتوونی پوخت بەدەستەوە گرتووەو سەد کەوانی بە تیری دوورهاوێژ و نیزەی بڵند لە خۆی داوەو بۆ جەنگی ئەهریمەنەکان و دێوەکانی بەدکار دەڕوات و لەناویان دەبات. لای چەپی (میترا) خوا (رشنۆ)ی دادوەری دوژمنی ئەهریمەنە و لای راستی ئەو خوا (سروش)ەو لە پێشییەوە خوا (وەرتەرغنە)یە (بەهرام) کە سەرکەوتنەو بەشێوەی تەوری تووڕە بە ددانە تیژە وەحشیانەکەیەوە دەڕوات...

ئاهۆرامزدا لە حاڵەتێکی تووڕەدایە و لەگەڵ دە هەزار پاسەوان و دە هەزار بار هێرش دەکاتە سەر سوپای ئەهریمەن...

(میترا) گەورەی بە توانا، کە جارێك لە مەرتەبەی ئاهۆرامزدا دادەبینرێت بە جۆرێك کە ئەو دوو گەورەیە، میترا و ئاهۆرا بە یارمەتی هەردوولایان کاتێك هێرشیانبرد، دەنگیان بڵند بوو دژیان وەستان و لووتی ئەسپەکانیان پرخەی دەهات ئەوەش لە ئەنجامی هێرشبردن بوو بۆ سەریان کە دەنگی دەدایەوەو تیری

کەوانەکانیشیان دوور دەڕۆیشتن. ئەو کاتە کوڕەکان کەسانێك بوون، کە زۆر بە خراپی بۆ بەجێگەیاندنی ڕەغبەتیان کوژران و کەوتنە ژێر خاکەوە بەهۆی هەڵەکەیانەوە.

(میترایی) و (ویدایی) و (میشەری) ئاوێستایی خاوەنی سیفەتی هاوبەش بوون. لە ویداکاندا پارێزەری پەیمانن و لە یەشتاکانیشدا هەر بەو جۆرە (میشەر)ی ئاوێستایی خاوەنی سیفەتی لەو جۆرو بەشەیە. لە ویداکاندا میتراو وارونا بە یەکەوە پەیوەستن و لە ئاوێستاشدا (ئاهورا) هەر بە هەمان شێوەیە. میترا لە بوونیا بەرامبەر (میشەر)ی درۆی ئاوێستایە. (میترا) لە ویداکاندا بە مانای دۆست دێ و هەر بەو مانایەش بۆ دۆست بەکاری هێناوە. (مەهر) (خۆر) جارێکیتر خاوەنی مانای خۆشەویستی و هاوڕێیەتی دەدات. لە یەشتاکانیشدا (میشەر) مرۆڤێکە ڕێگای (ئاشە)ی چاکەی گرتووەو لە ویداکانیشدا بە ڕێگای (ڕتە) ناوزەدکراوە.

لە ئاوێستای دوای زەردەشت لەو ڕۆژگارەدا یەزدان و خوا جیاجیاکان ئیبداعیانکردووە لەسەر حیسابی ئەوانەی دەرکەوتوون. لە (ویسپرد)، کردەی (80.1) و یەشتی (6.1) ژمارەی خواکان بە سەدان هەزار گەیشتوون.

((نیاپەرستی)) بە مانا باوك و باپیران پەرستی لە مردووان دەگرێتەوە کە لە مەرەبەکانی کۆچەری گەلانی جیاجیای مرۆڤایەتییە کە بە (تەو تەم) پەرستی دائەنرێت، لە پەیامی زەردەشتدا بچووکترین جێگاو شوێنی پێنەدراوەو هیچ کامێکیش لە لێکۆڵەران ئینکاری لەوە نەکردووە، بەڵام لە یەستاکاندا (فرەوشی)یەکان ستایشی ڕۆحی باوك و باپیران دەکەن کە شوێنی (نیا) پەرستی دەگرێتەوە.

لە یەشتی سیانزە یا وەکو (فەروەردین یەشت) فرەوشییەکان بە شێ,ەی فریشتەکانی پاسەوان دەرئەکەون و خواوەندیش خۆی بە زەردەشتی ڕاگەیاندووە، ئەوانە لە یارمەتیدانی ئاهۆرامزدان. خوا لە ئاسمان شوێنی هەیە کە لە کانزای درەوشاوەی ڕەق دروستکراوە، لەگەڵیشیا جلکی خواوەندەکەش جلکێك کە بە ئەستێرە جوانکراوەو ڕۆحی ئەوانە چنراون بەهاوبەشی میتراو ڕشنۆ و ئاسپنداری خواوەندی پیرۆز ئەو جلکە لەبەر دەکەن.

لەم یەشتەدا ئەوەی پێمان دەگات ئەگەر هێرشی پاسەوانەکان بۆ سەریان دووبارە نەبووایەتەوە لە خاکدا ئاسەوارێك نەدەما لە مرۆڤ و ئاژەڵ، و درۆش لە دنیادا حکوومەتی دەکردو ئەهریمەنیش سەردەکەوت بەسەر ئاهۆرامزدا. ئەوانە واتە (فرەوشییەکان)ن کە پێشووتر

له شەڕیاندا بەربەرەکانی ئەهریمەنیانکردووە بۆ خۆیان سەرکەوتنیان بەدەستهێناوە. ئەوانە بەیارمەتی سەران و دادوەری شارەکان دەسەڵاتیان بە سەر وڵاتەکەدا دەڕواو هەرکاتێك بیانەوێن بەخێرایی ئەوەی بە بیریانا دێت بۆیان دەبێت بە (یەکێتی پەرستگاو دەربار).

ئەوانە لە رۆژگاری (هامسپاپمدای)دا (دە رۆ ژی دەما بۆ کۆتایی ساڵ و جەژنی نەورۆز) دەهاتنە سەر زەوی بۆ لای خێزانەکانیان تاوەکو چاویان پێیانبکەوێت

و لە بیریاندا نیازیان بە باشکردن و فرە خوانی بووە، لەمەدا ئامانجیان بۆ ئەوە بووە بەکارێك هەڵبسن تا گۆشت و جلك لەبەردەستیانا بێ و پێشکەشیان بکەن و دڵیان بۆ لای خۆیان رابکێشن و نزاو پاڕانەوەیان بۆ بکەن. ئەگەر بەو جۆرە خانووەکانیان خانووی خانەوادەکانیان بێت کوڕانی جوان و ئەسپانی تیژ پا داوا دەکەن بە پاداشتی (ئاشە) داواکەیان لە دەستیانا دەبێت.

ئەوەی سەرنجڕاکێشە و هەتاکو ئەوەی روونیشە جیهان لە بوونی ئەو گەوهەرانەیە وابەستەیە: ئاهۆرامزدا دەڵێ: تیشکی ئەو گەوهەرانەیە جیهان لەسەر ئەو بناغەیە وەستاوە. خۆرو مانگ و ئەستێرەکان لە رێگایدا ئەوەی ئەو نێوانە دەبڕێت. لە یەکەم دروستکردنی ئەو ماوەیەدا خۆرو مانگ و ئەستێرەکان و تیشك و بێپاو ئاو و گیا هەر یەکێکیان لە شوێنی خۆیاندا بێ جوولە بوون. تیشکی گەوهەرەکان پاکبوون و جوولەیان داوە بە ئەستێرەکان کە رێگای خۆیان گرتووەو ئاوێش رۆشتووە و گیاش دەستی کردووە بە نماکردن.

لە یەشتاکانی 13 و 11 و یەسنای 3 و 57 خوا سروش سەرچاوەی ستایش و بڕیاردانە. خانووی ئەو لەسەر هەزار کۆڵەکە دانراوە کە ناوەوەی بە رووناکی خۆی سروش رووناك دەبێتەوەو دەروەی بە ئەستێرەکان رۆشن دەبێتەوە. گالێسکەی ئەو بە چوار ئەسپی نورانی رادەکێشرێ کە لە با چاپووکترن و لە باران توندترن و لە تواڵەکان تیژ پەڕترن و لە تیژپەڕان خێراترن. چەکی ئەو دۆعایە.

لە یەسنای 57 ئەو بەهێزترین و کوشندەترین و باڵاجوانترین و پڕ گەورەییترینە و دژی هەموو دێوانە و لە گەڵیانا شەڕ دەکاو... دێوەکان لە دیتنی ئەو لەچاو وندەبن و بۆ خاکی تاریکی رادەکەن. ئەو گەورەترین دوژمنی دێوانە.

لە یەشتی یانزە سروشتی پیرۆز (3) جار لە شەودا هاتووەتە سەر زەوی تاوەکو دێوەکان و دێوانی گەیلان و مازندەران لەناوبەرێت. ئەو لە شەڕەکانیدا بە گۆچانی خۆی تیپی دێوەکان سەرکوت دەکات.

هاوەمەی یەشت سەرتاسەر هاوەمەی جوان و بالاّ بلّندە، و لە یەسنای (10) هەتاکو لە ڕێوڕەسمی نۆشینی هاوەمەی خۆشی، سروش لە ئاسماندا هەتا لە بەرامبەر هەر دلّۆپێکی هاوەمە هەزار دێوی لەناوبرد (هەر دلّۆپێك لە فرمێسك هەزار گوناح پاکدەکاتەوە لە ستایشی مەشروبی هاوەمەی خوادا، هاوەمە جارێکیتر سەرچاوەیە بۆ گەورەیی و بڕیاردان لەسەر ستایشکردنی.

قوربانی بەخوێنڕشتن کە پێشەکی لە تەرەفی زەردەشتەوە بەگشتی دوورخراوەتەوە، لای لێکۆلّەرانی زەردەشتی و غەیری زەردەشتیش ناچار رازیبوون بەوەی کە هەیە، سەرلەنوێ لە یەشتاکانیشدا کاری پێکراوە. لە یەسنای حەوت بەشیشدا هەتاکو ئێستا ئاخاوتن لەسەر قوربانی نییە، بەلاّم لە سەتاکان و یەسناکاندا قوربانی کارێکی پەسندەو نیشانەی پەرستن و ئیرادەیە بۆ خۆی هەروەکو چۆن مەزەبی ویدایی هۆکارە بۆ گەیشتن بە ئەنجام.

لە (ئابان یەشت) ئەمە هاتووە. فەریدون (تەرتەئونە) کە لە خانەدانەکانی بە توانای (ئاپویە) لە کیشوەری وارگۆشەی (وەرنە) سەد ئەسپ و هەزار گاو دە هەزار مەڕی کردنە قوربانی (ناهید) واتە پێشکەشی کرد، ئەو داوای لێکرد سەربکەوێت بەسەر ئاژی دەهاك واتە حەیوانە (3) دەمەکەدا. (ناهید) پێویستی ئەوی بە ئەنجامی گەیاند.

لە بڕگەکانی 13 و 14ی (درواسپە یەشت) ئەمە هاتووە کە فەرەیدون بۆ (ئێزدگوش) قوربانی پێشکەش کردووەو داوایلێکردووە سەربکەوێت بەسەر (زوحاك)دا. لە بڕگەکانی (32-35)ی (ئارت بەشت) فەرەیدون بۆ خواکانی (هوا-یو) و (پروەت-ئارت) قوربانی پێشکەش کردن


سەرچاوە

مهندس جلال الدين اشتيانى

زردشت/ مزديسنا و حكومت

چاپ هفتم/ 1374، لا336-347

# وندیدار.. تێگەیشتن لە تایبەتمەندییەکانی غەیری زەردەشتی

ئەوەی روون و ئاشکرایە (وەنداد) لای لێکۆڵەران تەواو ساخبۆتەوە کە لە خۆرئاوای ئێراندا دەرکەوتووەو مێژووی نووسینەوەو دانانی بۆ دوای ساڵی 485ی پێش زایین، دەگەڕێتەوە، ئەوە کۆنترین مێژووە بۆ ئەو (نەسکە)ی ئاوێستای سەردەمی ساسانی کە دەتوانین بۆی دیاریبکەین لە کاتێکدا ئایینی زەردەشت لە (رەی) (رغە، رگە) بڵاوبۆتەوەو مووغەکان بە سەر زاری قبوولێانکردووە بەو شێوەیەی شەریعەت و باوەڕ و رێ و رەسمیان لەبەرچاو بگرن.

ئەوەی لەو پەرتووکەدا کۆیانکردۆتەوە سەرەتاکەی بە بنەمای واژەلێکدراوەکەی دێت کە لە (وی+دەئەوە+داتەکە) پێکهاتووە کە بە مانای یاسای دژی دێو دێت، ئەو پەرتووکە پەرت پەرت و بەشە بەشە و مووغەکان رێکیان خستووەو هێناویانەتەڕوو، تێیدا پرسیاریان لە شوێنی هاتنیان کردووە، چونکە پەڕاگەندە بوون، ئەوانە پرسەکان و باوەڕی زەردەشتی کۆنیا گوێزاوەتەوە، بەڵام ئەوەی لای لێکۆڵەر دیارە لەوە ئاگادارە کە ئەوانە (واتە مووغەکان) بە ئایینی زەردەشتی گەیشتوون، بەڵام دووربوون لە سەرچاوەی رەسەنی دێرینی کۆنی زەردەشتەوە. لە پەرتووکەکەدا یاساکانی دژی دێو خراوەتە روو، بەڵام تێگەیشتن لە دێو بەو شێوەیەی لە (گاپان)دا هاتووە روون نەبۆتەوە کە بەرەو رووی ئەوان بۆتەوە کە بەرەو رووی ئەوان بۆتەوە. لەناو هیندو ئارياييەکانیشدا دوو کۆمەڵە خوا سەرچاوەی پەرستن بوون: (ئاسوورە) و (دێوە)، دێوەکان خواکانیان چەندە جۆرێك بوون لە سرووشتدا لە زاراوەی زەردشتدا (ئاسوورە) سەرچاوەی رەزامەندی و بڕیاردان بووە. لە سانسکریتیشدا کە بۆ ئاوێستا گوێزراوەتەوە پیتی (س) گۆڕاوە بە (چ)، زەردەشتیش خواوەندی یەکتای ئاسوورەی ناوناوە ئاهوورەو سیفەتی (مەزدا)ی بۆ داناوە کە مانای (دانا) دەبەخشێ و بەوە توانیویەتی کە وتوویەتی (دێوە) مانای (دێو)، دێوەکان دێت کە نابێت بیانپەرستن، چونکە دەرکراون و لە خوا پووچەڵ کراوەکانن و پەرستنیان نیشانەی لەناوچوونی زانست و لەدەستدانی توانای ئەقڵە، لەو رووەوە دێو و (دێوەکان لە گاپاندا) و لە تێڕوانینی زەردەشتەوە هەر بەو جۆرە راڤەی بۆ کراوە،

پەرستی (مەزدایەسنە)ش لەبەر ئەوەیە خالیقە و دێوەکان دژ بەون. وەندیدادیش مانای شێوە سەرەتاییەکەی بەزۆری دوورکەوتووەتەوە کە دەربڕین لە چنکە و پەری و عەفریتی ئەهریمەن دەکات کە کۆمەڵ کۆمەڵ و، هەزار هەزار هێرش بۆ مرۆڤ و مرۆڤەکان دەبەن،

بۆیە پێویستە لە باسیاندا گەورەیی مووغەکان و ئاداب و رێورەسمی زۆر نهێنیان کە نزیك بەکاهینەکان و موبیدەکانی زەردەشتی بوون بپارێزرێن، چونکە ئەو دەرکراوانە بوون ئازار و ناخۆشی کتوپڕیان بۆ مرۆڤ هێناوەو کردوویانن بە نێرەمووك.

وەندیداد بەو شێە جیهانییەی، بڵاوبوونەوەی راستەوخۆی جیاوازی هەیە لە گاپاکان و یەشتەکان. جیهانی گاپاکان دنیای کارو کۆشش و سیستەمی راستی و شادمانی و نواپەرستی و رەسەنایەتی و تێگەیشتن و ژیری و شادی و خۆشی ژیان و خۆشگوزەرانی و ئاسایش و چڕینی سروودە ئامانج لە پەرستنیش لایان ئەوەی لە دڵتایە ئەوەی لە دەمتایە، ئەوی کرداری چاکەی پێدەکەیت لەناویا دێو و پەری و بادوو و کۆیلەیەتی و دەسەڵاتی کاهینەکان هیچ ئاشەوارێکیان نەبووە، جیهانی یەشتەکان بڵاوبوونەوەی داستانە حەماسییەکان و پاڵەوانێتی و نەبەردی جەنگاوەرو ژیانی پڕ نیعمەت و فەرو ستایش و خۆشی و شادیە، بەڵام دنیای وەندیداد راستەوخۆ جیهانی تاریکی و پەژم و پڕ ترس و تەنیاییە، لە هەمانکاتدا خاوەن باوەڕەکان بەو رێگایەیان فرِو فێڵیان و رووناکی و پاکێتی بینن، هەر کارو کردەوەیەکیش ئەوانە سەربەرزو گەورە بکات و بیانکاتە پاڵەوان، پیس و ناپاکی و ئالوودەبوونیانە لەگەڵ یەکتریدا، تەرەفدانیشیان لەو رووەوە دەبێتە هۆکاری ئەوەی چەند مانگێکی یان چەند ساڵێك کاری قورس و درێژخایەنیان پێ بکەن کە پەشیمانی لە دوایە.

جیهانی تاریك و پڕ تەنیایی کە فەزایەکە هەزاران هەزار دێو و جنۆکە و پەری دەگرێت ئەوانە ئازارو خراپەکاری کتوپڕی دەهێنن، بۆیە لەسەر هەر کەسێك پێویستە یاسای دژی دێو واتە وەندیدادی گوماناوی لە قۆناغی بە ئەنجام گەیاندندا بخاتە دەرەوەو کاری پێنەکات.

لەم شوێنەدا کە پێویستە باس بکرێت واژەی (مەگە)یە لە گاپاکاندا و (مەغە)یە لەوەندیداد کە سەرچاوەن بۆ باسکردنی کۆتایی بڕیاردان لەسەریان، هەمان ئەو جیاوازیەش لە نێوان دوو جیهاندایە، ئاوێستای کۆن و شێوەی ئایینی زەردەشتی و (گاپا)ی لەگەڵ جیهانی ئاوێستای نوێ کە جیهانی وەندیدادی موغانە و مانای ئەم واژەیەش لە هەردوو جیهانەکەدا هەیە.

ئەم واژەیەش لە گاپاکاندا بەهیچ شێوەیەك بەوەی کە لە ئاوێستای نوێدا بەدەستی پەروەردەیەکانی موغانی ماددی گەیشتووە پەیوەندیی نییە.

لە یەسنا، هاتی 29، بەندی 11، و هاتی 46 بەندی 14 واژەی (مەگە) لە ریزی (مەز)دایە بە مانای (مەش، لەمەش) لای مووغان بەمانای گەورە دێت لە هاتی 51 دووجار، لە بەندەکان 16.11 جارێکیتر پێماندەڵێ سیفەتی لێمدەرەکان لەسەر ناوی ئاوێستا وەکو گلدنەر و بارتولۆمە ئەم واژەیە بە مانای ئەنجوومەنی نهێنی و راز ئامێز وەریانگرتووە. واتە بە مانای ئەنجوومەنی نهێنی و راز ئامێز وەریانگرتووە. واتە بە ماناکانی ئەنجوومەنی برایەتی و کاری گەورەو پیشەو کارو بەشەکانی جارێکیتر هێناویانە. لە هیندی کۆندا واژەی (مەگە) بە مانای بەخشیش و پاداشت هاتووە، کە سیفەتە و جارێکیترش (مەگەڤەن) بەشێوەی بەخشندە دەبینرێت، بەڵام لە زۆرینەی موناسەباندا نێوانی ئەم دوو واژەیە لە هیندی کۆن و ئاوێستاییدا نەدۆزراوەتەوە. گلدنەر واژەی (مەگە)ی بە (مەغۆ) داناوە کە مووغ مانای ناسراوی خۆی دیار و لەبەرچاوە، یەکێکە لە ئەندامانی مەگە کە بەمانای ئەنجوومەنی نهێنی دێت، یان دەستەو کۆمەڵێکی نهێنی راز ئامێز. ئەم پەڕینەوەیە کە بەشێکی لە گاپاکاندا واتە لە ئاوێستای نوێدا یەسنا لە هاتی 65 بەندی 7 یەکجار واژەی مەغۆ لێکدراوە کە بەشێوەی (مەغۆیتیش) هاتووە بەمانای (مووغی ئازار) پێمانگەیشتووە، بەڵام لە تەرجومەی بەشی یەسنا لە سەرەچاوەی هاتی 65دا ئاماژەی هەیە کە ئەو هاتە بەرۆشنی دەرکەوتووەو لە پرسەکاندا باسکراوەو لە وەندیدادیشدا هەر یەکسان هاتووە. زمانی کردار زاراوەکانی و داخوازییەکانی لەم هاتە لەگەڵ وەندیداد دا دیارە. ئایینی رۆشن لە گوناهی گەورە وەکو ناشتنی مردوو خۆش نابێ و مردووەکە نابەخشێت و لە ئازاری کوشندەدا دەمێنێتەوە، مووغەکانیش هەندێك لە پڕۆسەکانیتریشیان بە هەمان شێوە لە ئاوێستای نوێدا باسکردووە.

لە کۆتاییدا واژەی مەگە لە ئاوێستای کۆندا بە مانا لە گاپاکاندا هەتاکو ئەو کاتە مانای راستی بۆ نەدۆزراوەتەوەو ئەوەی کە بە مووغ یان مەغۆ چوێنراوە نەتوانراوە لەلایەن کەسێکی ناسراو پەیوەندی بۆ دروست بکرێ.

لە گاپاکاندا مەگە و لە ئاوێستای مووغەکانیشدا مەغە پشتگیری لەوە ناکات کە ئەو لەیەکچوونە بگەیەنێتە راستی، تاوەکو بتوانین ئەم دوو واژەیە لە یەکێکیان تێبگەین. بەپێی وەندیداد مەغە دەزگاو ئامێری دەستی بووە کە ژمارەیەکی زۆر لە جنۆکە و پەری و دێو،

مەکرو حیلە و رووناکی و پاکیان تیایدا بە ئەنجام گەیاندووە. لەناو پارسییەکانی هیندستاندا یەکێك لە ئایینەکانی رووناکی و پاکی لە پارچەیەکی زەمیندا بۆ دەرکردنی دێو ئەم رێورەسمەیان ئامادە کردووە تاوەکو لەژێر ناونیشانی (پەریشنۆم) ئەنجامی بدەن هەروەکو لە رێورەسمی ئەمڕۆدا خەریکە روو لە فەرامۆشی بکات کە بەشێوەیەکی ساکارتر ئەنجام دەدرێ.

ئەوەی روون و ئاشکرایە (وەندیداد) لای لێکۆڵەران تەواو ساغبۆتەوە کە لە خۆرئاوای ئێراندا دەرکەوتووەو مێژووی نووسینەوەو دانانی بۆ دوای ساڵی 485ی پێش زایین، دەگەڕێتەوە، ئەوە کۆنترین مێژووە بۆ ئەو (نەسکە)ی ئاڤێستای سەردەمی ساسانی کە دەتوانین بۆی دیاریبکەین لە کاتێکدا ئایینی زەردەشتی لە (رەی) (رغد/رگە) بڵاوبۆتەوەو مووغەکان بە سەرزاری قبووڵیانکردووە بەو شێوەیەی شەریعەت و باوەڕ و رێ و رەسمیان لەبەر چاوبگرن.

وەندیداد یاسای دژی دێو و شەریعەتەکان و حوکمی مووغەکان بووە، بەو جۆرە کە توانیوویەتی نزیکبوونەوەیەك لەگەڵ ئایینی گاپاکاندا دروست بکات یان بەشتەکانی کۆن وەکو مەغە یان مەگە کە لە ئاڤێستای نوێشدا هەر بەو جۆرە بەزا لە وەندیداد دانراوەو زۆر ترسناکە و شێوەی سەرسووڕمان لای ئادەمیزاد وەردەگرێت. سەگ لەو رۆژگارەدا پیرۆز بووە، بەتایبەتی سەگی ئاوی ئەویش هەر کەسێك لە هەر کاتێکدا سەگێکی ئاوی لە ئاو دەرهێنابێت لە جاری یەکەمدا دە هەزار قامچی ئەسپی لێ دەدرێ. لە گۆڕینی فەرگوردی چواردەیەمدا ئەوە رەچاو کراوە کە چەند برێك لە پێداویستییەکان لە ئامێر و ئامێرەکانیتر بە پەرستگا دراون و چەندی دیکەش بە مووغەکان (پیاوانی ئاشە). ئەو کەسانە دەبێت دە هەزار بۆق و دە هەزا مێروولە و دە هەزار بەچکە مێروولە و دە هەزار کرم و دە هەزار مێش بکوژن و دە هەزار ئاژەڵی زیانبەخشیش لەناوبەرن، دوای ئەوە ئەنجام وەردەگرێت لەسەر تەواوکردنی کارەکانیان، هەر کاتێکیش لە رووی دەستوورییەوە باش و دروستبوو دەتوانن لەو تاوانانەی کردوویانە پاك ببنەوە. داخوازییەکانی (وەندیداد)یش دابەشە بە چەند (فەرگوردیك) یەکەم و دووەم و بیست و دووەم جگە لە دەربارەی تەشریفات و مەراسیمی مەزەبی. کە لەو رۆژگارەدا بە وردی و توانای زۆرەوە ئەنجامدراون، لەوانە جۆرەکانی ناپاکی و ئالوودەگیان و گوناهـ و شێوازی پاکێتی و رووناکی و گوناهی گەورەو رەفتاری مردووەکان و قەدەغەکردنی ناشتنیان یان سووتاندنیان، خەفەت و پرسەداری و پرسەکانی سووری خوێن و بینای گۆڕ و مۆڵەتدانیان و رێوڕسمی فراوانی پاککردنەوە بە ئاو و شەڕکردن لەگەڵ دێوەکان و نەهێشتنیان و چارەسەر و

پاککردنەوە لە جنۆکە و بۆنە ئایینییەکان و مەراسیمی نینۆك، ئەوانە و قژ جوانکردن وەسفی دنیایین کە پڕن لە دیوی ناخۆشهێنەر و شێوازی شەڕ کە پێیانەوە دیارە. هاوکاریکردنی مووغەکان بۆ دەسپێکردن و نووسینەوەی ئاڤێستای نوێ بەتایبەتی وەندیداد شوێنی گومان نییە. ئەوەی لێرەدا دیار و سەرسووڕهێنەر و ئاگراوی و ترسناکە و شوێنی تێڕامانە،

ڕۆحی تەشریفات پەرستنی و دەسەڵاتە بەسەر مرۆڤدا دەمار گرژی و شك و باوەڕهێنانە بە ڕۆحە پیسەکان و جیهانی پڕ ڕاز و هێمایەکە موبیدەکان بە ناونیشانی شەریعەتەکان بۆ (مەزدیەسنا)کانیان ڕێکخستووە ناوی کتێبەکە کە ئاماژەی بۆ دەکەین بەو شێوەیەیە:

لە پەهلەویدا (ویدوداد)ەوە لە ئاڤێستاشدا (وی-دەئوە-داتە)یە کە بە مانای یاسای دژی دێو دێت. لە ئاڤێستای نوێشدا کە بەو تەرتیبە هاتووە بە ناونیشانی کۆمەڵێك یاسا کە بۆ کارپێکردن و باسکردن هاتوون، لەو سەرچاو سەرنجڕاکێشەدا کۆنترینی ئەوەی لە یەسنادا هاتووە بەو ناوەڕۆکەی کە بەرەو ڕووی دەبەوە، هاتی یەکەم بەندی سیازدەیە کە ناواخنەکەی بەمجۆرەیە: ستایش بۆ ئەو شوێنەی وتە و ئاخاوتنی پیرۆزی ئێزدی (خوا)ی لێیە کە پاك و کاریگەری بەخشە بۆ یاسای کۆن و بۆ ئایینی جوانی (مەزدەیەسنی) و (ئایینی کەزدەیەسنی) لە هەر شوێنێك ئاڤێستا یاسای دژی دێوی باسکردبێت، ئەو بڕگانە لە سەرەوە دووبارە بوونەتەوەو هەمان لەو سەرچاوانەشدا ستایشکراون کە پێکهاتوون لە: یەسنا، هاتی 1، 2 بەندی 13، هاتی 4، بەندی 18، هاتی 6، بەندی 12، هاتی 7، بەندی 15، هاتی 22، بەندی 25، هاتی 25، بەندی، لە خوردە ئاڤێستا 30 ڕێژەی گەورەیە، بەندی 29، مەلاییکەی یەشتەکان کچ، بەندی 17 لە وەندیدادی نوێدا، چەندینجار (وی دەئوداتە)ی زەردەشتی دووبارە بۆتەوە کە باشترینیان ئەو ئایینەیە. لە ڕستەی (فەرو گوردی) بەندی 21ی بەشێوەی ئاشکرا لە (وەندیداد)دا باوەڕیان بەکار ئیشکردن بەو ڕێگەپێدانە پێویستیان بە زەردەشتییەکی ڕزگارکەر هەبووە لەبەر ئەوەی یەکەمین کەسێك بووە باسی

(مانپرا-سپینتا-ئەشاونۆ)ی کردووە. بەشی یەکەمی بەمانای (وتە و وتووێژی ئێزدی) دێوەو دێو بەشی دووەمی بە مانای پیرۆزەو سێیەمی بە مانای پاکە. بە سەیرکردنی ئەو سەرچاوانە بە دوو ناونیشان یاسای دژی دێ و یاسای زەردەشتیمان پێدەدات، وتە و وێرد و بیرهێنانەوەی (ئێزدی) پەنابردنە بۆ (مەرداشە) و دەگەینە ئەوەی کە بەشی سێیەم بێت لە یاسای دژی دێو کە ناوی بکەرە بە مانا (مەرداشە) لە وەندیداد دا دێو لێیداوەو دێو جنۆکە و پەری لێدرا و بەکاردەهێنن و ئەوەی بۆی دەکەن خوێندنەوەی

(مانتەر سپنتە)یە بەسەریا لە نزا و وێردە و بە دەنگێکی نزم. دووەمین سەرچاوە، سەرچاوەی ستایش و بڕیاردانە (داتەهە-وی-دەڤەیە) داتە بە مانای یاسایە و (وی) بە مانای دژ و دوورکەوتنەوەیە و دێوەکە هەمان دێوە بەشێوەیەك کە لە وەندیداد دا تێگەیشتوون هەمان لە گاپاکان و یەشتەکانیشدا هەر بەو چاوە سەیردەکرێت، لەو سەرچاوانەدا یاسای دژی دێو (وی-دێوە-داتە) یاسای نامەی مووغەکانی ئاشکرایە. سێیەمین بەش کە سەرچاوەی ستایش و بڕیار وەرگرتنە (داتەهە-زرتوشرە)یە بە مانای یاسای زەردەشتییە کە ماناکەی لای زەردەشت خۆیەتی. چوارەمین سەرچاوە بۆ ستایش (درغەیاو-44 ئۆپەینەیاو)ە بە مانا ئایین و ئایینی کۆن. (دەریغە) بەمانای درەنگ، دواکەوتوو، کۆن.

(ئۆپەرینەیاو)ە بە مانای (ئایین و ئایین) ئەو چوار سەرچاوەیە لەگەڵ شوێنیاندا کە ئاماژەیان پێدراون لە ناخیاندا ئاماژە پێدراون و ستایشکران ئەو چوار ناونیشانە چوار رێگە و رەوشە ئاماژە دەدەن یەکەمین زراتە ئێزدییە کە پیرۆزترین و راسترینە و (مەرداشە) لە نێوانیاندا دۆعا دەکات و بە ناوەڕۆکی (وەندیداد)دا بە زۆری ئاماژەی دەبینرێت کە لە گۆڕینەکەدا دووبارە بووبێتەوە. هەموو جارێك لە یاسای دژە دێو و ستایشکردنی بەردەوامیان قسە لە هەموو ئەو سەرچاوانە کران کە مووغەکان دەمارگرژی تایبەتیان هەیە بەرامبەر بە شەریعەتەکان و یاسا و ئەحکامەکانی رێکخستن کە خۆیان تێیدا باسی یەکسانی و کردنەوەی لاپەڕەیەکی نوێ دەکەن، بەڵام ئەو ستایشکردنەیان ئارامی نەهێناوە هەرچەند جارێکیش لەناو پرسە باشکراوەکانیشدا باسیان هاتووە، دنیای مووغەکانیش، جیهانەکەی لە هەموو گێشەکانیا دێ و پەری و رۆحە پیسەکان ستەمهێنەرن و لە بۆسەدان بۆ راوی مرۆڤ. بەو جۆرە جیهانێك کە یاساکەی لەسەر زۆرانبازی بووە لەگەڵ ئەو توخمانەدا و لە شەڕی بەردەوامدا بوون ئەو یاسایە کتێبی (وەندیداد)ە یان یاسای دژی دێوە کە هۆکارەکانی بۆ رزگاربوونە لێیان یان (مەردان ئاشە)یە، یا وەکو مووغەکان خۆیانن، بەڵام ئاماژە هەیە کە مووغەکان ئایینی دوولایەنەیان هێناوەتەڕوو بەشێوە دەرکەوتووەکەی ئایینی زەردەشت بووە، بەڵام لە ناوەڕۆکدا جیابۆوە و زەردەشتییەکانیش هەستیان بەوە کردووە ئایینەکەش لەژێر مووغەکاندا بۆ مەرامێك بووە بۆ بەرەوپێشبردنی خۆیان و زیاترکردنی دەسەڵاتیان، هەر بەو جۆرەش بووە سوودیان لە یاسای زەردەشتی دیووە، بەڵام ئەو سوود وەرگرتنەیان تەنیا لە کتێب و نووسراوەکانا بووە کە بۆی گەڕاون، بەڵام بۆ کاری خۆیان تەنیا سوودیان لە یاسای دژی دێو دیوەو لە خزمەتیا بوون، بەو جۆرە بەشی سێیەمی کە سەرچاوەی ستایش و بڕیاردانە واتە

(وەندیداد) لەسەر ئایینە ئاساییەکەی کۆنبووە، بە مانای ئایینی ئاریایی واتە ئایینی پەرستنی خواکانی سروشت و خوا جۆرەکانی دیکە کە سەرچاوەی ستایشن بۆ (دەیناوا)ی جوانی و (مەزدەیەسنی)، بە مانا ئایینی قەشەنگ بۆ (مەزدا) پەرستی واتە (خواپەرستی). باسێك دەربارەی ئەوەی کە ئایە لە تێڕوانینی گاپاکاندا (دەیناوا) مانای چی دەدات یان ئایە بە مانای ئایین دێت یا وەکو ئەنجوومەنی گاهانی مووغەکانە یان بەدوای ڕەگ و ریشەی پەلهاوێژیدا بگەڕێین تاوەکو بمانگەیەنێتە ئەنجام، بەڵام ئەوانەی لەو سەرچاوانەدا لەسەر مووغەکان هەن، پێویستە بە ڕەسمی (وەندیداد) بناسێنن یە جەماوەر، یان بە ئامانجی ناسینی نامەکانیان کە لەگەڵیا ستایشی یاسای زەردەشتیان کردووە بۆ ئەوەی بەهای نامەکانیان بەرزتربێت، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا ئەو کتێبەیان کە کۆمەڵێك یاسای تێدایە، تیایە بە یاسای زەردەشتی ناناسرێت. کۆکردنەوە و لێکدانەوەی شەریعەتەکان و یاسای دژی دێو لەگەڵ ئایینی زەردەشتی و ئایینی یەشتەکان کە واتای ئایینی کۆنی (دەیناوا)ی پاکی (مەزدەیەسنی) دەگرێتەوە یەکەمین ئەنجوومەنی ڕەسەنی زەردەشتییە بۆ بوونی دژ کە پرسەکانی باوەڕی بیری ئاڤێستادا، بەڵام لە گاپاندا ئەوە لەبەر چاو نەگیراوە.

لە فارسییەوە: کەمال نووری مەعرووف

سەرچاوە: هاشم رچی

وندیداد/ (جزو اول) چاپ اول

376تهران، ل110-116

# لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی لەسەر سەرهەڵدانی ئایینی مووغەکان

ئەم پرسەو پرسەکانیتری وابەسە بە ناونیشانەکەوە ئەوە دەگەیەنێت کە مووغەکان تیرەیەکن لە مادەکان، ئەمانە دەوڵەتی ئایینییان لە (رەی) دروستکردووە، دوای هاخامەنشییەکانیش بۆ (ئەستەخر) چوون، بەڵام لە (رەی) توانیوویانە بناغەی خۆیان دابنێن و بەهێزی بەکەن و پارێزگاریی لێبکەن، لە رۆژگاری شاشانییەکاندا و دوای رووخاندنین جارێکیتر (رەی) بووەتەوە مەرکەزی رۆحانییە مووغەکان.

## ژیانەوەی ئایینی زەردەشتی

مووغ، بە مانای پلە و پایەی پیاوی رۆحانی ئایینییە، لە بەندەکان پێشینددا ئەم پرسە بەو جۆرە لە تێڕوانینی ئەوانەوە رۆیشتووە، بەڵام لای زەردەشتییەکان ناونیشانەکانی ئایینی بەجۆرێکیتر راڤەکراون کە (ئەشرافان) دەرکەوتووترینیانە. لە بەشی یەکەمی ئاوێستای کۆندا واژەی (مەگۆ) یان (مەگە) بەشێوەیەکی تەمومژاوی هاتووە، واژەی (مووغ)یش مانایتری هەیە هەروەکو لە روونکردنەوەکەدا باسمانکرد. (مەزدا) لە خوا کۆنەکانە و لەناو ئارییاییەکاندا سەرچاوەی پەرستن بووە. شێوەی (مەزدا یەزنە) ئایینێکی سەرەتایی باسدەکات کە (مەزدا) پەرستییە بە مانای خواپەرستی دێت. لە مادی خۆرئاوای کۆنیشدا (مەزدا پەرتسێك) بە خوا پەرتسێك یان بە (مەزدیەزنە) خوێنراوەتەوە، بەو شێوەیە زمانی مادی لە شێوەی ئاوێستاییدا (ئاش) شوێنی (مەزدایەسنە)ی گرتووەو بە روونی جیاکراوەتەوە.

بەو شێوەیەی ئاماژە هەیە لە رۆژگارێکدا کە لای ئێمە رۆشن نییە و لێکۆڵینەوەشی لەسەرکراوە، ئەوە دەگەیەنێت کە ئایینی زەردەشت گەیشتووەتە (رەی) و لای مووغەکانیش ئەوە ئاشکرایە، لە ئەنجامی ئەمەدا یەکەمین خواکانی (دەیڤە) (دەیوە) خواکانی سروشت و خواکانی بابەتەکانیتر بوون، کە بە هەمان ناونیشان لەناو ئارییاییەکان و هیندو ئێرانیی و عەشیرەتەکانیتری ئارییاییدا ناسراو بوون و بوونەتە سەرچاوەی پەرستن. زەردەشت لە ژیانەوەی ئایینەکەیداو کارە چاکەکانیدا دەڵێ: نابێت (دێو، دێوەکان) بپەرستن، یان بیانپەرستن، خوای

تاك و تەنیاش (ئاهۆرامزدا)یەو دێوەکان لەو کۆمەڵەدا دەرکراون، ئەمانە خواکانی مادی کۆنن و وازیانلێهێناون کە گرنگرتینیان (ئیندرا) و (ناهیپ) و (ساورڤا)ن و سەر بە کۆمەڵەکەیترن لە خواوەندەکان بە مانا لە دێوەکان.

## شەریعەتی مووغەکان

لەو کارە چاکانەی لە ئایینی مادو شەریعەتی مووغەکاندا کراون یاساکانی رەسەنی پاکێتی مووغە زەردەشتییەکانە، بە مانا یاسای دژی دێو کە لە (وەندیداد)دا بووەتە بنەمای بڕیاردان، دیاریکراوە.

رۆژگاری ئەم سوود وەرگرتنە بۆ کۆتایی سەردەمی مادەکان و سەرەتای رۆژگاری هاخامەنشییەکان دەگەڕێتەوە کاتێك بەشەکانی خۆرهەڵاتی ئێران و خۆرئاوای لەژێر نفووس و دەسەڵاتی هاخامەنشییەکاندا بوون، ئەو، واتە زەردەشت دانانی ساڵنامەی نوێی ئێرانی بەرەسمی بردووەتەوە بۆ سەرەتای فەرمانڕەوایەتی (خشایار شا)ی گەورەی شار، ئەمە ساڵنامەیەکی ئایینی مووغەکانی زەردەشتە و لەناو دوو ئایینی کۆمەڵەی خواکاندا واتە کۆن و نوێ ناسراوەو لە شوێ،ی خۆیدا دەرکەوتووەو بەرەسمی راگەیاندنی بۆ کراوە، بەڵام ئەو لەو رۆژگارە بە مانا کۆتایی سەردەمی مادەکان هەتاکو سەرەتای رۆژگاری نوێ ئایینی زەردەشتی لەسەر خاکی ماد نفووسی بڵاوبووەوەو ناسراو بوە.

لەلایەکیترەوە قەبووڵکرا نەخشە و راگەیاندن هەر بەو شێوەیە لەلایەن مووغەکانەوە بۆ پێکهاتەی ئایینەکانی زروانیی و ئاریایی کۆن و زەردەشتی و مووغەکان دووبارە ساڵنامەیان بۆ بکەنەوە کە دەستێکی باڵایان لەو بوارەدا هەبووە. پرسی زمان و ناوە بڵاوکراوەکانی مادەکانیش نیشاندەدات ئەوەی ئیدیعای دەکەن لە بنەمادا پایەکانی بەردەوامی زمانەکە بەیاندەکات، بەڵام هەرچەندە یەکسانی و هاوریشەیی لەنێوان ناوەکان و زاراوەکانی زەردەشتی رەسەن لە خۆرهەڵاتی نێوان مادەکان و هاخامەنشییەکاندا لەبەردەستدان یان بەرچاو دەکەون، بەڵام ئەوانە هەرگیز مانای ئەوە ناگەیەنن کە ئایین و داستانەکانی زەردەشتی نێوانیان رەواجیان پەیدا کردبێت، بەڵکو نفووسی سنوورداری ئایینی زەردەشتی لە نێوان ئەو مرۆڤانەدا لە خاکی مادو پارس نیشاندەدات بەو جۆرەی کە ئەو ناوانە زرەدەشتی بوون. پارەکانیتری ئەو ناوانە و نیشانەکانیان کە لەناو مادەکاندا گوێزراونەتەوەو گەیشتوون بە ئایینی مووغ دیارن و بەرچاو دەکەون.

ئاهورا، بە مانای دروستکەرو خواوەند دێت. لە نووسین و سەرزمانی ئاشوورییەکانیشدا بەشێوەی (ئائودەر) یان (ئائۆر) هاتووە. (مزدا) بە مانای دانایە و لە گوێزانەوەیدا بۆ ئاشوورییەکان بووتە (ماشدا) ئەم دوو ناوە بەشێوەی جیا سەرچاوەن بۆ بەکارهێنان هەروەکو چۆن لە ئاوێستادا جیایە بەشێوەی ئاهۆرامزدا یان ئاهۆرا پێمانگەیشتووەن بەلاّم لە نووسینەکانی هاخامەنشیدا بەبێ گۆڕان یەکجار بەشێوەی ئاهۆرامزدا هاتووە. هەروەها (بەگە)ش بە مانای خوایە کە بۆ ئاشوورییەکان بەشێوە (بەگ) گوێزراوەتەوەو کاری پێکراوە، بەلاّم (یەزدان) بەتایبەتی لە ئاوێستای دواییدا وەکو (میپرە) و (ئاناهیتا) و (تیشتریە) و (وەرپهرغنە) و (وەهۆمنە) و (سپەنتە ئەمەنیتی) بەشێکی ئەمانە کاریگەریی نێوانی مادەکانیان بە سەیرکردنیان دیار نییە بە سەریانەوە هەبێت. هەڵبەتە باشتر بوو ئەم ئەسلاّنە جارێکیتر سەرنجیان لەسەر بدەین کە بزانین ئەمانە نووسینن یان پاشماوەی نووشین و ناوەکانیان لە رۆژگاری مادەکانەوە بەزۆری گەیشتوون. لەوانەیە هەر جارێك لە سەرچاوەکەیانەوە پێتر بە ئێمە گەیشتبن بەو شێوەیە ناوەکانیان جارێکیتر کەوتوونەتە بەردەستمان. لە پێکهێنانی ناوەکاندا سێ ریزی دیاری ئایینی لە ئاوێستاوە کە شێوەی زەردەشتیان هەن لەبەرچاو دەگرین، یەکەم (ئەرتە) کە واتای (ئاشە، ئاشا) یان (رتە)ی هەیە بەگوێزانەوەی بۆ لای ئاشوورییەکان (ئەرت-ئیرتە) دەبەخشێت، بەمانای راستی، سیستەمی دنیا، عەسر، یاسای پاکی و ئیمان. دووەم واژەی (خشترە) بە گوێزانەوەی بۆ لای ئاشوورییەکان دەبێت (سەتەر)، (کیشتەر)، (کەشتەر) مانای حکومەت و دەسەلاّت دەبەخشێت. سێیەم واژەی (خورتە) مانای گەورەیی و توانا دەبەخشێت کە لای ماد (فەرنە) بە گوێزانەوەی بۆ لای ئاشوورییەکان (پەرنۆ)، (پەرنە)، (بەرنە)یە.

### رۆژگاری هاخامەنشییەکان

لە کۆتایی سەردەمی مادەکاندا شێوەی ناوەکانی زەردەشتی کە پێشتر هاتوونەتەڕوو، روونتر و دەرکەوتووتربوون، بە هەمانشێوە بەر لە هاخامەنشییەکانیش ئایینی زەردەشتی ئەو ناوانەی بە گومانێکی زۆرەوە وەرگرتووە کە لەناو مادەکاندا بەو شێوە رەسەنەیان نفووسیان هەبووەو ناسراوبوون، شایەتی ئەو رۆژگارەش مووغەکانە کە خوێندنەوەیان بۆ کردوون، یان پێدەچێت لە سەرەتای رۆژگاری گەورەیی هاخامەنشییەکاندا هەست بە تواناو نفووسی ئەوانە نەکرابێت بە مانا مووغەکان، بەلاّم ئەم مووغانە، یان پیاوانی ئایین لە ئایینی کۆنی مادیدا ئەوەی هەیانبوە لە تایبەتمەندیی ئایینییەکەیان

بناعەکەی لەسەر پەرستنی خواکان سروشت بووە واتە (دێوەکان) کە زەردەشت ئەوانەی داوەتە دواوەو لایداون لێرەدا ئەو شوێن و بەرەوپێشبردنی ئایینی زەردەشتی تێبینیکردووە، بەڵام نەیانتوانیوە جلەوی تەواوی ئەوانە بگرێت و بەرەو روویان بووەستێتەوە، تاوەکو لە رواڵەتدا باوەڕی ناوەوەیان بەو ئایینە نەهێڵێت و کار بە باوەڕی خۆی بکات، ئەمەش بۆ مانەوەی بوو تاوەکو بە رۆیشتنی کات کارەکەی ئەنجامبدات، دەتوانین لە گاتاکانەوە لە ئایینی زەردەشت تێبگەین و ئایینی مووغەکانیش لە وەندیدادەوە. ئەم دووانە لە گۆشەی نیگامانەوە بۆ سەریان نا لە دیدەنیگای زمانناسی و واژەو دارشتن و بیرو بونیادی فیکرییەوە دەردەکەوێت رێککەوتن لە نێوانیاندا ناکرێت، چونکە پێەوانەی یەکترن و دژن.

فەرگوردی یەکەم لە وەندیدادا دەڵێ: (دوانزەهەمین بەش باشترینی شوێنەکانی و شارەکانن کە هاومانان بە ئاسەی شوێن (دە)ی سەرزەمینی شوێنژەو ئاهۆرامزداش خولقێنەری (رەغەیە) کە هاومانای (رەی) دەگرێتەوە، کە تیرەیەکن لە مرۆڤ ئەهریمەنی پڕ ئازار لەم سەرزەمینەدا ئازار بە دوژمنی دژی مەنە دەدات بە مانا گومان و دووبارەکردنەوە کە هاومانای (ئوپەر و ڤیمەنوهیم)ی دەرکەوتووە کە هێناویە).

مووغان ئەوانەن کە لە مەرکەزی رۆحانیدان و تواناو پایەو بیری ئایینییان بەشێکن لە کۆنەوە هێناویانە و خراپەکاریان بەرامبەر ئایینی زەردەشتی ئەنجامداوە، ئەمە لە کاتێکدا بووە کە ئایینیتر کەمتر سەرچاوەی تێڕوانینی ئەو مرۆڤانە بووە، چونکە لە واقیعدا ئیمان و باوەڕی ئەوان لە تەشریفات و رێوڕەسم و بۆنە نهێنییەکاندا دژوار بوون و دژایەتی گشتییان کردووە،

ئەمانە هەستیان بە تاوان نەکردووە، بەوەی کە دایانناوە ئەهریمەن هاومانای (ئەنگرمینو)ی خالقە، بەڵام لە کۆتادا نەیانتوانیووە رێگەی سازکراوی ئایینی زەردەشتی تێکبدەن، بۆیە ساکارانە هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا نەرم بووەو ئەوەی هەیانبووە لە عونسوری رەوشت قایل بوون بەرامبەر ئەو لایەنە گرنگیبدەن و فرمێسکیان بۆ بڕێژن و پێشوازیان لێبکەن، بۆ ئەوەی لە کاتی موناسیبی دیاریکراودا و لە ناوخۆدا لەناویان بەرن. هەروەها لە سنووری ساڵەکانی (485) پێش زایین، یان بە چەند ساڵێك دواتر جیاوازیی لە نێوان مووغانی (وەندیداد) و ئەو شێوەیەی زەردەشتییەکان بۆ خۆیان رێکیانخستبوو، دەرکەوت ئامانجیان لەمەدا بۆ ئەوەبوو تاوەکو کارەکانیان بە رەی بەئەنجام بگەیەنن، هەر بەوجۆشە (یەسناکان) لە هەمان جێگەدا جارێکیتر کارەکانیان رێکخست. لە (وەندیداد)یشدا یاساو

شەریعەتەکان و ڕێوڕەسمەکان زیاتر زەردەشتی بوون، بەڵام نیشانەی خۆتێسووین لە نێوانیاندا دروستبوو.

یەشتاکان جارێکیتر هەروا بەزیانلێکەوتوویی مانەوەو چوونە کەنارەوە، هەرچەندە یەشتاکان لە خۆرهەڵات پێکەوە لەگەڵ زەردەشتییەکان لە نائارامیدا بوون، بەڵام یارمەتییاندان، لەمەدا یەشتەکانی سەرەتایی تاوەکو چوارەم پەشیمانیان بۆ مایەوە، لە یەشتاکانی کۆندا جارێکیتر دەستی یارمەتیان بۆ درێژکردن و شتەکانیان بۆ زیادکردن.

### فەرمانڕەوایەتی شالمانەسری سێیەم

لە سنووری ساڵی (485) پێش زایین، بیری دێنینەوە کە لەو مێژووەدا ڕەزامەندلا دراوە لەسەر ئاوێستای مووغان، هەر بەو جۆرەش ئەم مێژووە کە ڕۆیشت سەرەتای پادشایەتی (خشایار شا) و ڕاگەیاندنی ساڵنامەی ئایینی نوێیە لە نێوان مووغەکاندا کە بەناوی ئایینی زەردەشتی بڵاوبووەتەوە. هەروەکو لە دێرەکانی پێشوودا باسمانکرد بوونی ناوەکانی تایبەت بە زەردەشت لە خۆرهەڵاتی ئێران مادی لە ڕۆژگاری پێشوودا بەناو مادەکاندا نیشانەی نفووس و بڵاوبوونەوەی ئەو ئایینەیە لەسەر خاکی ماد، کە یەکێك بوو لەو ئایینە سەرەکیانەی گوزەریان کرد لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا واتە بۆ هەمان (ڕەی). لە فەرمانڕەوایەتی شالمانەسری سێیەمدا (858-824پ.ز) ناوێکی میدی بە ئێمە ئاشنا بوو بەشێوەی (ئارتاساری) کە گومانێکی بەهێزی لێدەکەین ئاریایی بێت، بەشی یەکەم ئەو (ئارتایە) ئاشنایی تەواوم لەگەڵیدا حاسڵکردووە،

لەوانە ناوێکیتریش هەیە وابەستە بێت بە سەدەی نۆیەمی پێش زایین بەشێوەی (ئارتاسیرارۆ) کە لێی بە ئاگام (لەوانە ئارتاساریرا) ئاوێستایی بێت کە بەشی یەکەمی وەکو ناوەکەی پێشوو بێت کە پێی ئاشنابووین. هەرجارێکیش بە قسەکردن یان بە نووسین کە لەو جۆرە ناوانە دەبینین جیاوازیان لەگەڵ شێوە ئەسڵییەکانیاندا ڕەچاو دەکەین، بەڵگەش لەمەدا نیشانەکانیانە کە ئەو ناوانە مرۆڤی ئاریایی بن یان لەسەر زمان بەیانی خۆرهەڵاتی و ئەسڵیان بە ئێمە ئاشنا بکەن لەبەر ئەوەی زۆر وتراونەتەوە.

لە شێوەی ئەم ناوانەدا (کوشتەشپی) کە هاومانایە لە ئاوێستادا بە (ویشتاسپە) یان (گۆشتاسب) و (کوندەسپی)، هەروەها (بەگدەتی) کە هاومانای (بەگداتە) بە مانای (خوای داد) یان (مەخلوقاتی خوا) دەگرێتەوە کە شێوەی دواوەی (بەغدات) یان بەغدایە و روونتریش (بەگەیە) بە مانای خوا هاتووە.

## پەپکە قورینەکانی ئاشوور

ناویتر کە لە ساڵی (712) پێش زایین ماوەتەوە بەشێوەی (ئاپورپەرنە)یە. (ئائور) شێوەیەکە رۆشتووەو شێوە میدییەکەی (ئاهورا)یە و (پەرنە)ش جارێکیتر (خورنە) (فەونە)یە، ئەم ناوە هاومانا شێوە ئاوێستاییەکەی (ئاهورافەونە)یە،

بە مانای کەسێك دەگرێتەوە کە (فەروە)و (گەورەیی) خۆی لە (ئاهورا) وەرگرتبێت و رێنیشاندەری بێت. لە کۆمەڵەی پەپکە قورینەکانی پەیوەست بە کتێبخانەی ئاشوور بانیپاڵ (688-626پ.ز) لە یەکێك لە پێرستەکاندا ناوی (میترا) هاتووە، پێرستەکانیتریشدا ناوی (ئاسرامەزاش) ناسراوە. ئەم ناوە لە یەکدراوی ناوی دوو خواوەندە لە (ئاسوورا مەزداس)ەوە نزیکە و بزانم کە (ئاسورە) هەمان (ئاهورە)یەو (مزداس) هەمان (مەزدا)ی ئارییە. لەناو مادەکاندا هەروەکو تێبینی دەکرێ، هرەچی ئەوەی لە روو دەیبینم زمانێکی مادی ئارییە پێشتر هێمای دەردەکەوێت، هەروەکو چۆن ئەم هێمایانە و نفووسیان لە رۆژگاری هاخامەنشییەکاندا لەلایەنی نفووسی زمان و رەواجی ناوەکانداو زاراوەکانی زەردەشتی خۆرهەڵاتی پێشتر بینراون، لەسەری زنجیرەی مادەکاندا ناوی (دیاکۆ) هەیە کە ناوێکی ئاریایی نییە، بەڵام کوڕەکەی خاوەنی ناوێکی سەرنجڕاکێشی ئارییاییە. (فرائۆرتیس) لە فارسی کۆندا (فراڤارتی)یە. ئەم واژەیە لە (فرەوەر) وەرگیراوە. لە ئاوێستاشدا (فراڤەرانی) هەیە کە بە مانای پەیمان دێت. کە دەنگێکی گەورەی ئایینی نوێیە و داوای ئایینی زەردەشت دەکات، واتە خواپەرستەو ئیمانی هێناوەو خۆی رازی بووە پەیاننامە یان بڕیاردانی بڵاوبکاتەوە، بەمانا داوای چوونە ناو ئایینەکە بکات، چونکە ناوی (فرەوەرانە)یە و ئەم بڕگەیەش لە (یەسنای) دوانزەدا هەیە.

## باسێك دەربارەی فرەوەرانە

باسێك دەربارەی ئەوەی ئایا (فرەوەرانە) ڕێکخراوە یان کاری مووغەکانە و شێوە ئەسڵەکەیان بۆ خۆی بردووە، یان گۆڕانکاریان لە شێوەی ئایینی زەردەشتیدا کردووە، بەڵام بۆ ئەمە کورتە سەرچاوەیەك بەدەستەوە نییە، تاوەکو لە پرسەکاندا ببێتە بەڵگەو بەرستەیەك ئەنجامێکی باش بەدەستبهێنێت تا خۆیان بکەنە خاوەنی، بەڵام لەلایەکیترەوە هەموو بەڵگەکان بۆ ئەوە دەچن کە عونسوری زەردەشتی خۆرهەڵاتی، یان (مەزدیەسنا)ی خۆرهەڵاتی لە (رەی) و ناوچەکانیتری ماد بڵاوبوونەتەوە، تاوانیش نەبووە لەناو مووغەکاندا نفووسیان بڵاوبێت یان دەرکەوتن، لە راستیشدا دەبێت لەوە تێبگەین، دوای تێڕوانینمان بۆ سەرچاوەیەك، دەرکەوت بەر لە ساڵی (485) پێش زایین، بە رەسمی ساڵنامەی ئایینی مێژووەکەی بەراورد کراوە.

بە حاکمیەتی (خشایار شا) و راگەیەنراوە، مووغەکانیش هەر لەو کاتەدا ئایینی لێکدراوی خۆیان راگەیاندووە، ئەم ئایینە لێکدراوە چوارگۆشە رەسەنە پەروەردەییە لە (زەردەشتی و ئاریایی کۆن و زروانی مووغ) پێکهاتووەو کۆمەڵێك ناوی خواکان و یەزدانەکانیان لەم ساڵنامەیەی خۆیاندا نیشانداوە لە حاڵێکدا لای مووغەکان ئەوە دەرکەوتووە کە ئانەکەیان بنیاتناوە لەسەر بیروباوەڕی زروانی-میترایی کە پێشتریش گرنگی هەبووە.

پارسەکانی رۆژگاری هاخامەنشییەکان وەکو مادەکان ژیانی مەزهەبیان لە بۆنە کۆمەڵایەتی و رامیارییاندا لەژێر کاریگەریی و نفووسی فراوانی مووغەکانی (ماد)دا بوون و بڕیاری ڕێکخستنیان بۆ داون، ئەمە تەنیا هەر پێکهاتە و شێوەی زاراوەکانی مەزهەبی مادی و پارەییانی نەگرتووەتەوە، بەڵکو پەردە نووسراوەکان کە نهەن و پارسین بەڵگەن بۆ ئەم دیاردەیە و ئاماژەکانی هێرۆدۆتیش جارێکیتر پشتگیریی لەم فەرمانە دەکات کە بەمجۆرەیە.

## رۆژگاری حشایار شا

ئامادەبوون یەکێك لە مووغەکان لە ڕێوڕەسمی گەورەو شکرداراو پێشکەشکردنی دیاری لەلایەن پارسەکانەوە بۆی پێویست بووە، گرووپێك لەم مووغانە بەردەوام مەئموور و پاسەوانی

ئارامگای کۆرش بوون، هەروەها هەر کاتێکیش یەکێك لە پادشاکان تاجی لەسەر نابێت مووغەکان تیایدا ئامادەبوون، چونکە بەڕەسمی پیرۆزبایی پێگەیاندنیان بەزانست و هونەر و یاساکانی رەوشتی مووغەاکن ئەرکی سەرشانیان بووەو لە پلەو پایەی تایبەتیانداا ئەمان لێپرسراوبوون بەرامبەریان و سوودیان بینیووە.

لە رێگەی پلوتارك لە (پۆمپی) سەرچاوەیەك دەیگێڕێتەوە، کە تیپێکی مەزدایی باوەڕیا بە بنەچەو بوونیاتەکانی ئایینی زەردەشتی هەبووە (بەو جۆرەی کە مووغەکان تیایدا ئامادەبوون) ئاگاداریشم لە سەدەی چوارەمی پێش زایین ئەوانە لە قەڵ`مڕەوی مادەکاندا تواناو دەسەڵاتیان هەبووە. لە رۆژگارێکیشدا کە نەمانتوانی مێژووەکەی بە دروستی دیاریی بکەین، مووغەکانی مادی (مەزدا) (خوا) پەرستیان بەشێوەیەك لە خۆرهەڵاتی ئێراندا کردووەو پەنایان بردووەتەبەر پەیڕەوانی زەردەشت کە هەڵقولاوی سەرچاوەی گاریان بووە، لە رواڵەتیشدا قەبووڵیان کردبوو بەدوای وێژەی ئەدەبیاتی ئایینییاندا بڕۆن، لەوانەی بە بیستن لە سەرەتادا وەریانگرتبوو، ئەم هاوکارییە ئەدەبییە بەدەرکەوتنی یان بوونی کاریگەریی ئاوێستایی یان (وەندیداد) ئەنجامدراوە.

مێژووی نووسینی ئەم پاشماوەیە لە لێکۆڵینەوەدا دەرنەکەوت، بەشێك لەوانە نووسینەوەی بۆ رۆژگاری (خشایار شا) دەبنەوەو هەندێکیتریان بۆ نێوان هاخامەنشییەکان و ئاشکانییەکانی دەگێڕنەوەو بەشێکیتر بە کۆتایی سەردەمی ئاشکانییەکانی دەزانن، وەندیداد کە پاشماوەیەکی پەخشانییە و هەندێك بەشی لەسەر شێوەی هەڵبەستی کۆن رێکخراوە، جارێکیتر پێویستمان بە سەرنجدانە لە ئاداب و شەریعەت و یاساکانی مووغان کە بە کۆمەڵێك نووسینی ئایینی لە ئایینی زەردەشت وەرگیراوە.

سەرچاوە

هاشم رچی/ وندیداد/ جلد اول

چاپ اول، 1276/ تهران/ لا105-110

# کنه و پشکنین له پایتەختی مانابیەکان له قەڵایچەی بۆکان بۆ جاری نۆیەمین دەستی پێکرد

بەپێی هەواڵی شوێنەوارناسی ئێران لە نۆیەمین قۆناغی کنەو پشکنیندا شوێنەوارناسان توانیان لە گردی (3) هەزار ساڵەی قەڵایچەی بۆکان دیوارێك بدۆزنەوە کە بەشی ناوەوە لە دەرەوەی جیادەکاتەوە. شوێنەوارناسان پێیان وایە ئەم دیوارە لەلایەن ئاشوورییەکانەوە دروستکرابێت، دوای شکستهێنانی مانابیەکان و داگیرکردنی پایتەختەکەیان. لەو رووەوە شوێنەوارناسان پێیان وایە ئەم دیوارە بۆ چاخی (2)ی ئاسن دەگەڕێتەوە واتە (1200-850پ.ز) یان چاخی (3)ی ئاسن (850-550پ.ز) دروستکرابێت. رەزا حەیدەری شوێنەوارناس لە سەنتەری شوێنەوارناسی کەلتووری ئێران کە ئەندامی نێردراوی شوێنەوارناسی قەڵایچەی بۆکانیشە بە هەواڵنێرەکانی راگەیاند: شوێنەوارناسان لە درێژەی کنە و پشکنین و دۆزینەوەکانیاندا، هەروەها بەپێی ئەو بەردەنووسە گرنگە کە بە بەردەنووسی (بۆکان) ناسراوە و لە قەڵایچە دۆزراوەتەوە بەوە گەیشتوون کە قەڵایچەی ناوبراو هەمان (زیرتو)ی پایتەختی دەوڵەتی مانابییەکان بووە. هەروەها حەیدەری ئاماژەی بەوەشدا کە بۆ دروستکردنی دیوار و خانووبەرەی شاری (زیرتو) سوودیان لە خشتێکی تایبەت دیوە کە هونەرمەندانی ئەو رۆژگارە وێنە هونەریان لەسەر دەرهێناوە بۆ ئەوەش سوود لە کارخانەی دروستکردنی ئەو خشتانە بینراوە کە لە کەنار ماڵەکانی شاری (بۆکان) دۆزراونەتەوە کە (8) کیلۆمەتر لە قەڵایچەوە دوورە. هەر وەك زۆرینەی شوێنەوارەکانی دیکەی کوردشتان تاوەکو ئێستا ئاسەواری دەگمەن و تایبەت لە قەڵایچە زۆر دۆزراونەتەوە کە لە مۆزەخانەکانی ورمێ و میاندواو و تاران دانراون لەوانە (300) خشت کە بە ئاژەڵی باڵداری ئەفسانەیی نەخشێنراون و بۆ مۆزەخانەی تۆکیۆ نێردراون. هەر ئەو دۆزینەوەیەش وایکرد پسپۆڕێکی

بواری شوێنەوارناسی بەناوی (ئیحسان یەغمایی) رایبگەیەنێت کە (هەگمەتانە)ی پایتەختی کۆنی سەردەمی (ماد) بەر لە ئەوانیش قەڵایچەی بۆکان بووە نەوەك هەمەدان.

دیارە هێشتا زووە بڕیاری کۆتایی لەسەر بۆچوونێکی وا گرنگ بدرێت و بە ئاسانی لەلایەن شارەزایانی شوێنەوار وەربگیرێ، بەڵام بۆ ئەو بۆچوونە چەند خاڵێك هەیە دەیانخەینە بەرچاو:

1- یەکەمجار نییە کە باس لە پەیوەندی ناوچەی بۆکان لەگەڵ (هەگمەتانە) دەکرێت، (سێرهانری راوڵەنسن) ئەفسەری بەریتانی کە لە نیوەی یەکەمی چاخی نۆزدەدا بۆ کاری سوپایی هاتۆتە ناوچەکە و توێژینەوەی مێژوویی و شوێنەوارناسی لە کوردستانی ئێران و میزۆپۆتامیا کردووە و لە وتارێکدا بەناوی (یاداشت) لەسەر شوێنی ئاکباتانەی ئاترۆپاتین باس لە هەگمەتانەی دووەم دەکات و هەوڵیداوە کە شوێنی ئەو شارە مێژووییە لە خۆرهەڵاتی (بۆکان) بدۆزێتەوە، هەر بۆیەش لە دەوروبەری تەختی سلێمان و پەرستگای ئازەر گوشەسپ چاوی بۆ گێڕاوەو زانیوویەتی لە قەڵایچەوە دوورنەبووە.

2- ئەوە راستە کە ئاشوورییەکان لە ماوەی (36) ساڵدا چواردە جار هێرشیان بردۆتە سەر خاکی مانابییەکان و سارجۆنی دووەمی پادشای ئاشووریش لە ساڵانی (716-715پ.ز) پایتەختی مانابییەکان و چەندین شاری دەوڵەتی دیکەی ناوچەکەیان وێرانکردووە، (رۆسای) شای ئۆرارتۆش هەر لەو ساڵانەدا بوو پەلاماری کرایە سەر و (22) شار و شارۆچکەی مانابییەکانیش لەو پەلامارەدا بوو کە داگیرکران.

ئەگەر لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا دابینێین کە قەڵایچە پایتەختی مانابییەکان بووە دەبێت ئەوە بزانین کە دەوڵەتی مانابییەکان بەدەست مادەکان لەناوچوون یان لەناویانا تواونەتەوە هەر وەکو چۆن خۆرییەکان لەناو میتانییەکاندا ناویان نەمان و بەوەش پایتەختی مانابییەکان کەوتە ژێر دەسەڵاتی مادەکان کە بە دووری نازانین بووبێتە پایتەختی مادەکان دوای ئەو هەموو رووداوە بەو پێیە (قەڵایچە) جێگای باوەڕەو بە دووری نازانین ئەگەر لەوێدا چاو بۆ (هەگمەتانە) بگێڕین.

3- لێرەدا ناتوانین هیچ شتێك بسەلمێنین و پرسەکەی پێ راست بکەینەوە ئەگەر دەستکەوتە شوێنەوارناسییەکە پشت راست نەکرێتەوە بە بەڵگەی زۆری زانستی، ئەوەش بە توێژینەوەی زانستی دەبێت کە لە سەر بابەتەکە بنووسرێت و قەڵەمی شوێنەوارناسان و شارەزای مێژووی دێرینی لەسەر بکەوێتە کار بەوەش کۆتایی بەو تەمومژە دێت کە چەند هەزار ساڵێك لەسەری کۆبۆتەوە و راستییەکانی لەسەر دەردەکەوێت و لاپەڕەیەکی گوماناویش

لە مێژووی دێرینی ماد و مانابیەکانیش بەڕاست و دروستی دەردەکەوێت، دوور لە دەمارگرژی سەرچاوە ناسیۆنالیزمەکانی تایبەت بەسەردەمەکە.

دوای شکستهێنانی مانابیەکان و داگیرکردنی پایتەختەکەیان. لەو رووەوە شوێنەوارناسان پێیان وایە ئەم دیوارە بۆ چاخی (2)ی ئاسن دەگەڕێتەوە واتە (1850-1200پ.ز) یان چاخی (3)ی ئاسن (850-550پ.ز) دروستکرابێت.

## تیشکێك بۆ سەر ئاینزای ئاشکانی

هەرچەند لەبارەی ئایینی خانەوادەکانی ئاشکانییەوە ئاگاداری تەواومان نییە چونکە لە بنەچەدا ئاگاداری ئێمە دەربارەی شارستانێت و فەرهەنگی سەردەمی ئاشکانی بە زۆری کەموکوڕی تێکەوتووەو نادیارە بەهۆی ئەوە لەو خاکەیاندا پشکنین و لێکۆڵینەوەی تەواو لەسەریان نەکراوە بۆیە شێوەی خۆی بەباشی وەرنەگرتووە، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەندێك باوەڕو ئاسەوار و شارستانێت و فەرهەنگی پارتەکان گەیشتوونەتە دەست ساسانییەکان، بەڵام لەناوچوون. هەڵبەتە بۆ ئەمە تیۆرێك هەیە کە تایبەت بێت بە مەزەبی ئەو سەردەمەوە کە بە شێوەیەکی هەستپێکراو لە ناوا نەماوەو قەومی پارتیش لە نەژادی ساسانییەکان نەبوون بۆیە شتەکانیان لەو رووەوە بە باشی نەگەیشتوون. لەو نووسراوانەی گەیشتوون ئەوە دەگەیەنن کە پارتەکان سەردەمێك لەگەڵ سکاکاندا دراوسێ بوون و هەتاو و مانگ و ئەستێرەیان پەرستووە. لەبەر ئەوەی تێکەلاوی پارسییەکانیش بوون ستایشیان بۆ ئاهۆرامزدا نیشانداوە. کاتێکیش لەگەڵ سلوکییەکان و یۆنانییەکان پەیوەندییان پەیدا کردووە، خوا جۆراو جۆرەکانیان پەرستووەو کاتێکیش ئاشنای ئاینزا و ئایینی زەردەشت بوون لەگەڵ مەزەبی زەردەشتیدا ئارەزوویان پەیدا کردووەو بەشێك لەوانە (واتە لێکۆڵەران) مەزەبی پارتیان بە بیرێکی زیاترو بیرکردنەوەیەکی سیاسی و موناسیب داناوەو وەزیفەکانیان لەوەوە بە فەرماندەرکردن سنووردارکردووە سەبارەت بە جەنگ و زانیاریان لەسەر میترا و ئاناهیتای دوو خوای کۆنی ئارییەکان بە عەشقەوە بۆیان هەبووە. نووسینەکان بەڵگەن کە بە گشتی بیری (مەزدیەسنایی) (خواپەرستی) لە ئێرانی سلوکی و پارتیا هەبووە، بەڵام بە کردەوە رەفتاریان کەمتر پێکردووە. ژمارەیەکیتریش لە لێکۆڵەران بە نیگەرانییەوە باوەڕیان وایە کە پارتییەکان

ئەو خوایانەیان لە سلوکییەکان و یۆنانییەکانەوە وەرگرتووەو خودی ئەوانەیان بە کوڕی خوا داناوە یان زانیووە، چونکە لێکۆڵەرەکان لەسەر ئەو رایە بوون کە ئەوانە سەر بە ئەوان نەبوون، نووسینەکانی سەردەمی پارتەکانیش ئەوە دەگەیەنن کە مووغەکان لە سەرانسەری ئێراندا جۆرەکانی ئایین پەرستنیان لەو پیاوە ئایینییانەوە لە نوێوە بۆ گشت سنوورەکانی ئایینی (مەزدیەسنا) بە مانا گواستوویانەتەوە تاوەکو ئایینی کۆنی خواکانی ئاریایی و ئایینی زەردەشتی کە لە قۆناغی بە یەکگەیتنا بوون بڵاویان بکەنەوە.

(ئاغای مالکوم کالج)ی مامۆستای دانشگای ویستنفلدی لەندە کە بۆ ئامادەکردنی کتێبێك لەسەر پارتەکان گەشتەکان بۆ خۆرهەڵات کرد بە ئامانجی خوێندنەوەی ئەو نووسینانە بەشێوەیەکی راست و رەوان کە لە ناوچەکەدا پارێزرابوون ئەو باوەڕی وایە ئەمانە دیاری پارتەکان خۆیانە کە تایبەتن بە بیابانشین، ناوبراو جارێکیتر نووسیویە: ئایینیتر کە لای پارت رەواجی هەبووە، یان هەتاکو ئەو رۆژگارە هەبوون سەردەمێك کە (نەبوخوزنەسر) جولەکەکانی بۆ بابل بردن لەویّ هێشتنییەوە لەو بەشەدا ئەمانە بوونە درەختی بەردار، بەهۆی ئەوەی ئاشکانییەکان سەر بە رێگایەك و ئاینزایەکی نزیك بەوان بوون. سەرئەنجام ئەمانە لە هیچ کات و شوێنێکدا ئازاری ئایینیان لە رۆژگاری ئاشکانییەکان پێنەگەیشتووە یان شتێکیان لەو بارەیەوە بە قسە یە ئێمە نەگەیشتووە. بە ئارامی ئاشکانییەکان لە کاری ئایینیدا مۆڵەتی کردنەوەی پشووی زۆریان بەو ئاینزایانە داوە لە قەڵمڕەوی خۆیانا.

**بە تێڕوانین بە تەرزی کردو خستنە گۆڕ و ئاداب و مەراسیمی بەش بەشیان و جۆری ئارمگای پارتی کە لە چەند خاڵێکی جیادا بینراون ئەم خاڵانە هەڵدەگوزین:**

1- پارتییەکان لاشەکانیان بە هەر شێوەیەك خستبنە گۆڕەوە لە گەڵیانا دیاریان داناوە.

2- لاشەکانیان بە تەنیایان بە شێوەی خێزانی بە خاك سپاردویانن.

3- لەکاتی مردو خستنە گۆڕەوە روویان نەکردۆتە لایەکی تایبەت کە پەیڕەویان کردبێت.

4- ئەو کەلوپەلانەی لەگەڵ لاشەی مردووەکەدا دانراون پێشتر پەیوەستبووە بەو کاتەی لە ژیاندا بووە یان ئەو پیشەیەی مردووە کە هەیبووە.

5- ئەو شتومەکانەی دیاری لاشەی مردووەکە بووە لە دەری تابووتەکە بۆیان داناوە.

6- پارتییەکان لاشەی مردووەکەیان لەناو تابووتەکە راکێشاوە یان لەناو خاکدا و یا وەکو لەناو گۆڕی بەردینا شاردوویانەتەوە.

7- پارتییەکان لاشەی مردووەکەیان بە شێوەی راکێشراوی لە گۆڕەکەدا داناوەیان بەشێوەی کۆکراوەیی یا وەکو بە شێوەی خستنییە ناو ژووروو بەکراوەیی نێژراوە.

بەم وەسفانە ئاداب و مەراسیمی تایبەت بەم نیشاندانانەی تەرزی مردوو ناشتن پارتەکان کەوتنە بەرچاو و دەرکەوتن کە ئەمانە پادشای تایەفەکان بوون و خاوەنی تاکە ئایینێك نەبوون، کاتێکیش کە گەیشتن بە دەسەڵات لایەنی پارێزگاری و پاسەوانی خودی دەوڵەت بوو بۆ رێزگرتن لە ئایین و مەزهەبەکانیتر.

نووسینەکان و نەخشە بەرجەستەکراوەکان کە بەدەستمان گەیشتوون جارێکیتر ئەوە دەخەنەڕوو بەو جۆرەی سەرنجی لێبدەین. تەنیا لە کۆتایی رۆژگاری پارتەکانا لە فەرمانڕەوایەتی بلاشی سێیەمدا بوو لەوانەیە مەیلیان دابێت بۆ رووکردنە ئایینی زەردەشت بەو جۆرەی کە نەخشی بەرجەستەکراوی بێستوون نیشانی ئەدات، لە رووی دراوی ئەم پادشایەدا نەخشی ئاگردان بە دەرکەوتوویی دەبینرێت، بەڵام نابێت وانیشانی بدەین لەو سەردەمەدا هەموو مرۆڤی ئێران زەردەشتی بووبن.

لە بنەچەدا تەرزی ناشتن لای پارتەکان نیشانەیە کە ئایینی زەردەشتی لە سەردەمی حکومەتی پارتەکانا دادوەری کۆمەڵگا نەبوون. ئەگەر بەپێی یاساکانی زەردەشتی کاریان بکردایە بەهیچ شێوەیەك نەدەبوو مردووەکانیان بەخاك بسپێرن. بەڵکو دەبوایە ببوونایە بە خۆراکی باڵندەکان ئەمەش فەرمانێکی نەگۆڕەو ئایینی زەردەشتی لەوانەیە بۆ ئەو رۆژگارە تەنیا سەرچاوەی رێز بووبێت و دەسەڵاتی دادوەری نەبووبێت. هەتاکو خودی پادشاکانی ئاشکانیش زەردەشتی نەبوون، ئەگەر خۆشەویستی و مەیلیان بۆی نیشانبدایە پاراستنی مرۆڤەکانیشیان بۆ خۆیان دەبرد چونکە ئەوانە لە دەسەڵاتی سلوکییەکان و رەواجی فەرهەنگی یۆنانی نارازیبوون بە پێچەوانەوە فەرهەنگی ئاشکانی لە بەرامبەردا لەژێر فشاری فەرهەنگی هێلینی دا بوو کە ئایینی زەردەشتی دەیتوانی جڵەویان بگرێت لە رۆژگاری ئاشکانییەکاندا بەو هۆیەوە خواکانی یۆنانی جارێکیتر لەناو خواکانی پارتی ئێرانیدا دەرکەوتن.\

هەندێك لەو خوایانەی ئێرنی و یۆنانی کە لە یەکتری چوون لە دڵی مرۆڤدا بەشێوەی خوای تاکو تەنیا سەیرکراون. مرۆڤی ئەم خوایانە لە راستیدا وەکو تاك خستوویاننە بەرچاویان کە بە

دوو ناو ناویان هێناون. نموونه بۆ ئەمه (میترا) که یەکێکه له خواکانی زۆر کۆنی ئێران به (ئاپۆلۆ) خوای یۆنانی چواندوویانه، جگه لەوەش ئایینیتریش جارێکیتر له ئێران رەواجی پەیداکردووه لەوانه ئایینی (زروان)، باوەڕهێنەرانی ئەم ئایینه باوەڕیان وایه که ئاهۆرامزداو ئاهریمەن له چاوی ئەوانەوه توانایان یەکسان بوون، به باوەڕی ئەوانه دوو منداڵی خوای هەتا هەتایی و ئەبەدی رۆژگاری بێکۆتایی بوون که (زروان) ناوی بووه. شوێ‌ی دروستبوونی ئەم ئایینه گەرچی ئێران نەبووه، بەڵام لەم سەرزەمینەدا پەیڕەوانی بەزۆری هەبوون. باوەڕهێنان به خۆرپەرستی جارێکیتر وەکو لەوەوپێش بەردەوامی هەبوو، و خواکانی نێوان دوو رووباریش جارێکیتر له خودی سەرزەمینیاندا و خاڵەکانی دراوسێیانا دەیانپەرستن.

له کۆتایی سەردەمی ئاشکانیدا ئامۆژگاری ئایینی نوێی عیسایی ورده ورده له ئێمپەڕاتۆیەتی پارتدا رەواجی پەیداکرد و له خۆرهەڵاتی ئێرانیش له سەرزەمینی (کۆشان) ئایینی بوزا جێگیر بوو، له هەمان سەردەمیشدا ئایینی جولەکه له بابلیش بڵاوبوو بۆوەو کۆمەڵانی جولەکەش لای ئاشکانییەکان رەغبەتیان زیاتر بوو، و ئەوەی پەیوەستبوو بەناو خۆیانەوه بەشێوەیەکی فراوان ئیمتیازاتیان بۆخۆیان برد. بەو جۆره ئەوه زانراوه که پادشاکان له سەرچاوەی باوەڕی مەزهەبیانەوه به جوانی و بەباشی لەگەڵیانا جوڵاونەتەوه، لەگەڵ ئەوەشدا پێویسته ئەوه بەیادبهێنینەوه گردکردنەوەی مەزهەبەکانی ئێرانی لەگەڵ مەزهەبەکانیتری ئاسیای پێشوو، و سامی و هەروەها یۆنانی بەزۆری به تەنیا لەسەر خاکی ئێران دەرنەکەوتن بەڵکو له بەشی دەرکەوتوو له قەڵەمڕەوی رەسەنیان نموونەیان له نێوان دوو رووبار و سووریا و ئاسیای بچکۆڵه و ئارمەنستانیش شێوەیەان هەبووه. ئەوەی له شوێنیتریش هەبوون له سەرچاوەی مەزهەبه جیاجیاکانی ئەم سەدەیەوه گفتوگۆم لەسەرکردن.

سەرچاوه

علی اکبر سرفراز/ بهمن فیروز مندی/

مجموعه دروس باستان شناسی وهنر دوران تاریخی

چاپ اول 1373، لا301-304

# تەلارسازی هەڵکۆڵینی بەرد

لەڕووی گابەردێکی وەستاو یان دیواری بەردینی شاخێکدا دەتوانین دیمەنێك بتاشین و نەخش لە رووەکەیدا بەرجەستە بکەین، بەو رێگایەش پەیکەرێك لە گابەردەکە، یان وێنەیەکی بەرجەستەکراو دەردەهێنین. گابەردێکی سروشتی وەکو سەرەتا دەتوانین چاڵێکی تیادا هەڵبکۆڵین وردە وردەش چاڵەکە گەورەتر بکەین تاوەکو لەو فەزایەی ئەوەی نیازمانە بۆ نموونە بیکەینە خانوویەك، یان ئارامگایەکی لێ دروست بکەین بەو کارەشمان ئەوەی بەرهەمی دێنین ناوی ململانێی مرۆڤی لێ دەنێین لەگەل گابەردێکدا یان دیواری بەردینی شاخێکدا. بەشێوەیەکیتر تەلارسازی بەردتاشین جۆرێك لە سەربەستی دەهێنیـە گۆڕێ لە دروستکردنی کۆشکێکدا یان لە دروستکردنی گۆڕێکدا کە لە بەردەکە دەرهێنرابێت.

لەلایەکیترەوە ئەم جۆرە تەلارسازییە پێچەوانەی بیناسازی سەربەخۆییە کە بە کارکردن و بە کەرەسەیتر دروستدەکرێت.

دەرهێنانی تەلارێکی ئاوا لە ناو چوارچێوەیەکی فەزا سنووردراردا کە بۆی دیاریکراوە یان ئەوەی دروستی دەکەیت لە فەزایەکدا بەشێوەی قاڵبێك بە دەنەکەی دیاریدەکەیت و بەو شێوەیە لە باڵەکانیەوە دەستی پێدەکەیت تیایدا ئەوەی دەتەوێت دیاریدەکەیت ئەوەش لە وێنەیەکدا نیشانیدەدەیت کە لە گابەردێکدا دەیخەیتە بەرچاو و لە بواری جێبەجێکردندا کاری بۆ دەکەیت. بەوەش بینایەك رێکدەخەیت لە فەزایەکی بچکۆڵەی سنووردارداو دەسپێکردنی لەسەرخۆ و گەیشتنی بە فەزای گەورەو دەرهێنانی لە دڵی بەردە سروشتییەکەوە. ئەو گابەردەش چەند توێکڵی دەرەوەی تووندو تۆڵ بێت ئەوەندە راگرتن و مانەوەی بیناکە زیاتر دەبێت لەسەر لاکانی و ناوەوەی فەزاکە بەو جۆرە بینایەك لە فەزایەکدا بە رێگای هەڵکۆڵین لەبەرچاو دەگیرێت،

ئەوەش بە دوو شێوە دابەش دەبێت:

1- بینایەك كە سەربەست بیت لە دروستكردنیا، بە مانا هونەرمەندەكە سەرەتا هاتووە بەشێك لەو كێوەیان بڕیوەو جیایان كردۆتەوەو دوایی چوونەتە بۆشایی ناوەوەی و قەوارەكەیان بۆ دروستكردووە. ئەم جۆرە بینا بەردینانە پەنجەرەو كونی رووناكی تیادا دروست نەكراوەو دیمەنی دەرەوەی لە بەردەكە دەرهێنراوەو نەخشێنراوە. ئەم شێوەیەش بە زۆری لە پەرستگا بەردینەكانی هیندستاندا یان بە گۆڕە بەردینەكانی نزیك (بیت المقدس)دا دەرئەكەون.

2- بینایەك كە ناوەوەی كێوەكە هەڵبكۆڵرێت. لەمجۆرە بینایانەشدا تەنیا فەزای ناوخۆی بەردەكە بە شێوەی ژوور لە بەردەكە ئامادە دەكرێت، لەم جۆرە بینایانەشدا پەنجەرەو كونی رووناكی نییە، هەروەها بۆچوونە ناوەوەشی بۆ نەكراوە.

بینای دروستكراو كە بە ئاسانی بەهۆی كاریگەری هۆكارەكانی سروشتی رۆژگار لە سەریان وێراندەبن لێرەدا ئەوانەی لەسەریان دواین تەنیا هۆكارێك هەیە بۆ رووخاندنیان ئەویش دوژمنە و كاری دوژمنانەیانە كە هەڕەشە لەو بینا بەردینە بكات یان بوومەلەرزەی زۆر بەهێز كە ئەو بوومەلەرزانە لە زۆر شوێندا توانیوویەتی زیان بگەیەنێت و وێرانی بهێنێت، بەڵام بە سەدان لەو بینایانەی كە لە بەردەكان هەڵكۆڵراون لەو شوێنانەی بوومەلەرزە دەیانگرێتەوە تەنیا كەمێكیان نەبێت بەركەوتوون.

تەلارسازی بەردین كە كۆمەڵێكی مێژوویین ئەمانە هەر لە دیدی زانستی، مێژوویی، هونەری، كۆنینە ناسییەوە، گرنگییەكی زۆریان نییە بەڵكو لە رووی مێژووی شارستانییەت و مێژووی ئایینەكان و پەیوەندییەكانی فەرهەنگی نێوان پادشاكان كە خاوەنی ئەمجۆرە تەلارانە بوون شایانی سەرنجڕاكێشانن. چونكە هەموو ئەوانە وێران نەبوون هەندێكیان ماونەتەوەو بوونەتە قوللەی نەمری، چونكە ئەو جۆرە تەلارسازییە لەبەرد بووەتە مێژووی پێشكەوتنی گەلان كە نەخشی گەورەیان لە راستیدا تیادا كراوەو مرۆڤ لە دیدی مێژووی فەرهەنگی خۆیەوە بە تەلاری نەخشی بەردین بەرجەستەی كردووە، ئێمەش قەرزاری ئەو بیناسازییە دروستكراوانەین لەلایەكیترەوە زۆری ئەو ئارامگایانە لە شوێنە كۆنەكانیاندا كە هەتاكو ئێستا كە لە دڵی خاكەكەدا دامەزراون قەرزاری هونەرمەندەكانیان نین كە نەخشەیان لە دروستكردنیانا بۆ داناون.

ئەگەر لە وڵاتەکەماد نەخشەی تەلارسازی بەرجەستە نەکرایە بەتایبەتی سەرەتایەکی نەبووایە لە راستیدا مێژووی هونەر و هەندێك لەلایەنەکانی باوەڕی ئایینی بزردەبوون و هیچ زانیارییەکمان لەسەریان نەدەبوو. لەلایەکیتریشەوە گرنگی بەرگری لە تەلارسازی بەردین لە بەرامبەر مرۆڤ و ئاژەڵەکاندا و هێرشیان و هۆکارەکانی سروشتی بۆ سەریان ئینکاری لە پێویستی بوونیان ناکرێت. لێرەدا ئارامگایەکی بەردین کە دەخرێنە پاڵ مادەکان بەپێی جۆرو دەرکەوتنی و گەیشتن پێیان دەتوانین ریزبەندی بۆ دابەشکردنیان بەپێی دیمەنەکانیان بکەین:

1- ئەو گۆڕە بەردینانەی کە دیارن و دەتوانین پێیان بگەین و دیمەنی کۆڵەکەکانیان لەبەرچاون وەکو گۆڕە بەردینەکەی

(فەرخریکا لە پانزە کیلۆمەتری باکووری خۆرهەڵاتی مەهاباد و گۆڕەکەی (دوکان داود) لە نزیك سەرپەلی زەهاو و گۆڕە بەردینەکەی (کوڕ و کچ) نزیك سووورداش لە پارێزگای سلێمانی لە کوردستانی باشوور.

2- گۆڕە بەردینەکەی لە دوولاوە کۆڵەکەکانی دەرکەوتوون و لە کێوەکە هەڵکۆڵراون وەکو گۆڕە بەردینەکەی (قزقەپان) لە چەمی رێزان لە ناوچەی سلێمانی هەروەها گۆڕە بەردینەکەی (دائودوختەر) لە نزیکی (فەهلیان)ی فارس و (ئاخور رۆستەم) لە هەشت کیلۆمەتری باشووری تەختی جەمشیدا.

3- گۆڕی بەردینی ساکاری هەڵکۆڵراو کە دەڕۆیت سەیری دەکەیت کۆڵەکەو نیو کۆڵەکەی تیادا دروست نەکراوە. ئەمجۆرە گۆڕە لە کوردستان ناسراون، کە دەیانگەیتێ شێوەکانیان کە لاکێشین، یان چوارگۆشەن.

سەرچاوە

علی اکبر سرفراز، بهمن فیروز مندی

# بینای مەزەبی لە رۆژگاری ساسانیدا

پەرستگای ئاگر: پەرستگای ئاگر، یان شوێنی پارێزگاری لە ئاگر، شوێنیٚ:ی تەشریفاتی مەزەبییە بۆ نزاکردن بەگشتی دانراوە. بەر لە ساسانییەکانیش لە رۆژگاری هاخامەنشییەکاندا ئاگر لە فەزایەکی کراوەداو لەسەر سەکۆیەکی بڵندکراوەتەوە.

ئاگریش دوای نووسینەوەو رێکخستنی شەریعەتەکانی مەزەبی زەردەشتی دێت کە لە سەدەی چوارەمی زایینی بەرەو پێچووەو ئایینەکەش بەپێی ئەو شەریعەتە مەزەبییەکە بڕیاری لێدراوە فراوان بووە کە نابێت تیشکی هەتاو بەر ئاگرەکە بکەوێت، ئەم مەشخەڵە پیرۆزەش کە سەرچاوەی رێزی مرۆڤە لە رۆژگاری ساسانیدا لە ژێر دەواریا بڕیار بەدەستبووە، کە بە شێوەی بینایەکی چوار دەرگا دروستکراوەو دەرگاکانی لەگەڵ چوار لاکانیدا یەکیانگرتووەتەوە کە بەناوی چوار تاقی رێکحراوەیان ناسراوە کاتێکیش نزایان بۆ ئاگر کردووە، پەیڕەوانی ئایینی زەردەشت تەوافیان بە چواردەوریا کردووە بیٚ ئەوەی لە ئاگرەکە نزیك ببنەوە بەو پێیە شێوەی پەرستگای ئاگر لە رۆژگاری (ماد)ەوە بە ئێمە گەیشتووە تاوەکو رۆژگاری ساسانییەکان کە هەندێك جیاوازی لە نێوانیانا هەبووە، بەڵام بەگشتی پەرستگاکانی ئاگر بەشێوەی چوار تاقی ساکار دروستکراون یان گەورەترو گرنگتر بوون کە خاوەنی دالآن بوون لە چوارلاکانیا.

بەناوبانگترین پەرستگایەکی ئاگر لە رۆژگاری ساسانییەکاندا پەرستگای ئاگری (ئازەرگوشنەسپە) لە ئازەربایجان و پەرستگای ئاگری (ئازەرمەهر بەرزین)ە لە رێوەندی خوراسان و پەرستگای ئاگری (ئازەرفەرەنبوغ) لە (کاریان)ی فارس.

لەناو ئەو (3) پەرستگای ئاگرە کە لەسەرەوە ئاماژەمانپێدان (ئازەرگوشنەسپ)ە کە شوێنەکەی لە (تەختی سلێمان) لە ئازەربایجان بڕیار بەدەستبووە، ئەمەیان بەناوبانگترینیان بووە کە پەیوەستبووە بە پادشاکان و سەربازانی ساسانی کە بەپێی باوەڕێك بۆ دیدەنی ئەم پەرستگای ئاگرە پادشاکانی ساسانی لە (تەیسفوون) بارەگای حکومەتەکەیان بەجێهێشتووەو بە پیادەیی بەو شوێنە گەیشتوون، ئەمە خاڵێکە لەلای بیناسازی ئەم پەرستگای ئاگرە بەر لە هەموو شتێك سەرنجڕاکێشە و قابلی باسکردنە، لە دروستکردنی بینای ئەم پەرستگای ئاگرەو سەکۆ و دیوارەکانیدا خشت و بەردو گەچ بەکارهێنراون رووەکانیشی تیایانا خشت بەکارهێنراوە، بەڵام ئەم بەکارهێنانە لەسەر شێوەیەك

نەوەستاوە بە پێچەوانەوە جارێکیتر خشتیان بۆ بەشی ژێرەوەی دیوارەکان بەکارهێناوە ئەمەش دەمانگەیەنێتە ئەو ئەنجامەی کە لە سەرتادا بینای پەرستگا بە خشت دروستکراوەو لەگەڵیا بەردیشیان بەکارهێناوە هەر بەو جۆرەش بۆ چاککردنەوەی شوێنە رووخاوەکانی لە رۆژگاری دواتردا بەرد بەکارهێنراوە. لەلایەکیترەوە ئەو دابەشکردنەی لەناو پایەو ژوورەکانیدا کراون وایکردووە پارێزگاری لە مانەوەی بکات و بەردەوامی بە پەرستگاکە بدات، بۆ ئەو قایماکارییەش خشتی چاك و توونکدو تۆڵیان بەکارهێناوە کە لە کورەدا سوورکراوەتەوەو پلەی گەرمای زۆری هەبووە، لە رۆژگاری ساسانیشدا ژوورەکان شێوە لێکدراو بوون و دیوارەکان و پایەی ژوورەکانیش لە روویاندا تێپەڕبوون، ژووری پەرستگای ئاگریش خاوەنی گومەزێکە کە چوار دیواری شێوە چوارگۆشەکەی داپۆشیوەو لە ناوەڕاستی پەرستگای ئاگرەکەشدا شوێنی قوربانی دانراوە کە لە کاتی جەژن و بۆنە مەزهەبییەکاندا ئاگری پیرۆز لە ئاگردانی ناوخۆوە بۆ ئەم پەرستگای ئاگرە گوێزراوەتەوە.

ژووری مەرکەزی پەرستگای ئاگریش هۆڵێکی گەورەیە کە بە خشت دروستکراوەو رەنگی خشتەکانی سوورو زەرد یان هەندێکجار مەیلەو خۆڵەمێشی و پتەو بوون.

**قەسری شیرین:**

چوار قاپی یان (چوار دەروازە) لە نموونەی پەرستگاکانی ئاگری رۆژگاری ساسانییە لە شاری سنووری قەسری شیرین. ئەم چوار قاپییە لە جۆری پەرستگاکانی ئاگرەو خاوەنی دالانێکە بۆ تەوافکەران و پێکهاتووە لە هەیوانێك کە دەکەوێتە سەر رووی بەدەنی چوار قاپییەکە. پەرستگای ئاگری قەسری شیرین پێکهاتووە لە ژوورێکی چوارگۆشە درێژی باڵێکی 25 مەترەو بەشی سەرەوەی گومەزییە، بەڵام پاشماوەی گۆشەکانی لە چوارگۆشەی بیناکەوە بەرچاو دەکەون، بیناکەش لاشەکەی بە بەردو گەچ یان (گڵ و قسڵە) و لە باکووری ئەم پەرستگای ئاگرەشدا وێرانەکانی کۆشکی خەسرەوی پەروێز بەرچاو دەکەوێت کە خاوەنی باخێکی گەورەیە و بەردەکانی کۆشکەکەش وێنەی ئاژەڵی لەسەرە کە لە راستیدا دیمەنی باخی ئاژەڵدارە کێویەکان بووە. کۆشکەکە خۆی لەسەر سەکۆیەك دروستکراوە، لای خۆرهەڵاتییەوە هەیوانێکی گەورەی لە خۆگرتووەو لە پشتی ئەو هەیوانەشەوە تەلارە ئەسڵییەکە دێت کە بەو هەیوانەوە پەیوەستە، تەلارەکەش بەشێوەی چوارگۆشەیە و خاوەنی گومەزێکەو، لای خۆرئاوای تەلارەکەش گۆڕەپانێکی بچکۆڵە دروستکراوە کە بە چواردەوریا چوار هەیوانی کۆڵەکەدار هەبوون، لە تەرەفی خۆرئاوای ئەم هەیوانە بچکۆڵەشەوە لە

دوولایتریەوە گەلێك ژوور هەن، بەرامبەر هەیوانەکەش گۆڕەپانێکی گەورە هەیە کە کۆشکێکە بە شێوەی لاکێشی و لە ئەترافەکانیا ژوورو خانوو دروستکراون، لە دووری 250 مەتری ئەم شوێنەش پاشماوەیەك هەیە بەناوی حاجی قەڵاسی ناسراوە. لەڕووی سەکۆیەکی بەرزدا بە بەردو گەچ و چەوی بچکۆڵە و قسلّ دروستکراوە، (بانقەلا)ش ئەمە پاشماوەی بینایەکی گەورەیە کە لە رۆژگاری ساسانیدا هەبووەو لەوانەیە مەرکەزی کارگێڕی رەسمی سەردەمی ساسانی بوویێت لێرەدا ئاسەواری پاشماوەی بینای قەسری شیرین تاوەکو ئێستاش کاری کنەو پشکنینی شوێنەوارناسی بە کردە نەیگرتووەتەوە، بەڵام خوێندنەوەیەك کە بەشێوەیەکی رووکەش لەسەر شوێنەکە ئەنجامگیر بووە تاوەکو ئەەندازەیەك بەپێی پلان و نەخشەی دیمەنەکان دەرئەکەوێت کە بۆ ئەوە دروستکرابێت.

وێرانەکانی شاری مێژوویی کەرخە: لە خۆزستانپاشماوەی ئاسەواری فرەی رۆژگاری ساسنی هەن کە لە سەرووی هەموویانەو وێرانەکانی شاری مێژوویی ساسانی کەرخەیە و نووسراوەکە شاپووری (دوالاکتاف) دروستیکردووە. (کەرخە)ش شارێکە بە شێوەی لاکێشی بووە و بە شوورایەك دەوردراوە کە لە خشتی قوڕ دروستکراوە درێژییەکەی 4 کیلۆمەترەو پانییەکەی کیلۆمەترێکە. ناوەوەی شارەکە بارەگای حکومەتی و گەلێك باخی تیادا دروستکراوە، بەپێی ئەو کاری کنەو پشکنینانەی لە ساڵی 1950 لەلایەن پشکنەرانی فەرەنسییەوە لەم شوێنەدا کراوە پاشماوەی کۆشکێك کە دیمەنەکەی لە دوو دالان پێکهاتووە بە درێژی 30 مەتر دەرکەوت، لەم کۆشکەدا کە پاشماوەکەی ماوەتەوە لە دوولاوە تەلاری ئەسڵی دروستکراون، گەڕان و پشکنینیتریش لە بەرامبەر دەروازەی باشووریدا کراوەو تەلارێك کە لە (3) لای خاوەنی هەیوان بووە دەرکەوت درێژییەکەی 12 مەترەو پانییەکەی 8 مەترە و رووی دیوارەکانی ئەم بینایەش بە نەخشەسازی مەجلیسەکان رازێنراوەتەوە.

لە خۆزستان لە ناوچەکانی وەکو شووشتەرو دیزفول پاشماوەی شوێنەواری بەنداو و پرد هەن کە بۆ رۆژگاری ساسانییەکان دەگەڕێنەوە. لە شوێنێك بەناوی (جوندی شاپور) کە شوێ،ی دیلەکانی رۆم بووە لە رۆژگاری شاپوری یەکەمی ناسراودا نووسراوە کە نەخشەی شارەکە بە شێوەی شەترەنج و دانانی ریز بووە کە دیلەکانی رۆمی ئەوانەی وردە روو بە گەورە بوون چوو و لە سەردەمی خەسرەوی یەکەم بە شێوەی شارێك دانشگای تیادا بوو کە دانشگای پزیشکی بوو و لەو رۆژگارەدا ناوبانگی بە دنیادا بڵاوبۆوە.

**سروستان:** ئەم شارە دەکەوێتە 84 کیلۆمەتری شیراز و لە دووری 9 کیلۆمەتری وێرانەکانی سروستانی سەردەمی ساسانییە کە تیایدا پاشماوەی بنیایەکی گەورەو گرنگ سەرنجمان رادەکێشێت.

نەخشەی گشتی ئەم بینایە هاوشێوەی کۆشکی (فەیرۆز ئاباد)ەو پێکهاتووە لە هەیوانێکی ناوەوەی ئەسڵی بە پێچەوانەی هەیوانەکەی فەیرۆز ئاباد کە قووڵییەکەی کەمترە، بەڵام ئەوەی فەیرۆز ئاباد لە ناوەوە دەگاتەوە بە کۆشکێکی چوارگۆشەیی و بنکە دوو گومەزی تیادایە. لە پشتی ئەم کۆشکەوە گومەزێکیتر لەسەر بناغەیەکی بازنەییتر پەیوەست بە بەشی پێشوازییەوە دامەزراوە، ناوەوەی ئەم بینایە گرنگتر و گەورەتر لەوەی فەیرۆز ئاباد دروستکراوە، نەخشەی پشتەوەی بیناکەش دیارە پلەدار بووە، هەر ئەو هۆکارانەشە وایکردووە مێژووی بیناکە بەلایەنی کەمەوە بە دوو سەدە دوای فەیرۆز ئاباد بزانرێت، گومەزی کۆشکەکەش بە خشتی سووری پوخت دروستکراوە لە کاتێکدا فەیرۆز ئاباد لاشەکەی تەنیا بە بەردکراوە.

لەناو بیناکەدا و لە رۆخی لایەکیدا تەلارێکی گومەزی هەیە، سەری کۆڵەکەیەکی خڕی کورت بە شێوەی دوو قل لە رووی دیواری کۆتایەیکەی دەرهێنراوە کە بە شێوەیەکی ئاسانی نیشانیدەدات بینایەکی یادەوەری سەردەمی ئیسلامی بووەو لە سەرەتای هاتنی ئیسلام دروستکراوە.

لە تەواوی دیوارە درێژەکانی ئەم تەلارەدا تاقی گەورەی سەرکەوانەیی دەبینرێت. دروستکردنی ئەم بینایە هەتاکو ئێستا هۆکارەکەی روون نییە کە بۆچی مەبەستێك دروستکراوە، بەڵام خوێندنەوەیەکی بیناسازی نیشانیدەدات کە مێژووەکەی بە چاخی پێنجەمی دەسەڵاتی ساسانی دەزانرێت بە مانا پەیوەستە بە (بارام گور) (420-421ز) کە بۆ وەیزرەکەی (مەهر نەرسی) دروستیکردووە، هەروەها دۆزینەوەی پاشماوەی پردی وێرانبووەش لە رووباری فەیرۆز ئاباد کە دوورە لە نەخشی بەرجەستەکراوی سەرکەوتنەکەی (ئەردەشێر) بەسەر (ئەردوان) بەپێی نووسینێك دەرئەکەوێت دروستکردنی پردەکەش بۆ (مەهرنەرسی) پشتگیری لێدەکات.


سەرچاوە

علی اکبر سرفراز/ بهمن فیروز مندی

مجموعە دروست باستان شناسی وهنر

دوران تاریخی/ چاپ اول 1373/ ناشر/جهاد دانشگاهی هنر/ لا 402-406

## نووسین و ئەدەبیات لە سەدەمی ساسانیدا

ساسانییەکان لە سەرەتادا (3) جۆر نووسینی یۆنانی و ئاشکانی و ساسانیان بەکارهێناوەو ئەوەی لە ناویانا باو بووە ساسانی بووە کە بە فارسی ناوەند، یان بە پەهلەوی ئاشکانی ناسراوەو نزیك بووە لە نووسینی بەکارهاتووی زمانی ئاشکانی. کە پەهلەوی ئاشکانی پێدەڵێن و هەردووڵاشیان لە رەگوڕیشەیەوە هاتوون.

کۆنترین بەڵگەنامە: نووسینی ئارامی لە رۆژگاری هاخامەنشییەکاندا نووسینی رەسمی و ناردنی نووسراوەکانی کارگێڕی دەوڵەت بووە، ئەم نووسینە لە رۆژگاری ئاشکانییەکاندا جارێکیتر پارێزگاری لە ناسنامەی خۆریکردووە، ئەوەش لە رووی زۆرینەی پارچە سواڵەتەکاندا دەرکەوتووە کە لە رۆژگاری پارتەکاندا بەدەستمان گەیشتوون، بەو پاشماوانەش ئاشنای نووسینی ئارامی بووین کە بەشی زۆری ئەم سواڵەتە دۆزراراوانە لە (قوشە) یان (کۆمش) هەبوون لەوانەشە لە (هەکاتووم پلیس)یان شاری (سەد دەروازە) بووبن کە گۆزەی شەڕاب بوون و لە کنەو پشکنینەکانی شوێنەوارناساندا لە (نسا)ی شوورەوی دەستکەوتوون کە نووسینی ئارامی و نووسینی پەهلەوی ئاشکانی لە رووياندا نووسرابوون، بەشی دەرەوەیان کە نووسینی پەهلەوی ئاشکانییە بە کەمێك گۆڕانکاریی لە نووسینی ئارامی دروستبووەو کۆنترین بەڵگەش نامەیەکە کە لە گۆڕینی ئەم نووسینە لە رۆژگاری ئاشکانییەکاندا بەدەست ئێمە ەگەیشتووە کە (3) پێستی ئاسکە و لە ساڵی 1909ی زایینی لە ناوچەی هەورامانی ئەمدیو دۆزرانەوە کە بەناوی بەڵگەنامەکانی هەورامان ناسراون، نووسینەکانی سەر ئەم پێستانە بەو جۆرەبوون کە پەیوەستبوون بە قەواڵەنامەیەکی پادشایی و مێژووەکەی وابەستەیە بە (2100) ساڵ بەر لە ئێستا. دووانیتر لەوانە کە بە یۆنانی نووسرابوون پەیوەستبوون بە ساڵی 88ی پێش زایین کە لە پشتی هەر یەکێك لەو دوو نووسخەیەدا (5) دێر نووسینی پاتیان لەسەر نووسرابوو کە

لێکۆڵەری ئەم ئەوراقانە ئاغای (مینس) مێژووەکانیانی بردووەتەوە بۆ رێکەوتی کۆتایی فەرمانڕەوایەتی (مەهردادی دووەم).

**سەردەمی فەرهادی چوارەم:** ئەمەیوتمان راستەو لەبەرچاوگیراوە، وەکو هەردوو نووسینەکەیتری بێستوون و سەرپێڵی زەهاو کە سەردەمەکانیان بە (مەهردادی دووەم) کە بەهۆیانەوە نووسینی پەهلەوی و ئاشکانی لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکاریانەدا لەو رۆژگارەدا شێوەی رەسەنی خۆیان وەرگرتووە لەبەر ئەوە نووسینەکەی بێستوون بە یۆنانییە و ئەوەی سەرپێڵی زەهاویش بە پەهلەوی ئاشکانی نووسراوە، بەڵام نووسخەیەکیتر لەم بەڵگەنامانەی هەورامان کە تەنیا بە نووسینی ئاشکانی نووسراوە پەیوەستە بە ساڵی 21ی پێش زایین سەردەمی فەرهادی چوارەمی ئاشکانی، ئەم بەڵگەنامەیە ئێستا لە مۆزەخانەی بەریتانیا لە لەندەن پارێزراوە. هەروەها لە کۆتایی فەرمانڕەوایەتی پارتداو سەردەمی ساسانیدا ئاسەوارێك بەمجۆرە نووسینە لە شوێنێك بەناوی (کاڵ چنگاڵ) نزیك شاری (بیرجند) دۆزرایەوە کە پەیوەستبوو بە سەرەتای سەردەمی ساسانی، ئەوەی لە نووسینە گرنگەکانی سەرەتای ساسانی لامان ئاشکرایە و ئاساییە وەکو نووسینەکانی هاخامەنشی بە (3) زمانی ئیلامی و بابلی و فارسی کۆن نووسراون، ساسانییەکانیش جارێکیتر بە نووسینی پەهلەوی ساسانی و ئاشکانی و یۆنانی نووسیویانە، نموونەش بۆ ئەمە نووسینەکەی کەعبەی زەردەشتە، دوای ئەوەش تەنیا بە پەهلەوی ئاشکانی و ساسانی نووسیویانە و لە دواییدا تەنیا لەسەر نووسینی ساسنی ماونەتەوە، کە بە زۆری لە بارەگای حکومەتەکەیان لە فارسی پەیڕەوکراوە، دواتریش کە پایتەختەکەیان گواستۆتەوە لە باشوورەوە بۆ خۆرئاوای ئێران لە فەرمانڕەوایەتی شاپووری دووەمدا (309-379ز) هەمان ئەو شێوەیە ماوەتەوەو بەردەوامی هەبووە، پاشماوەی ئەم نووسینانەش لە ناوچ1ەی خۆرئاوادا جارێکیتر وێنەیان لە باکووری خۆرهەڵاتی ئێراندا لە کۆتایی سەردەمی ساسانی و سەرەتای ئیسلامدا دەرکەوتن، لەوانە پاشماوەی نووسینەکانی (گورگان) و (مازندەران)ن کە لە رووی هەندێك لە بیناکاندا بە پەهلەوی نووسرابوون دەرکەوتن لەوانە (قوللەی لاجیم)ی رەشەکیوی مازندەران کە بێجگە لە نووسینە کوفییەکە خاوەنی نووسینێکیتریش بوو بە پەهلەوی بەمێژووی (413)ی کۆچی هەروەها لە (قوللەی رسکت)ی پانزە کیلۆمەتری (قوللەی لاجیم)یش نووسینێکیتر هەیە بە کوفی و پەهلەوی نووسراوەو بۆ مێژووی (400)ی کۆچی دەگێڕنەوە هەروەها لە (قوللەی رادگان)ی نزیك بەندەری

(گزگرکان)یش کە خاوەنی دوو نووسینی کوفی و پەهلەوییە مێژووی نووسینەکانی بە نێوان ساڵانی (407-411)ی کۆچی دەزانن، ئەو نووسینانەش کە بە زمانی پەهلەوین و ماون دوو نووسینن (گشتە دەبیرە) و (ئوم دەبیرە)ن، (گشتە دەبیرە) نووسینەکەی بەرامبەر ئەو تیرەو قەواڵەو دراو و مۆرو بەردی نووسراو هاتووە.

مەقامی ئاهۆرامزدا: (ئوم دەبیرە)، کە نووسینەکەی بەرەو رووی ئەو تیرەیەیە بۆ کاری رۆژانەی هەمەجۆر نووسراوە، بەڵام لەبارەی سەرچاوەی نووسینەکانی ئاوێستایی و زمانی ئاوێستا جیاوازی بەرچاو هەیە. هەندێك بە یەکێك لە زمانە دێرینەکانی ئێرانی دائەنێن کە شێوە زاراوەکەی بەخۆرهەڵاتی دەزانن و فارسی کۆنیش لە باشووری ئێران هەبووە بۆ ئەمەش هەندێك باوەڕیان وایە کە لە خۆرئاوای ئێرانەوە هاتووە، بەڵام شارەزایانی زمان لەو باوەڕەدان کە زمانی ئاوێستایی تیایدا بە ئەنجام گەیشتووەو پایەی (ئاناهیتا)ش کە بە شێوەی فریشتە و خوابووە لە ئایینی زەردەشتیا چووەتە پێشەوەو بردوویەتە مەقامی ئاهۆرامزدای خوای گەورە، فرەخوایەتیشی لە شوێنی ئاهۆرامزدا بە پێچەوانەی پێشینان دروستکردووە. یان نووسینەکەی (سەرمەشهەد) کە لە فرسەتێکی گونجاودا هەڵکۆڵراوە، بابەتی نوێتری تێدایە، لە نووسینەکەی کەعبەی زەردەشتدا کە بە نیگەرانییەوە هەتاکو ئەمڕۆش خوێندنەوەکەی بە شێوەیەکی تەواو بڵاونەبۆتەوە یان ئەنجامی بەدەستەوە نەداوە بەهۆی ئەوی لە یەکەمین بارەگای حکومەتی ئەردەشێر بە مانا لە شاری (گوریا)، ئەدەشێری بە توانا و دەسەڵات لەو رۆژگارەیدا چۆن دەبێت کە ئەمە یەکەمین نووسینی بوو بێت و پەیوەست بێت بە شاپووری کوڕی لە شاری (بیشاپوور) و خوێندبێتییەوە کە بە شێوەی وێنە و رێورەسمی ئەو رۆژگارە لە سەرەتاوە تاوەکو کۆتایی داینابێت بۆ ئەوەی بە زوویی ئاشنایەتی لەگەڵیا پەیدا بکەن.

جێگای نەزرگە: بۆ یەکەمجار کەسێك بەناوی گریشمەن کنەو پشکنەری فەرەنسی ئەو ناوەی (50ساڵ) بەر لە ئێستا لێناوە بەشوێنێکی وتووە کە نووسینێکی گرنگی لەسەرە لە دروستکردنی شاری (بیشاپور)دا کە لە رووی یەکێك لەو دوو کۆڵەکەیە هەڵکۆڵراوە، بابەتی بیناکەو دیمەنەکەی ئەوە دەگەیەنێت کە خاوەنی گرنگییەکی تەشریفاتی بوو بێت و بەشێوەی بینایەکی یادگاری لە سەنتەری شارەکەدا دروستکرابێت و شوێنی هاتنی میوان بوو بێت و لە رۆخ رێگاکەی خۆرهەڵاتی و خۆرئاوای (بیشاپور) بە جوانی دەرهێنرابێت بە شێوەیەك لە رووی

سەکۆیەکی بەردین دوو کۆڵەکە بە بەرزی (9) مەتر بە پێوە وەستاون و سەری کۆڵەکەکانیش پڕ نەخش و نیگارن بە شێوەی (کۆرەنپی) دانراوە، وەزعی شوێنەکەش نیشانیدەدات کە تەشریفاتی بوو بێت بۆ بەخێرهاتن و چاوەڕوانی بوو بێت بۆ ئەو کاتەی کۆچەرییەکان چوونەتە ناو شارەکە، نەوەك جێگای دانانی نەزرەکان بووبێت. لە نێوان دوو کۆڵەکەکەدا و لای راستی لەژێریا نووسینێك هەیە.

لە مانگی فەروەردینی ساڵی 58 شوێنی ئاگری ئەردەشێر پێویستبووە، ساڵی 40 شوێنی ئاگری صاپوور لە ئاگرەکانی پادشایەتی پێویستبووە، لە ساڵی 24 ئەم دیمەنی (پەیکەر)ی (بەغ)ی خواپەرستی لە خواکانی شاپووری شاهەنشای ئێران و دەموچاوی فریشتەی خوایی و منداڵی (بەغ)ی (خوا) پەرستی، پادشا ئەردەشێر شاهەنشای ئێران کە دەم و چاوی خوایی هەیە و منداڵی فریشتەی (بابك)ی گەورەی ئەمکارەی ئاسپای مامۆستا لە شاری حەران، لە خانەدانەکانی نزیکە... و بەو تەرتیبەی رۆژگاری خواپەرستی شاپووری شاهەنشای ئێران، فریشتەکەی دیمەنی رەعیەتی خوایی هەیە و رۆژگارێك کە شاهەنشا (هات) ئەم دیمەنەی دی (وەستا)، بە ئاسپای مامۆستاو بەندەکان و کەنیزەکان زیو و باخی پێبەخشین بەپێی ئەو پێوەرەی لەکاردا بەدەستهاتووە ساڵی 58 شوێنی ئاگری ئەردەشێر و ساڵی 40 شوێنی ئاگری شاپوور و ساڵی 24.. هاوکاتە لەگەڵ ساڵی (260)ی زایینی بە مانا بە سەرنجی ورد شەش ساڵ دوای ئەوە شەڕی شاپوور لەگەڵ ڤالیریان دەگرێتەوە کە ساڵی 226ی زایینیە، ئەو مێژووەش تەواو پەیوەستە بە کۆتایی دروستکردنی شاری بیشاپور.

رۆژگاری شاپووری یەکەم: ئەوی پەیوەستە بە کەسی دکتۆر عەباس بەو جۆرە نووسیوویە: شاری (بیشاپور) کە دەکەوێتە ناوچەی فارس نووسینێکی کەسی بەناوی مامۆستا (ئاسپای) بەدەستگەیشتووە کە لە رۆژگاری شاپووری یەکەم و لە گۆشەی پەیکەرەکەی نووسراوە کە مێژووەکەی دەڵێ: لە مانگی فەروەردینی ساڵی 58 رەغبەتی ئاگری ئەردەشێر زۆربوو، ئاگری ئەردەشێر 40 ساڵ و، رەغبەتی زۆری ئاگری شاپوور 24 ساڵ رۆشتووە بەسەریا، ئەگەر سەرەتای دەسەڵاتی شاپووری یەکەم بزانین ساڵی نووسینەکەش دەزانرێت، ساڵی یەکەمی فەرمانڕەوایەتی شاپوور ساڵی کەوتنی (حەزەر)، (هاترا)یە و لە کتێبێکی (مانی)دا هەیە کە بە زمانی یۆنانییە و تازە بەدەستم گەیشتووە، لەوکاتەدا (مانی) وتوویەتی: من کاتێك تەمەنم 24 ساڵ بوو ئەردەشێری پادشای پارس شاری (حەزەر)ی داگیرکرد، لە هەمان ساڵێشدا

شاپووری کوڕی ئەردەشێر گەورەترین تاجی لەسەرناساڵی لە دایکبوونی مانی 216ی زایینی بووە بۆیە بەپێی قسەی خۆی دەبێت ساڵی داگیرکردنی (حەزەر) بەدەستی ئەردەشێر ساڵی 240ی زایینی بێت لێرەدا چۆن دەبێت (مانی) قسە لەسەر مەرگی ئەردەشێر نەکات لە کاتێکدا قسە لەسەر تاج لەسەرنانی شاپوور بکات، بەناونیشانی هاوبەشیکردنی لە کارەکانی کاروباری دەسەڵاتەکەیدا،

ساڵی مەرگی ئەردەشێر بەپێی بۆچوونێك (نۆڵدکە) دەیباتەوە بۆ ساڵی 241 کە راستە. بەهەرحاڵ رەخنە لەسەر ساڵی دانیشتنی شاپووری یەکەم و کۆتایی دەسەڵاتی (ئەردەشێر) لە ئێران جیاوازییەکی فرە لەناو لێکۆڵەراندا خستووەتەوە کە هەتاکو ئێستا چارەسەر نەکراوە، لە سەرێکیترەوە رەحنەکەی (نۆڵدکە) لەو رووەوە روونـاکتر دیارەو دەتوانین بریاری لەسەر بدەین.

لەم نووسینەدا شاپوور کەسی خۆی (بەغ) واتە خواپەرستبووە، هەروەکو چۆن لە رابووردوودا مەزەب و ئایینی هاخامەنشییەکان بەخواپەرستی ناسراون ناوبراویش نەژادی لە خواوە بووەو هەر لەوێشەوە دەسەڵاتی وەرگرتووەو بۆی هاتووە.

نووسینەکەی کەعبەی زەردەشت: لە ئاسەوارە ئەدەبییەکانی سەرەتای فەرمانڕەوایەتی ساسانی نووسینە ناسراوەکەی کەعبەی زەردەشت دێت لە شوێنێکە کە پێیدەڵێن نەخشی رۆستەم لە فارس، بینای کەعبەی زەردەشتیش لە پاشماوە گرنگەکانی بیناسازی سەردەمی هاخامەنشییەو رووبەڕووی گۆڕەپانێك بووەتەوە کە (50) مەتر نێوانیانە و شوێنەکەش کونێکە دورستکراوە هەتاکو ئێستاش کارکردن تیایدا بە جوانی دەرنەکەوتووە یان تەواو ئاشکرا نییە، بەڵام واسەیری دەکەن شێوەیەکی تەواوی هەیە و لە بینای ناسراو بە گۆڕی (کەمبوجییە) دەچێت لە (پاسارگاد) لە سەرەتای فەرمانڕەوایەتی هاخامەنشییەکاندا بۆ ئارامگای دروستکراوە.

لە رۆژگاری ساسانییەکاندا شوێنی نەخشی رۆستەم لای پارس پیرۆزکراوە بە مانا بەشی خوارەوەی بەدەنی واتە باکووری و خۆرهەڵاتی و باشووری. ئەم بینایە لە فەرمانڕەوایەتی شاپووری یەکەمی ساسانیدا نووسینێکی گەورەی لەسەر بووە کە، پەیوەستبووە بە شەڕو داگیرکردنەکانیەوە، دواتر (کەتیر)یش هەنگاوی بۆ ناوی بۆ ئەوەی پێیبگات ئەوکاتەی هەستاوە بە تەفسیری ئاوێستا بە زمانی پەهلەوی ساسانی و ئاشکانی و یۆنانی، بۆ ئەم سەرچاوەیەش ئاماژە هەیە. جگە لە نووسینی ناوبراو چەند

نووسینێکیتری گرنگی ئاسەواری ئەدەبی و مەزەبی رۆژگاری ساسانییەکان لە کتێبی ئاوێستاشدا هەیە بە مانا کتێبی مەزەبی زەردەشتییەکانی ناسراو کە مێژوویان پەیوەستبوو بە رۆژگاری زەردەشت وەکو دەزانین بەپێی ئەو نووسینانە لێکۆڵەران رایانوایە کە ئاوێستا رۆژگاری هاخامەنشییەکان پێکهاتووە لە (815) فەسڵ کە هەمووی (21) (نەسك) (باب)ەو بە دوو نووسخە لەسەر پێستی گا نووسراوە، هەروەکو دەڵێن دوانزە هەزار پێستی گا ناوەرۆکی ئاوێستای لەخۆ گرتووەو لە شوێنێك لە کەعبەی زەردەشت پارێزگاریان لێکردووە، بەڵام لە رۆژگاری هێرشەکەی ئەسکەندەردا بۆ سەر ئێران بە ئاگر سووتاوەو نووسخەی دووەمیش بۆ یۆنان براوەو بە یۆنانی تەرجومە کراوە کە لە سەردەمی خۆیدا پەیوەستبووە بە زانستی فەلسەفی و ئەستێرەناسیی و پزیشکی.

هەر بەو جۆرە لە رۆژگاری ساسانییەکانیشدا کۆکراوەتەوە کە تەنیا 248 فەسڵ و هەمووی 21 (نەسك)ە کە (345700) وشە بووە کە پەیوەستبووە بە (حەدیپ) و ریوایات و زانستی مەزەبی کە لە سنگێکەوە بۆ سنگێکیتر گوێزراوەتەوە تاوەکو گەیشتووە بەو رۆژگارەو کۆکراوەتەوە، بەڵام ئاوێستایەك کە ئێمە لێی بە ئاگاین بەپێی ئەو لێکۆڵینەوانەی لەسەر نووسینەکانی کراوە بە زمانی هیندو ئێرانی ئەسڵەکەی لە پایتەختی دانیمارکە لە (کۆبنهاگن) و پارێزگاریلێکراوە بەگشتی لە (5) بەش پێکهاتووەو پێرستی هەیە.

1- فەسڵی یەسنا.

2- یەشتا: لە ستایشی پەروەردگارو یەزدانا.

3- وەندیداد (یاسای دژ بە دیوەکان) لە بوونی سروشت و هەندێك دادوەرییەکانی مەزەبی لەوانە کاری تایبەت بە مردوو و بڕیاردان بە دانانی لاشەکەی لەسەر قولەی خامۆشی.

4- ویسپەرد: کە هەمووی لەسەر ئاهەنگ و جەژنەکانە.

5- خوردە ئاوێستا: یان ئاوێستای بچووك کە هەمووی لەسەر نزاو نوێژو رۆژە پیرۆزەکانە و بەشێکن لەو رێورەسمانە.

جگە لەو بەشانەی سەرەوەلە تەرجومەی ئاوێستادا بە زمانی پەهلەوی زەند ئاوێستا هەیە کە دەربڕینە لە تەفسیری ئاوێستا، جگە لەوەش کتێبی ئەدەبی و مەزەبیتریش هەن کە ناوەرۆکی ئەدەبی و رۆژگاری ساسانییەکانی لەخۆگرتووە کە دەتوانین ناویان بهێنین:

ئەلف: پەرتووکی دینکەرت (بە مانا کارەکانی ئایینی) کە یەکێك لە پێشەوایانی زەردەشتی لە سەدەی سێیەمی کۆچی دەربارەی مێژوو و ئاداب و رێورەسمەکان و ئەدەبیات نووسراوەو گەورەیی خۆی هەیە کە تا ئەم سەردەیەمان لە نرخدا لە پێشەوەیە و لەم رێگایەوە پشکی گەورەی هەیە، کتێبەکەش دەخەنە پاڵ (موبدێکی)مەزەبی رۆژگاری ئەردەشێر بەناوی (تەنەسور)، بەڵام خودی کتێبەکە لە ناوەندێکی مەزەبیدا دەرکەوتووە کە پەیوەستی دەکەن بە کۆتایی رۆژگاری ساسانییەکان.

بێ: پەرتووکی بەندەهش: لە راستیدا پوختەی ئاوێستایە و ماناکەی خولقادنی بنەچەی رۆح لە بەرەکانە لە سەردەی پێنجەمی کۆچی نووسراوە، پەرتووکەکەش لە بنەماکانی ئایینی و دروستبوونی جیهان و مێژوو و چیرۆکەکان ئەدوێ.

جیم: داستانی دینەك: کە پەیوەستە بە بیروباوەڕی ئایینی لە کۆتایی سەدەی نۆیەمدا نووسراوە.

دال: رەوانەوەی گومان: (راپۆرتێك لەسەر رەوانەوەی گومان) پەرتووکێکە بۆ بەرگریکردن لە ئایینی زەردەشت لە بەرامبەر هەموو ئایینەکانیتردا لە کۆتایی سەدەی نۆیەم نوسراوە.

هێ: خوای نامك: (شانامەی رۆژگاری ساسانی) کە بۆ رۆژگاری یەزدەگوردی سێ دەگەڕێتەوە لە باسی ئەحواڵی شاکانی ساسانیدا دانراوە لە سەرەتاوە تاوەکو رۆژی نووسینەوەی.

واو: ئایینی نامك: پەرتووکێکە لە باسی دامەزراوەکانی ئیداری بەر لە ساسانییەکان.

زێ: گاهنامك: پەرتووکێکی گەورەیە بۆ ناو و پایەو کاری گەورە پیاوەکانی فارس.

حێ: تاج نامك: سەرچاوەی ئامۆژگارییە بە حەکایەت.

تێ: پەرتووکی ماتیکان: هەزار ئاواز. کۆمەڵێك یاسای ماف و جەزاییە.

یێ: نامەی تەنەسوور: بەشێوەیەك نووسراوە کە (تەنەسوور) موبدی موبیدەکان بووە لە رۆژگاری (ئەردەشێر)دا؟ بەو بۆنەیەبەوە بۆ پادشای تەبەرستانی نووسیوە بۆ ئەوەی ملکەچی پێبکات لە بەردەم ئەردەشێردا بۆیە دەعوەتی کردووە ئەمەش داخوازی مێژوویی و سیاسی و رەوشتی لە پشتەوەیە و لە کۆتایی رۆژگاری ساسانیدا نووسراوە.

ك: مینوخرد: پەرتووکێکە 62 پرسی ئایینی زەردەشتییەکانی تیادایە کە لە کۆتایی رۆژگاری ساسانیدا نووسراوە، جگە لەو کتێبانەی ناومان هێنان لە کتێبی (ئیبنولنەدیم)دا

پێڕستی ژماره (5377) ناوی (70) کتێبی تیادایه که به زمانی پەهلەوییه و بۆ عەرەبی تەرجومە کراون و لە سەدەی چوارەمدا هەبوون کە دەربارەی پرسە جیاوازەکانن، لەو شتە گرنگانەی هەیە بوونی وەسیەتی (ئەردەشێر)ە بۆ شاپوور، هەروەها کتێبی ئەفسانە و حەکایەتی هەزار ئەفسانەی (هەزارو یەك شەوە)، هەزار داستان،

سەندوباد و چیرۆکی بارام چۆبین، ئەفسانەی گەشتوگوزار و ورچ و رێوی، جگە لەمانەش کتێبیتریش لە کۆتایی رۆژگاری ساسانی و سەرەتای ئیسلامدا وێنەیان هەبووە کە دەیانخەنە پاڵ سەردەمی ساسانییەکان و سەرەتای حکومەتەکەیان.

(ئاردا وێراف نامك) لە زەمینەی باوەڕێ مەزەبی و گەڕانەوە بۆ دۆزەخ و بەهەشت لە نێوان سەدەی سێیەم تاوەکو حەوتەمی کۆچی لەلایەن یەکێك لە موبیدەکانی زەردەشتەوە نووسراوە. لە رۆژگاری شاپووری یەکەمەوە ناوی (کەزیر) موبیدی موبیدەکان لە (ئێران)دا نەبراوە. ئەم کتێبە سەرچاوەی باوەڕو داستانی مەیخۆرییە، (ئارداوێراف) بەخەو لێکەوتوویی لە داستانەکە زیاتر تێگەیشتووە کە لایەنی مەزەبی تیادایە. (ماتیکان گجستك ئابایش)یش لە کتێبەکانی سەدەی سێیەمی کۆچییە بۆ سەلماندنی مەزەب و ئایینی زەردەشت.

یاقووتی حەمەوی: شیعر لە رۆژگاری ساسانییەکاندا یاقووتی حەمەوی بە گواستنەوەی لە سەرچاوەکانی پەرتووك و نووسینەکانی پێشوودا بەو جۆرە نووسیویە: ئێرانییەکان خاوەنی (5) زمان و دیالێکت بوون وەکو پەهلەوی و دری و فارسی و خوزی و سریانی، لە نێوان ئەو (5) زمانەشدا فارسی زمانی ئەدەب و فەلسەفە و حیکمەت و پەند و ئامۆژگاری و داستانی کۆشك و سروودە ئایینییەکان بووە، ئەم زمانەش شێوازێکی تایبەتی بە سوودی هەبووە.

زمانی فارسی ناوەند لە فارسی کۆنی پەهلەوی وەرگیراوە کە یەکێك لە شێوەزارەکان و زمانە کۆنەکانی بەشێکی ئێران کە دواتر بووەتە زمانی ئایین، لەم پەرتووکەدا فەسڵی (گاتاکان) پەیوەستە بە سروودە مەزەبییەکان کە لەسەر شێوەی شیعر و سروود هۆنراونەتەوە. لەراستیدا کۆنترینیان شیعری میدییە و وەزنی شیعری (گاتاکان)یش هاوشێوەی وەزنی شیعری گەلانیتر بوون. بەشێوەیەکی گشتی لێکۆڵینەوە لە ئەدەبیات و شیعر لە رۆژگاری ساسانییەکاندا لەناویانا بابەتی فەلسەفی و بیرکردنەوەکان لە ئایین تێکەڵ بوون، ئەوەش ئاشکرایە ئەدەبیات لەم سەردەمەدا تەواو چینایەتی بووە کە (3) ئامانجی سەرەکی بەدواوە بووە:

**ئەلف:** بەخشینی گەورەیی بە حکومەتی ساسانییەکان.

**بێ:** رووکردنە لێکدانەوەی بنەچەی زەردەشتی کە ئەدەبیاتی ئەو سەردەمە ئەو ئامانجەی بەدوای خۆیدا زووتر هێناوە، مۆزیقاش خزمەتی ئایینی زەردەشتی کردووە. سروودەکانی مەزەبی و شیعرەکانی لەم زەمینەیەدا هاوئاهەنگ بوون بە مۆسیقا و ئاوازی گیان بەخشین بە رۆح، بۆخۆی خوێندوویەتی و هێناویەتە روو، بیرکردنەوەی ئایینی و دەستوورەکانی مەزەبیش بە شێوەیەکی تایبەت بۆ کەمەندکێشکردنی خودی مرۆڤ بووەو تەڵقینی داداوە.

جیم: سێیەمین ئامانجی هونەر و ئەدەبیات و شیعر لە رۆژگاری ساسانیدا دڵخۆشکردن و لوتف بەخشین بووە بۆ ژیانی چینی ئەشراف و نەجیبزادەکان کە ئەدەبیات و مۆسیقا هۆکارێکە بۆیان، بە بێگومان زۆرینەی کۆمەڵگا لە مرۆڤی ئاسایی دروستبووە کە لە خۆشی ئەشراف بێبەشبووەو دەرگاکانی هونەر و فەرهەنگیش بە روویدا بەستراوبووە.


سەرچاوە

علی اکبر سرفراز، بهمن فیروز فندی

مجموعە دروست باستان شناسی و هنر

دوران تاریخی، چاپ اول 1373، لا360-370

# نووسین و زمان لە سەردەمی ئاشکانیدا

لە رۆژگتاری ئاشکانیدا زمانی یۆنانی یەکێك بووە لە زمانە بەربڵاوەکانی ناو کۆمەڵانی خەڵکی و پیاوانی پۆلیسی یۆنانیش بەو زمانە قسەیانکردووە. زمانی یۆنانی جگە لەوەی لەناو دانیشتووانی وڵاتەکەدا و پۆلیسی یۆنانی رەواجی هەبووە، پیاو ماقوڵان و ئەشراف و ناوچەکانی غەیری یۆنانیش بەکاریانهێناوە. ئەوەش نیشانەیە بۆ دیاریکردن و گەورەیی زمانەکە کە سوودیان لێدیوە، ئەو پیاو ماقووڵ و گەورانەش هەتاکو لە ئەدەبیاتیشدا پێی ئاشنا بوون. لەگەڵ ئەمەشدا زمانی پەهلەوی ئاشکانی ئەویش رەواجی هەبووەو زمانەکەش یەکێکە لە زمانەکانی مرۆڤی باکووری خۆرهەڵاتی ئێران و ئامادەیی هەبووە لە رۆژگاری حکوومەتی ئاشکانیداو تەواو بەکارهێنراوە. ئەوەی هەیە لە نووسین بەم زمانە واتە پارتی کۆن ئەلفبای ئارامی تیایدا بەکارهێنراوەو بەڵگەنامەکانی بازرگانیش لە بابل یان بە ئارامی نووسراون یاوەکو بە سریانی رێکخراون مرۆڤ نێوان دوو رووباریش بە زمانی میللی خۆیان قسەیانکردووە، بەڵام وردە وردە زمانی یۆنانیش رەواجی بڵاوبووەتەوە. ئەوەی لەبەرچاو دیارە لە سەدەی یەکەمی زایینییەوە زمانی یۆنانی لە رووی دراوەکانی پارتی نووسراوە نووسراوەکانی بێستوون و سەرپێڵی زەهاو کە هەردووکیان پەیوەستن بە (مەهردادی دووەم) نیشانیدەدەن کە گۆڕینی نووسینی یۆنانی بۆ ئاشکانی بەخێرایی ئەنجامی وەرگرتووە، بەڵام لەگەڵ ئەوانەشدا بە دڵگرانییەوە زانیاری و بەڵگەی نووسراوی تەواومان لەسەردەمی پارتەکاندا لەبەردەستدا نییە، بەڵام بەڵگەی بەدەستگەیشتوو لە کاری کنەو پشکنینی (نسا)دا نیشانەیەکە بۆ نووسینی زمانی پارتی کە ئەلفبای ئارامی سەرچاوەی سوود لێوەرگرتن بووەو بۆ ژمارەیەکی زۆریش بەکارهێنراوە بە مانا زمانەکە و هەتاکو رستەکانیش بە ئارامی نووسراون، بەڵام بە ئاریایی خوێندنەوەی بۆ کراوە. لە

پەرتووکە زانستی و مێژووییەکانیشدا نووسینی زمانی پارتەکان بە پەهلەوی ئاشکانی یان تەنیا بە پەهلەوی خوێنراوەتەوە کە پارتەکان بوون، بەلام هەندێك لە شارەکانی نێوان دوو رووبار هەروەکو لە نووسینی مێخی سوودیان دیوە، بۆ کاری ناوخۆش لە بەڕێوەبردنی وڵاتدا زمانی پارتی پلە پلە بەرەو پێشچووەو رەواجی لە بەشی باکووری خۆرئاوای ئێراندا پەیدا کردووە، چەرمە نووسراوەکەی هەورامانی کوردستانی باشوور ئەو بەڵگەیەی لێوەردەگیرێت. لەو بەڵگەنامانەش کە لە ئەورووپا دۆزراونەتەوە بە زمانی ناوبراو نووسراون، خوێندنەوەیان بە زمانی پارتەکان لەسەر ناوەڕۆکە مانەوییەکە بۆ کراوە کە لە تورکستانی چین دۆزراوەتەوە بە دەستمان گەیشتووە. بەبوونی ئەو نووسینە یۆنانییە دەرئەکەوێت ناتەنیا لە کۆتایی رۆژگاری پارتەکاندا بەردەوامی هەبووە بەڵکو تاوەکو سەرەتای فەرمانڕەوایەتی ساسانیش رەواجی هەبووەو نووسینەکانی سەرەتای ساسانیش بە (3) زمان پەهلەوی ئاشکانی و ساسانی و یۆنانی نووسراون.

لەوانەشە نووسینی یۆنانی یەکێك بووبێت لە زمانە رەسمییەکانی ئیمپڕاتۆریەتی ئاشکانی هەروەکو (ئاردوانی سێیەم) (12-38)ی زایینی نامەی خۆی بۆ پارێزگاری شووش بە زمانی یۆنانی نووسیوە بەپێی رێوڕەسمی سلوکییەکان. هەروەها ئەو چەرمە نووسراوانەش کە لە ئەورووپا دۆزرانەوەو بە سەدەی فەرمانڕەووایەتی ئاشکانییەکان پەیوەستن و بە زمانی یۆنانین هاوسانن بە مافی هێلینی کە لە سەرچاوە هاوشێوەکاندا بەکارهێنراون و رێکخراون. لەم وەسفەدا ئەو جۆرە فەرهەنگ و شارستانێتی یۆنانییەی وابەستە لە ئەنجامی شێوە کۆیلەدارێتی دەرکەوتووەو بە لاوازبوونی بووەتە سەرەتا بۆ دەرەبەگایەتی (فیودالیزم). لە سەردەمی ئاشکانیدا کە زمانی یۆنانی گرنگییەکی دەرکەوتووی بەخۆوە دیوە لە هەمانکاتیشدا زمانە میللییەکانیش هێزیان بۆ گەڕاوەتەوە، بەڵام ئەم زانستە کە دەرکەوت لە فەرهەنگ و نفووسدا و لە یەك کاتدا رۆشت و بڵاوبۆوە دوولایەنە بوو بە مانا عونسوورەکانی سریانی و ناخۆیی هەردووکیان لەو رۆشتنەیاندا چالاکانە هاوبەشیانکردووە.

بەو جۆرە فەرهەنگی ئایدیۆلۆجی لە دوو زەمینەی مەزەبی جیادا ئاشکرا دەبێت، یان بەر لەوانیش لە سەرچاوەی نفووسی ئایینی خۆرپەرستی لە یۆنان و ئەورووپا گفتوگۆی لەسەر کراوە، لە سەرچاوەی پارتییەکانیەوە گوتم لەم زەمانەدا

ئایین واته تاکه ئایینی دەوڵەتی بوونی نەبووە، و لە نێوان مەزەبە جیاجیاکانیشدا لە وڵاتی ئاشکانی (وڵاتێك کە گەلان و نەژادی جۆر بە جۆری تیادا ژیابێت) هەبووەو پەرستنی خوای هەتاویش بەناویترەوە رەزامەندی لەسەر دراوە.

ئایینی یۆنانی لە شارەکانی یۆناندا پەیکەری بە تەنکراوی خواکانی یۆنانیان وەکو (زەیۆس) و (ئاپینا) و (ئامزۆدایت) داناون، بەڵام لەم سەردەمەدا بەهۆی تێکەڵبوونی فەرهەنگەکانی ئێرانی و بابلی و یۆنانی خواکانی گەلان لەگەڵ یەکترا هاوشێوەیان هەبووە، یەکێك لەوانە کە ئاهۆرامزدایە بە (بێل) و (خۆر) و (شەمەش) و ئاناهیتا) لەگەڵ (عەشتار) چواندووە، لە ئارامگای ئانتیۆخۆسی یەکەم (زەیۆس) بە (ئاهۆرامزدا) و (ئاپولۆن) بە (میهر) و (بارام) لەگەڵ (هێراکلس) چوێنراون.

سەرچاوە

علی اکبر سرفراز، بهمن فیروز مندی

مجموعه دروس یاستان شناسی و هنر/ دوران تاریخی

ماد-هخامشی-اشکانی-ساسانی / چاپ اول 1373، لا307-308

# پەیامی زەردەشت ئەلف-ئاوێستا:

ئاوێستا پێکهاتووە لە کۆمەڵێك شەعایر و ئاداب و رسوم کە بیروباوەڕی گەلانی ئاری نەژادن و بۆ ئێران کۆچیانکردووەو (زەردەشت)یان بە پەیامبەری خۆیان داناوە.

بەپێی ئەو داستانەی کە هەیە (ویشتاسپ)ی زەردەشت دەستووری داوە ئامۆژگارییەکانی پەیامبەر کۆبکەنەوەو بەدووانە رێکیبخەن. ئەو کۆکراوەیە هەمان ئاوێستایە کە لە کۆندا بە (ئاپستاك) ناسراوە، یان ناوی دروستکراو ئەوی رەسەن بووە.

لە داستانە کۆنەکاندا هاتووە ئەو دوو دانەیە کە لە شوێنی جیاجیادا ئامادەکراون یەکێکیان لە دەوڵەتی (پەرسەپۆلیس) (تەختی جەمشید) پارێزراوەو ئەویتر لە گەنجینەی (شیزگان) لە (شاپیگان) کە موڵکی پادشا خۆی بووە.

فیردەوسی شوێنی پاراستنی ئاوێستای بردۆتەوە بۆ پەرستگای ئاگری (سەمەرقەند) و (ئاودێرافنامە)ش ناوی (ئەستەخر)ی هێناوە بۆ پارێزگاری لێکردنی. بەپێی ئەو داستانانە لە هێرشی ئەسکەندەر بۆ سەر ئێران و ئاگرتێبەردانی تەختی جەمشید ئەو دانە پارێزراوەی ئەویَ لەناوچووە، هەروەها دانەکەیتریش بەدەستی یۆنانییەکان چووە. (هەندێك سەرچاوە باس لەوە دەکەن کە یۆنانییەکان لەگەڵ خۆیان بردوویانە) شاگردانی (پڕۆدیکۆس)ی هاوڕێی (سوقرات) هەروەکو دەڵێن: دانەیەك لە ئامۆژگارییەکانی زەردەشت ماوە.

لە رۆژگاری ساسانییەکاندا (ئەردەشێری بابکان) کە خۆی (موغ)ێك بووە فەرمانی داوە ئامۆژگارییەکانی زەردەشت سەرلەنوێ کۆبکەنەوە، جێبەجێکردنی ئەو کارەشی داوەتە دەست (موبد) (موبدان) بۆ پوختەکردنی. ئاوێستای راستیش ناوی (ئاوێستاگ) بووە کە ئامادەکراوە.

جێنشینی ئەو (شاپووری یەکەم) کە بەو کارە هەستاوە دەستووری بە وەزیری خۆی (ئازریاد مهرئاسپند) داوە ئەویش کارەکەی بە ئەنجام گەیاندووەو لە (شیز) ئەم دانەیە دانراوە. بەهۆی هێرشی ئەعرابەکان جارێکیتر ئەم قەواڵانەش لەناوچوون.

لە سەردەمی مەئمون خەلیفەی عەباسی جارێکیتر (موبد)ێك بەناوی (ئازەرفرەنبوغ) لە چاخی (9)ی زاییندا بەشەکانی ئاوێستای کۆکردەوەو رێکیخستن بە زمانی پەهلەوی بەناوی دینکەرد.

(دارمستتر) دەنووسێ: (ئەردەشێری بابکان) (هێربد هێربدان)ی بەناوی تنسر لەخۆی نزیك کردەوە مۆڵەتی پێدا بەشەکانی ئاوێستا کۆبکاتەوە. لە نامەی (تنسر)دا بۆ پادشای (تبرستان) وا هاتووە کە ئاوێستای کۆن لەسەر پێشتی دوو هەزار مانگا نووسراوەتەوە.

نیبێرگ دەنووسێ: ئێرانییەکان پەنایان نەبردۆتە بەر پەرتووك و نووسراوەکان بەڵکو گەڕاونەتەوە بۆ ئاداب و رسومی گوێزراوە بەپێی دەستووری موبیدەکان و موغەکان و کاری مەزەبی خۆیان بەو شێوەیە ئەنجامداوە ئەمەش بەهۆی ئەوە بووە خوێندن و نووسین کەمتر لەو رۆژگارەدا دەرکەوتووە کە پەیوەستبووە بە رۆحانییەکان چونکە هەر ئەوان بەو هونەرە ئاشنابوون.

ئاوێستا لە سەردەمی ساسانییەکاندا رێکخرا بەهۆی ئەوەی زمانی ئاوێستایی وردە وردە لە نێوانەکەدا بڵاوبۆوە چونکە زمانی سەردەمەکە بووەو بە پەهلەوی بەناوی (زند) نووسراوەتەوە یان (ئازەئیتنی) کە مانای راپۆرتی کارو هەوڵی بابەتەکان دەگرێتەوە. لە ئەوروپادا بە هەڵە ناوی (زندر ئاوێستا)ی لێنراوە بەهۆی ئەوەی تەنیا کۆمەڵێك زانستە.

(ویکاندەر) لێکۆڵەری ئەڵمانی باوەڕی وایە (موغەکان) یان (موبیدەکان)ی کاهینی ئایینی زەردەشت لە باکووری خۆرئاوای ئێران خاوەنی نووسین بوون بەناوی (زند) کە لە بنەچەدا لەسەر پایەی باوەڕەکانی (زروانی) بیناکراوە لە بەرگێکی ناوچەییدا، لەکاتێکدا (هێربودەکان) یان کاهینەکانی باشووری ئێران پەرتووکی نووسراویان نەبووەو هەر لە سنگیاندا بناغەی ئەو پەروەردەکردنەیان هێشتۆتەوە (بە مانا دەماودەم هاتووەو لەبەریانکردووە) بەمەشیان وتووە (ئابستاك).

لە ململانێیەکی درێژخایەندا موغەکان وردە وردە دەسەڵاتیان بەسەر (هێربودەکان) زیاتر بووە، ئەوەش وایکردووە یەکێتییەك لەناویانا دروست ببێت لەسەر باوەڕێکی پتەو و باستر. لەو رۆژگارەدا داستانە لەبەرکراوەکانی ئاوێستا نووسراونەتەوە بەوەش (زند) کە جمکە نەبووە، (زند-ئاوێستا) هاتۆتە روو کە دواتر بەناوی ئاوێستا ناونراوەو لێیکۆڵراوەتەوە.

(نیبۆرگ) باوەڕی وایە ئەم ململانێیە بە دەرکەوتنی (مانی) پەیوەندی نزیکی دروستکردووە لەبەر ئەوەی نووسینی موغەکان پێشگۆیی کردووە بە دەرکەوتنی رزگارکەرێك یان (سوشیانت)ێك، (مانی)ش ئەوەی بە هەڵزانیوە بۆ گەیاندنی راستییەکانی لەو رووەوە.

لە رۆژگارێکدا کە زمانی پەهڵەوی جێنشینی دیالێکتی سەردەمەکە بووە ئاوێستای لای ئێرانییەکان قابلی زانین و تێگەیشتن نەبووە، بەڵکو موبیدەکان بە پەهلەوی ئەوەی پەروەستبووە بە ئاوێستاوە هەڵیانسووڕاندووەو پەراوێزیان بۆ داناوەو لێکدانەوەی ماناکانی بۆ کراوەو لێیتێگەیشتوون. بۆ یەکەمین جار بەهۆی (ئانکتیل دوپرون) ئەو لێکدانەوە پەهلەوییەی ئاوێستا گەیشتە ئەوروپا.

لە نەخشی رۆستەمدا خانوویەکی چوارگۆشەی شێوە لاکێشی هەیە بە خانووی زەردەشت ناودەبەن. ساڵی 1935-1939 لێژنەیەکی لێکۆڵینەوە لە دانشگای شیکاغۆ لەو ناوچەیەدا کنەو پکشنینەکانی ئەنجامداوەو دوو دانە ئاوێستان دۆزیوەتەوە کە یەکێکیان پەیوەستبووە بە سەردەمی شاپووری یەکەم (262ز) کە بەهۆی (کرتیر)ی (موبد)ی (موبیدەکان) و وەیزری چوارەمی پادشای ساسانی رێکخرابوو بە زمانەکانی (پارتی-ئێرانی) ناوەندی یۆنانی رێکخرابوون. لەم دانەیەدا ئەو خانووە چوارگۆشە لاکێشییە کە بە (بن خانك) ناوی براوە، لای (دینکرد) لە ئاوێستاد جارێکیتر (بن) بە مانای پایە و رەگوریشە دێ، بەو شێوەیە (بن خانك) کە ئەو خانووەیە بووەتە خانووی ئاوێستا. (بن خانك-ئاوێستاخانە) ئەم خانووە کە بەشێوەیەکی جیا خۆی نیشانداوە لە سەردەمی داریۆشدا دروستکراوە، کە لای هەندێك بە ئارامگای دادەنێن و هەندێکیتر بە پەرستگای ئاگرو کۆمەڵێکیتر بە شوێنی دانانی ئاوێستا راڤەی لێدەکەن.

(گلدانەر) و (ئاندرا) رایان وایە: (ئاوێستا) لە وشەی ئاوێستاك وەرگیراوە کە لە بنەچەدا (ئوپستاك)ەو (پازند)یش لێکدانەوەی (زند)ە. بەپێی ئەو نووسینانەی کە بۆ چاخی (3)ی زایینی دەگەڕێنەوە، لە میسر ساڵی 1930 بەدەستمان گەیشتووە زەردەشت ئامۆژگارییەکانی خۆی داوە بە شاگردەکانی بۆ ئەوەی لەبەری بکەن، تاوەکو دوای مردنی بیاننووسنەوەو رێکیانبخەن.

(ئۆپێرت) زانای ئەڵمانی باوەڕی وایە نووسینەکەی داریۆش، کە دەڵێ: من بەپێی (ئابستم) حکومەتم دروستکردووە، مەبەست لەمە، هەمان (ئوپساك)ە.

ئاوێستای کۆن لە 21 (نسك) واتە (بەش) پێکهاتووەو هەر (نسك)ێکیش بووەتە دستە کە بە (دستەگل) مانای لێکراوەتەوە.

(پورداود) (نسك)ی بە وشەی (نسکە) راڤەکردووە کە مانای نامە و پەرتووك دەگرێتەوە، (مەسعود)یش بە ئیلهام لە قورئانەوە ئەوەی بە سورەت ناوبردووە.

(دینکرد) بە نسکەکانی ئاوێستا ناوی بردوون و لێکدانەوەکەی بە گرنگ نەزانیووە.

نسکەکانی ئاوێستا کراون بە (3) بەشەوە: نسکەکانی (گاسائیل)، (هاتك مانسریك)، (داتیك) کە هەر یەکێك لەوانەش خاوەنی (7) نسك بوون.

یەسنەکان کە گرنگترین بەشن لە ئاوێستای کۆندا لە 72 (هات) یان (هائیتی) یان (فەسڵ) و (سورەت) دروستبوون. (یسن) بە مانای پەرستن و نیاز و نوێژ و جەژن دێت. ئەوەی لەناو ئەو (72) فەسڵەدا بە یەقین هەیە هەموویان رەسەنن و لێکۆڵەران لەسەر ئەوە کۆکن کە دەخرێنە پاڵ زەردەشت، لەوانە (16) (هات) کە ناسراون بە گاتاکان. (گات) بە زمانی ئاوێستای کۆن (گاپا)یەکە بە مانای سروود دێت، لە (سانسکریت)یشدا (گاتا) هەمان مانا دەبەخشێ و لە پەهلەویشدا (گاس)ە. بەجۆرێك کە من نووسیومە (یەسنا) پێکهاتووە لە هۆنراوەو پەخشان لەسەر شێوەی گوڵستانی سەعدی. ئەو گاتانەش کە هەن بەشێکیان یان هۆنراوەن کە لە (16) گاتاکانی (زەردەشت)ن و پێکهاتوون لە : (ئاهونودگاتا) کە خاوەنی (7) (هات)ە لە ژمارە (28-34)، (ئاشتود گاتا) لە (4) (هات) دروستبووە واتە (43-46)، (سپەنتمەند گاتا) کە هاتەکانی (47-50) و (هوخشتر گاتا)، کە هاتەکەی تەنیا (51)ە.

لە ئاوێستاد ئەو نامانەی: (ئاهون و ئیتی)، (ئوشت و ئیتی)، (سپنتامیئنیو)، (وهوخشتهر) کە بە دەستگەیشتوون و وشەی یەکەمی هەر گاتایەك وەکو (ئاهونود) وەربگرین ناوی (ئاهونە) و (ئیریە)ش نزای بەناوبانگی ئاوێستایە کە لە بەندی سیانزەهەم لە یەسنای 27 وەرگیراوە. بەشێك لە لێکۆڵەران (هێشتوایشت گاتا) یان (هات)ی 53 ناخەنە سەر ژمارەی گاتاکانی زەردەشت.

له نێوان هات هاى (34-43) هەشت فەسڵ هەیە کە فەسڵەکانى 35 تاوەکو 41 دەگرێتەوە کە 7 (هات) لەوانە یان (هپتنگ هائیتى) سروودن دەخوێنرێن. ئەم سروودانە نزیکترین نووسینن بە گاتاکان کە بە شێوەیەکى قەشەنگ نووسراون، بەڵام لاى من پەخشانن و هۆنراوە نین. (هات)ى 42 جارێکیتر کۆکراوەتەوەو رێکخراوەوم (7) فەسڵى ترى بۆ زیاد کراوە.

له ئاوێستاى دواییدا گاتاکان باس نەکراون، بەڵام جۆرێك لە ئاماژە هەیە کە بە باشى ئاشناى نووسین نەبوون هەروەها لێکدانەوە پەهلەوییەکەشى بە بەشى خۆیان داناوە ئەمەش لەگەڵ تێگەیشتنى راستى گاتاکاندا جودایە، یان دژە. بە هەمان شێوە ئەو گۆڕین و شیکردنەوانەى کە لەسەر پایەى ناوەڕۆکە پەهلەوییەکەى ئامادەکراوە، تەفسیرى (دار مستتر) گۆڕیویەتى و رەسەن نییە.

یەشتاکان دواى (گاتاکان) و (هپتنگ هائیتى) کۆنترین بەشى ئاوێستایە کە بە ژمارە بۆى دانراوە. (یەشت) و (یەسنا) لە رەگورەیشەیەکەوە هاتوون و (یەشتن) لە پەهلەویدا بە ماناى ستایشکردن دێت. (یشتر)یش ئەو کەسەى نوێژدەکات بە مانا نزا دەکات. هەندێك لە بەشەکانى (یەشتاکان) بە زمانێکە بۆ ئەو رۆژگارە دەگەڕێتەوە کە مرۆڤى هیندو ئێران جیانەبوونەتەوە بە مانا ئاداب و رسوم و بیروباوەڕى ئەو سەردەمە کاریگەرى لەسەریان هەبووە.

ئاوێستاى کۆن پێکهاتووە لە (5) بەش کۆنترینیان هەروەکو دەزانین (یەسنا)یە کە دواى (ویسپرد) یان (ویسپرتو) دێت. سێیەم (وندیداد)ە کە لە بنەچەدا (وى-دئو-داتا)یە بە مانا دژى دیوان و یاسایە، یان یاسا دژى دێوانە، چوارەم (یەشتاکانە، ناوەڕۆکەکانیان پێکهاتووە لە (ریتوال) بۆ خواپەرستى رۆژانە، پێنجەم خوردە ئاوێستایە، یان ئاوێستاى بچکۆڵەیە کە لە پەهلەویدا (خورتك ئاستاکە).

ئەدەبیاتیترى ئاوێستایى کە بە زمانى پەهلەوى و ئێرانى ناوەند دانراوە کە پێکهاتووە لە: (بندهشن) یان دروستکردنى گەردوون کە تێکەڵاوە بە باوەڕى مەزەبى دەربارەى سروشت و مێژوو و داستانەکانى لەدایکبوون کە چاخى (10)ى زایینى دانراوە.

ئایین (کرت)، یان کردە ئایین کە (ئەڵمانەکان دنکارت بەوە دەڵێن، یان شێوازى بیرکردنەوەیان وادەڵێ) کە لەوەوبەر دەربارەى ئەو باسە گوتراوەو تیایدا بە هەڵە کۆمەڵێك بیرو

یاسای زەردەشت ناسێنراون. ئەسڵی (دینکرد) لە سەردەمی ساسانییەکاندا ڕێکخراوە، بەڵام ئەوەی ئەمڕۆ لەبەردەستدایە لە چاخی (9)ی زاییندا ئامادەکراوە. نامەکانیتر کە هەن وەکو: (مینوخرد)، (بەهەشتی ئاقلان)، (پەندنامەی زەردەشت)، (دبستان) (قوتابخانەی سەرەتایی)، (خاگرات زریران)و.. بەپێی بۆچوونی دانەران ئەمانە پشتدەبەستن بە ئامۆژگارییەکانی زەردەشت، بەڵام لە راستیدا بەشەکانی گاتاکان هیچ کامێکیان لەسەر پایەی ئەدەبیاتی ئاوێستایی واتە ئامۆژگارییەکانی زەردەشت رێکنەخراون. (وندیداد) کە دەیخەنە پاڵ (خشا یارشا) بۆ بەر لە سەردەمی ئەو دەگەڕێتەوە، هەروەکو باوەڕیشیان وایە لە نووسینەکەی ناوبراودا ئاماژە هەیە بۆ یاسای دژی دێوان کە مەبەست هەمان (وندیداد)ە. ئەم کۆمەڵە پێکهاتووە لە یاساو دەستووری مەزەبی کە پێشتر ریشەی ئاریایی و ئایینی موغەکانی تیادا بووە کە دەتوانین بڵێین لەلایەن ئەوانەوە دانراوە.

(دینکرد) لە شوێنی پەرستگای ئاگردا دەرکەوتووە، کە کۆمەڵێك یاساو دەستووری مەزەبی ئایینی زەردەشتین کە بەشێوەیەکی کورتکراوە رووبەڕووی خەڵکی کراوەتەوە.

دارای کوڕی داریۆشی سێیەم فەرمانی داوە دوو نووسخە لە ئاوێستا و تەفسیرەکەی کە (زند)ە ئامادە بکەن، یەکێکیان لە گەنجینەی فەرمانڕەوایەتی و ئەویتر لە ئەرشیفی بپارێزرێ. بەڵام ئەم قەواڵانە بەدەست ئەسکەندەی لەناوچوون. (ولخش) پادشای ئاشکانی فەرمانی داوە نێردراو بە هەموو لایەکدا بڕۆن، هەر کەسە لە (زند) و (ئاوێستا) ئەوەی لایەتیی و رەسەنە، یان رێگایان نیشانبدەن بۆ کۆکردنەوەیان.

پادشای پادشاکان (ئەدەشێری کوڕی پاپك) سەرلەنوێ بە تەگبیر لەگەڵ (تنس)دا فەرمانیدا کە هەموو ئامۆژگارییە پەرت و بڵاوەکان بۆ دەربابهێنن. (تنسر) نوسخەیەکی تەواوی کۆکردەوەو رایگەیاند کە: (لێپرساوێتی و تەفسیر و دەربڕینی تەواوی ئامۆژگارییەکانی ئایینی (مزدا پەرستان) بە ئێمە دراوە بۆ تەواوکردن). بەو کارەی هیچ کەموکوڕییەك نەما لە زانستی تەواوی ئەم ئامۆژگاریانە. لە (ئارداوێرافنامەش)دا هەر بەو شێوەیە هاتووە: ئاوێستای پەهلەوی رێکخراو (تنس) و هەموو موبیدەکان و پێشەوایانی ئایینیش بەو هۆیەوە بانگهێشتی پایتەخکران کە لە ناویانا (7) موبدی خاوەن ئیمان و خواپەرستی فەرمانبەرو لێکۆڵەرەوە هەبوون. لەناو ئەوانەدا (موبد)ێکی گەنج هەبوو بەناوی (ئارداویراف) بەهۆی ئەوەی لەو هەڵبژاردنەدا

بەشی هەبوو بۆ ئەوەی جیهانی غەیب و دنیای بەرزی لەبیرچووی باشی زەردەشت و فریشتەکانی بەدوایانا بگەڕێت، بەم گەڕانەی دووبارە رووداوەکانی تۆمارکردەوە.

(ئارداویراف) دەنووسێ: (هەر وەکو مەراسیمی ئایین و نزا بۆ یەزدان و رۆحە پاکەکان و کارە چاکەکانی ئەهلی بەهەشتی نەزانن بۆ ئەوەی کە پێیبگەن، یان سوود لە ئەهریمەن و دیوان وەربگرن)!! ئارداویراف دوای بەکارهێنانی دەرمانی بێهۆشکەر خەوی لێدەکەوێت هەروەکو مردبێت، ئەم (7) رۆژ لەخەودا دەبێ و لەو ماوەیەدا رۆحی بە دنیای بەرز دەگات و راستییەکانی دیوە لەکاتی گەڕانەوەیدا بۆ دنیای هۆش هەموو ئەو شتانە دیویەتی بۆ ئاگری پەرستگای زەردەشتی دەگێڕێتەوە بۆ کۆکردنەوەو رێکخستنیان!! شەرحی میعراجی ئەم قارەمانە کە هەتاکو لێکۆڵەرانی زەردەشتیش ئەو بە پیرۆز دەژمێرن، خودی ئەم فەسڵە درێژەش نموونەی خەرافاتی کڵێسا و ئایینی دەربار نیشان دەدات. لە ئەدەبیاتی زەردەشتی لە نامەکان ئەوەی لەبەردەستدایە لە سەردەمی خەلیفەکانی عەباسیدا رێکخراون. ئێرانییەکان کەمێك یارمەتی عەباسیەکانیاندا تاوەکو خەلافەتی ئەمەوی لەناو بچێت بۆ ئەوەی خزمەت بەوان بکەن بۆ رێکخستنی کۆمەڵەی مەزەبیان. بەپێی قسەی لێکۆڵەران زۆرینەی نامەکان لە سەردەمی مەئمون (چاخی 9ی زایینی)دا رێکخراون. لە رێکخستنی نامەکاندا هیچ جۆرە زانیارییەکی ورد پەیوەست بێت بە شوێنی پەرستگای ئاگر نەهاتووە کە زۆرینەیان بە زمانی ئاوێستای کۆن بووە.

لەلایەکیتر ئەو نزایانەی لە پەرستگاکاندا کراون بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ ناوەڕۆکە رەسەنەکانیاندا یەکیان نەگرتۆتەوە، بەمانا زمانی تایبەت بە خۆیان بووە واتە ئەوەی خوێندویەتی لەگەڵ ناوەڕۆکەکەیدا جودایی هەبووە. لەمەدا گرنگ تێگەیشتنی وشەکان نەبووە بەڵکو وشەکان تەشریفاتی بوون کە پێویستبووە ئەنجام بدرێ بۆ ئەوەی رەزامەندی دیوانی لەسەر بێت و مرۆڤ پارێزراو بێت و داواکانی بەجێ بگەیەنرێ.

(دهالا) دەنووسێ: هەتاکو ماوەیەك ئەوانەی کاری ئاداب و شەعاییریان بەجێگەیاندووە هەستیان بەوە نەکردووە کە تەنیا وشەکانیان وتۆتەوە. سروود و پەیامەکانی مەزەبیش گۆڕدراون بە نزاو بەشێوەی جادوو و ویرد بەکارهێنراون. ئەمانە لەناو هەمان ئەو ئاوێستایەدان کە لە رێچکە دەرچووەو بەرەو ئەوروپا چووەو لێکۆڵینەوەکانی سەرەتای لێکۆڵەرانیش لەسەری بە هەڵە ئەنجامیانداوە.

سالّی 1745 گەنجێك بەناوی (ئانكتیل دوپرون) گەشتێكی بۆ هیندستان كردو لەگەڵ پارسییەكاندا بە یەكگەیشتن و چەند ساڵێك لەناویانا ژیانی بەسەربرد، سالّی 1771 نوسخەیەك لە تەفسیری پەهلەوی ئاوێستا كە لە هیندستان تەواویكردبوو لەگەڵ خۆیان بردبووی دوای گۆڕینی لە (3) بەرگدا لە پاریس بڵاوی كردەوە. ئەوروپییەكان كە دەربارەی زەردەشت و بیروباوەڕەكانی تێڕوانینیان هەبوو (سوغات دوپرون) لەو رووەوە دەنووسێ: (ولتر)ی فەرەنساوی بەناوبانگ سەروەختێك (زند-ئاوێستا)ی (ئانكتیل دوپرون)ی خوێندۆتەوەو سەرقالّی خوێندنەوەی لێكۆڵینەوەی زاناكان بووە وردە گەیشتۆتە ئەو راستییەی: ئەوەی بەناوی زەردەشت كاری لەسەركراوە بچووكترین پەیوەندی بە پەیامی زەردەشتەوە نەبووە، جگە لە بەشێكی كە ئاوێستایە و لەو سەرچاوەیەوە گاتاكانیان گۆڕیوەو لێكدانەوەی پەهلەویش شوێنی باوەڕ نییە.

(هینتس) لەو رووەوە دەنووسێ: ساڵانێكی زۆر ئەوروپاییەكان بەپێی قسەی (ولتر) گرنگیان بە زانستی ناو ئاوێستا نەداوە، بەڵام دوایی بەو ئەنجامە گەیشتوون كە لەناویا چەند پارچەیەكی بچكۆڵەی بە نرخ و گەوهەرێكی درەوشاوە هەیە و دەبینرێ).

ئەو دەنووسێ: (یەسنا) لە بنەچەدا (721) فەسڵ بووە، بەڵام لەوانە (16) فەسڵیان رووناكی تایبەتی خۆیان هەیە كە بە گاتاكان بەناوبانگن. (هینتس) ئەو (16) بەشە بە (نرخترین میراتی زەردەشتی ناوازەی جیهانی دادەنێت)، ئەو باوەڕی وایە كە ئەو كورتكراوانەی ناو ئاوێستا بە مانا (گاتاكان) خاوەنی رەسەنایەتییەكی تایبەتن و بە بەراوردكردنیان لەگەڵ هۆنراوەدا سەرنجڕاكێشن و هاوشێوەن. پاشماوەی ئاوێستاش ئەوەی لە ماوەی دوو هەزار ساڵدا بەر لەوانە رێكخراون ئەو جۆرە هونەرەیان تیادا نییە).

**ب. ئوسولّی پەیامی زەردەشت:**

حاڵەتێك كە گاتاكان بە زۆری دیاریانكردووە بۆ راستی گەیاندنی بیری زەردەشتە، بۆ ئەمەش جگە لە گاتاكان سەرچاوەیتر نییە كە شوێنی باوەڕپێكردن بێت، هەروەها بڵاوكردنەوەی پەیامەكەشی زمانی گاتاكان رێكیخستووە.

### 1- خوا لە گاتاکاندا:

ئەوەی بۆ شوێن و سەردەمی زەردەشت سەلمێنەرەو تیایدا دەرکەوتووە ئەوەیە کە (نیا) پەرستی و ستایشی دیاردە دەرکەوتووەکان و توخمە جیاجیاکانی سروشت و باوەڕهێنان بە خوای زۆربوونیان هەبووە.

لە لێکۆڵینەوەکاندا دەرکەوتووە کە تاوەکو بەر لە دروستبوونی شارو دەوڵەتی عەشایەری خێڵەکان هەریەکە و خوایەك یان زیاتریان هەبووە کە پارێزگاری و بەرگری لێکردوون، بەڵام لە سەردەمی دەوڵەتی شارەکاندا واتە بەرەبەیانی بنەماڵەکان جارێکیتر دەوڵەتی ئەو شارەو مرۆڤەکانی وا بەستەی کۆمەڵگای پەرستگابوون کە هێشتا دەوڵەتی گەورە دروست نەبوون واتە هەتاکو ئەو کاتەش فرەخوایەتی هەبووە. نموونەش بۆ ئەمە ئانلیل سەردەمێك کە خوای زەوی گەورە بووە دەسەڵاتی بەسەر کۆمەڵگایەکی گەورەدا هەبووە بەشێوەی وڵاتێك. گەڕانەوەیەکیتر بۆ ئەو دەسەڵاتە (یەهوە) کە خوای جولەکەیە پەیوەستبووە بەو عەشایەرانەوە یان سەرەتا بەشێوەی پارێزگاری لە دوانزە خێڵی جولەکە پەرستوویانە. جیاوازییەك کە ئەم گەلە لە گەلانیتر جیادەکاتەوە ئەوەیە، یەکەم: باوەڕیان بە تاکە خوایەك هەبووە، دووەم: بت، یان پەیکەریان دروست نەکردووە چونکە باوەڕیان بە خوایەك هەبووە کە دروستکەری مرۆڤە و پارێزگاری لێکردووە. ئەم دیاردەیەش لە کۆمەڵگای جولەکەدا بە تەواوبوونی چەند چاخێك ئەوسا شێوەی تەواوی خۆی وەرگرتووە. لە مێژووی ئایینەکانی جیهانیشدا گەورەترین گۆڕانکاری کە روویداوە ئەوەیە تیایدا زەردەشت کە دروستکەری زانستە، باوەڕی بە خوای تەنیا هەبووە ئەمەش لە کاتێکدا بووە وابەستە بووە بە گەل و عەشیرەتەوە کە تیایدا گەل یەکتاپەرست نەبووەو پەرستگاو شوێنی جیاجیای هەبووە.

ئەگەر زەردەشت ئەو تێڕوانینەی خۆی لە چاخی دەسەڵاتی فەرمانڕەوایەتی هاخامەنشییەکاندا بڵاوکردبێتەوە مانای وایە شاکارێکی گەورەی بۆ کۆمەڵگا داناوە ئەمەش لە کاتێکدا بووە کە گەلانی جیاجیا لەناو ئەو ئیمپڕاتۆریەتە گەورەیدا لەژێر سەرکردایەتی پێشەوایەکدا هەبوون، دیارە بیری گەورەی زەردەشت ئامادەی ئەو نوێگەری و رەزامەندییە بووە کە هێناویەتی.

ئەوەی لەمەدا سەرنجڕاکێشە ئەوەیە قەومی جولەکە لە رۆژگارێکدا کە دەوڵەتی دامەزراندووەو وڵاتی هەبووە، بەڵام (یەهوە)ی خوا هەتاکو ئێستا وابەستەیە بە خێڵەکانی

جولەکەوە کە دەوارنشین بوون و بارەگایان هەبووەو لە شەڕەکانیشدا سوپا بەردەوام جولاوەو توانو دەسەڵاتی هەبووە، هەتاکو لە رۆژگاری فەرمانڕەوایەتی (سلێمان)یشدا پەرستگایان بۆ خوا هەبووەو خانوویان بۆ دروستکردووە کە پاشماوەکەی لە فەلەستین ماوە. دوای ئازادبوونی جولەکە بەهۆی کۆرشی دووەم یەکەم کارێك کە پێی هەستاون دووبارە دروستکردنەوەی پەرستگای (یەهوە) بووە. بەمانا لە دەرکەوتنی ئیمپڕاتۆریەتە گەورەکاندا گەلی جولەکە کە جارێکیتر بیری لە خوای قەومی و پەرستگای خۆی کردۆتەوە ئەمەش مانای بیرکردنەوەی بەردەوام دەدات. کۆششی من بە وردی بۆ دانانی رۆژگارو شوێنی زەردەشت بۆ پەیبردنە بەگرنگی پەیامی یەکتاپەرستی ئەو کە هیچ هۆکارێکی دەرەکی نەبووە بۆ باوەڕهێنان بە یەك خوا لە سەردەمێکدا کە باوەڕ بە خوایەکی دروستکەری بێماڵ و شوێن قەومێك یان (گرووپێك)ی تایبەت پێوەی وابەستە نەبوویێت لە غەیری ئەو ئاینە نەبووە شوێنی رازیکردن بوویێت، کە تیایدا زەردەشت پەیامی یەکتاپەرستی خۆی ئاشکرا کردبێت.

ئەنجیل لە دڵی ئیمپڕاتۆریەتی گەورەی (رۆم)دا و لە کەناری یەکتاپەرستی جولەکەدا جارێکیتر لە عەرشی خوا لە ئاسماندا قسەی ئاسایی خۆی دەکات بەوەی باوکی لەو رۆخەدا وەستاوەو خواش لەناو یەشم و یاقووتدا درەوشاوەتەوەو لە چواردەوری 24 پیر لەسەر تەختەکانیان دانیشتوون و تاجیان لەسەر ناوەو حەوت مەشخەڵیش کە نیشانەی حەوت رۆحی خوا لە بەردەمیانایە، ئەوسا قسە لەگەڵ دوانزە خێڵی جولەکە دەکەن بۆ وەرگرتنی پێشەوایەتی نەژادیان کە تیایدا سەرکەوتوون.

لەوەوبەر ئامادەمدا کە بە هەڵە زەردەشت بە پەیامبەر و ئاهورامزداش بە خوای ئێرانی ناونراوە. یەکەمین سروودی (گاتاکان) (هات)ی (28)، بەندی 1 و 2 وە کە بەناوی خوا دەستپێکردووە، لەمەدا ئەمەمان پێگەیشتووە:

1- بەر لە هەموو شتێك ئەو دانای گەورەیە شوێنی بەباشی بەهەشتە، تۆ دەستەکانت بەرزبکەوەو کرنۆش بەرەو داوای بەختی چاکت بۆ دەکەم بۆ ئەوەی بە پەروەردگار شادبیت، تیشکی راستی و دروستی بۆ گرێتەوەو زیرەك و دانا بی و ویژدانت پام و رەوان بی کە بەوە دڵخۆشم.

2- ئەی هەست بەخشی دانای گەورە (ئاهۆرامزدا) هەتاکو بەبیری پاك و دڵی رۆشنی تۆ نزیکبم، بە دیدارت شاد ئەبم. پەروەردگار پارداشتی کە تەنیا تیشکی

راستییە بەدەستی دەهێنم. بۆ خاوەن باوەڕانیش خۆشبەختی ئامادە دەکەی بۆ هەردوو دنیا مادی و مەعنەوی کە ئێمە هیواخوازین دەیسازێنی.

**پرۆفیسۆر (شوشتری) بە زمانێکیتر گۆڕیویەتی کە بەم شێوەیەیە:**

1- ئێستا ستایشی ئەو دەکەم، نوێژی بۆ دەکەم بەو دەستانەم کە بەرزیان دەکەمەوە بۆ هێنانی تەواوی خۆشییە بە دڵێکی پاك. ئەو (مزدا) بۆ یەکەمجار بەهۆی کارەکانمەوە کە ئیلهام گرەو خۆراکمە (من نزا دەکەم) بۆ هەمووان نزا دەکەم بۆ زیرەکی داوا دەکەم بۆ ئەوەی بتوانم بەم ڕێگایە دڵی دایکی دنیا خۆش بکەم.

2- من بەڕاستی لە ئاهۆرامزدا داوا دەکەم نزیك خۆییم بکاتەوە کە بەمن هەردوو دنیا ببەخشێت.

بەختیاری بۆ لاشەیەکە (لەم ژیانەدا) و ئەوەی لە ژیانی ئایندە بەهۆی خۆراك کە دێت، تۆ، کە ڕێگا نیشاندەرمبی، ئیمان و پەروەردەم لە دنیادا ڕۆشن دەبێت.

بەر لەوەی رووبکەینە ئەو سووردانە بە چەند خالێك ئاماژە دەدەم. لە سەرتاسەری بەشەکانی دوایی لە تەرجومەکانی فارسی گاتاکان لە گاتاکانی ئازەرگشەسب، شوشتری و هەندێ لە سەرچاوەکان پورداود سوودیان هەیە کە پێویستمانن. تەرجومەی ئازەرگشەسب بەر لە گۆڕینەکانیتری ئەمڕۆیە کە دەتوانیت بڵێی ئەگە زەردەشت ئەمڕۆ پەیامی خۆی بەیان بکردایە هەر ئەوەی وتووە. لە هەر بەندێکیدا ئازەرگشەسب کە لەوەوبەری گۆڕیویە سوودی لە گۆڕینی وشە بە وشە وەرنەگرتووە بەڵکو تەرجومەی ئازادی کردووەو پێکهێناوە. ئەوکاتەش تەرجومەی ئازاد و تەرجومەی وشە بە وشە لەبەرچاوی ئەو مانای جیاوازی هەر نەبووە، ئەگەر گۆڕینی ئازادم بەکارنەهێنایە لە گۆڕینی وشە بە وشە سوودم دەبینی.

گاتاکان بە زمان و شێوەیەك نووسراون واتە بە شێوازێکی وشەیی هەروەکو کارێکیان بەجێگەیاندبێت کە مرۆڤ بە لە 3500 ساڵ لە قالبێکی شیعریدا بەیانیان کردووە. ئەم سروودانە بۆ زانین و تێگەیشتنی مرۆڤی ئەمڕۆن بێ ئەوەی تەرجومە رتوش کراوە کە زانستە راستییەکەی لە دەستدابێت. ئازەرگشەسب ئەم کارەی مامۆستایانە ئەنجامداوە. بە هەمان شێوە مسوڵمانەکان لە تەرجومە شەرحکردنی قورئاندا پەییان پێبردووە کە زمانی ئەمڕۆ و تێگەیشتی ئەمڕۆیان بەکارهێناوە، بێ ئەوەی مانا رەسەنەکەی لە گۆڕینە ئاساییەکەی جودابێت.

له تەرجومە و تەفسیری گاتاکاندا کە نیشانەیەکی بچووکە لە کاروانی تێگەیشتنی مرۆڤدا کە قابلی تێگەیشتنە، مرۆڤی ئەمڕۆ ئامادەی دەکاو هەستی پێدەکات.

له تەرجومەکانی رۆژئاوادا زۆرینەی وشەکان کە بەکاریان هێناون زیاتر ساکارن کە لەسەر زمانەوە دەیانگێڕنەوەو بەزۆری لە رستەی پچڕپچڕ و دابڕاودا بەکاریان دەهێنن. لە بنەچەدا شیعر بەتایبەتی هۆنراوەکانی فارسی، چوختەکەی خەیاڵ و لە غزەو ئەوەی بەکارێك هەڵدەستێت بە پەخشان دەیگێڕێتەوەو لە شەرح و پێناسەی پێشووتری سوودی بینیووە. لێکۆڵەرانی خۆرئاواش پێشەکی پەنا دەبەنە بەر ناوەڕۆك و لەو رووەوە رێگا بەخۆیان دەدەن کە ئەگەر توێکاری لەناو تەرجومەکەدا بە زمان و دەوروبەرەکە ئاشنابێت یان کەمتریش ئاشنا بوویێت ئەنجامیان دەستگیر دەبێ و نیشانە کەمێك دەپێکن. ئەو سروودانە بڕیاری سیاسیان نییە کە هەر وشەیەك پاش و پێش ببینرێت لەوانەیە بە یەککگەیشتنی کۆمەڵایەتی بن. لە سەرووی ئەوەشەوە لە زمانەکەدا زیاتر کۆنتری و ساکاری گاتاکان هەتاکو ئێستاش لە زمانەکان و زاراوەکاندا رووی گەورەیی تەواوی ئەمڕۆن، و لەوانەیە وشەیەك چەندین مانا ببەخشێت، بەڵام موتەرجیم ئەو زاراوەو مانایانە هەڵدەبژێرێت کە لە ناوەڕۆکدا هاو واتای گشتی گاتاکان و پەیامی زەردەشتن. لێکۆڵەرانی خۆرئاوا لە تەرجومەی پورداوددا لە یەکچوون دەبینن تاوەکو تەرجومەکانی ئازەرگشەسب و دکتۆر پوروالاو شوشتری. تەرجومەی ئازەرگشەسب کە هەی نوێتر و رەوانترو مەقبولترە.

له تەرجومەی بەندەکانی باڵادا بەجۆرێك کە دەبینرێن ئازەرگەشەسب بە پێشەوانەی شوشترییە و وشە رەسەنەکانی گاتاکانی بەکارهێناوە وەکو (هومنە) و (ئاشاو).. کە ماناو لێکدانەوەی بۆ کردوون کە بیری پاك و عەقڵی پاك راستی و دروستی هەستی بەخش و دانای گەورەو.. بەهرەی دەستکەوتووەو بەو کارەشی رستەکانی بۆ خوێندنەوە باشترن بۆ تێگەیشتن رەوانترن. لە بەشەکانی دواییدا ئەم زاراوانەی پێشوو دەخەینەڕوو.

**بەڵام زەردەشت لەبارەی خواوە:**

یەکەم: لە سەرتاسەری گاتاکاندا رووی ئاخاوتن هەموو لە مرۆڤە و تەواوی پەیڕەوانی راستی و هەمان پەیڕەوانی درۆ کە سەرچاوەی بڕیارن. تیایاندا قسە نە لەسەر ئاریاکانە و نە ئاماژەش بە ئێرانییەکان دراوە واتە ئاژماژە بۆ هیچ گرووپێکی قەومی تایبەت نییە کە

خاوەنی دەسەڵات بوو بێت. پەیامی (زەردەشت)یش بۆ گشتە و (ئاهۆرامزدا)ش خوای هەموو دنیاو مرۆڤە. (ئەوەی سەرنجڕاکێشە و بۆ قەمی ویشتاسپە گوتراوە رازی بوونی لەسەر نییە ئاماژەشی پێنەدراوە).

زەردەشت لەبارەی کۆنی گاتاکانەوە وەکو خاوەن باوەڕێك ئەوەی دیاریکردووەو وەکو ئیمانداریٚکیش ئامۆژگاری داوە. ئەو تەنیا لە سایەی کارەکانییەوە کە پشتبەستە بەڕاستی و دروستی توانیوویەتی خوا دڵخۆش بکات بۆ کاری چاکەو بیری پاك کە جوانترین ئامرازن بۆ نزیك بوونەوە لە خوا. هەروەکو دەڵێ: تەنیا تیشکی تۆیە کە راستەو مرۆڤ دەتوانێت دەستی بگاتە بەختیاری و پاداشتی دنیایی و دوایی کە پێوەی بەندن. یان ئەوەی لە یەکەمین هەنگاودا دراوە لە بەرتیل و دیاری و شەعاییر و تەشریفات و نوێژکردن لەبەر هۆی نیازکردن بوونەتە هۆکاری دڵخۆشکردنی خواکان و کۆمەڵگا کە بەر کەنارکراون.

(ئاهورە) ئاماژەی بەجۆرێك پێدراوە کە لە (ئاسوورە)وە وەرگیراوە، هەتاکو لە ئەدەبیاتی کۆنی (ویدا)یشدا بینیم کە (ئاسوورە) ناوێکی موتڵەقە و مانای خاوەنی رۆحانی گشتییە نەوەك بۆ لاشەیەکە هەیە و گیانی دەبەخشێت کە ماناکەیم لێکداوەتەوە.

(مزدا)ش لە دوو وشە پێکهاتووە، (مز) بە مانای گەورە دێ کە لە فارسیدا لە (مس) و (مە) دروستبووە کە بە مانای (زانستی) یان بەخشندە دێ بەوەی هەیە و دروستبووە، کە سەرئەنجام (مزدا) مانای گەورە یان خوای گەورە دەبەخشێت. بەم پێشەکییە دەتوانین بڵێین: ئاهۆرامزدا گەورەیە و بوونی هەیە و بە دانای گەورە بەرچڤکراوە. لەو شێوەیەدا ئەوە دەبینم ئەو خوایەی کە هەیە، چۆن دانای گەورەیە؟ لای مرۆڤی رۆژگاری زەردەشت خواکان لە شێوەی مرۆڤدا چوێنراون، بەڵام بە توانای جیاواز. (ئیندرا) کە خوای کڵپەیە پەیڕەوانی شەرابی سۆما دەخۆنەوە بەشێوەی قەدەح قەدەح یان لە شێوەی پەیکەری مرۆڤێکی (غۆڵ) دایە و ئەو کارەی پێسپێردراوە. (میترا) خاوەنی چاوە، بەڵام وەکو مرۆڤ نا بەڵکو خاوەنی هەزار دانەیە. ئەو لە ئەسپ تیژترەو سواری دەبێ، شێوە با لە ئاسماندا دەڕوات... کە لە دەرکەوتووەکانی جیهانە و توانای جیاجیا فەرمانڕەوایەتی دەکەن کە هەریەکە و خاوەنی پایەی بەرزی تایبەتی خۆیەتی و سنووریان دیاریکراوە.

یەکێکیان بۆ (با) و ئەویتر بۆ (ئاو) و رووناکیش بۆ ئاگر.. ئەمانە فەرمان دەرئەکەن و مرۆڤی لاواز و بێدەسەڵاتیش لە چنگی هەموو ئەو خوایانە کە گرفتیاریانە و بەرهەڵستیان

دەكات بە ڕێگایەك بۆ لای خۆی ڕایاندەكێشیٚ ئەوەش بە نیاز و بەرتیل پێشكەشكردن و قوربانی دەبیٚ تاوەكو لە تووڕە بوونیان ڕزگاریان ببیٚ و دڵی خواكان بە خۆشەویستی و خۆشی پڕ بكاو بۆ لای خۆی ڕایانكێشێت، بەڵام دروستكەری گیتی لە پەیامی زەردەشتدا پێویستی بە پۆشاكی لەش هەیە و لە كەنارەوە حەزی بە سەركەوتنە ەو داواكە مرۆڤییە. ئەو لە هەموو شوێنێكدا هەیە لەكاتێكدا بیٚ شوێنەو ئەزەلییە و چۆن دڵئەمین دەبیٚ كە خۆی هەموو دنیا بێت، ئەوە ئاهۆرامزدای گەورەی دانایە كە هەیە و بەخشندەیە و لاشە و گیانە.

بەر لە لێكۆڵینەوە لەسەر گاتاكان دەمەویٚ ببینم لێكۆڵەران لەو ڕووەوە چیدەڵێن: (لۆمل) باوەڕیٚ وایە (ئاهۆرامزدا) لە ڕاستیدا خوای بێناوەو پەیوەستە بە چۆنێتی شێوەی گەوهەری كەسایەتییەكەی كە ناوی لێنراوە نەوەك ناوێكی مرۆڤی بێت. (مزدا) بە مانای دانایە و مزداپەرستیش بە مانای ستایشی دانایە. ئەو دەنووسیٚ: (كەسایەتی خواكان شێوەی تەواوی مرۆڤن و بە تەندەكرێن، زەردەشتیش بە گشتی ڕاستی وتووە).

(بارتولۆمە) دەنووسیٚ: (نوێكردنەوەی بنەمای ئایینی زەردەشت كە هێناویەتی بۆ ئەو شویٚ،ەی كە خوا زۆرەكان تیایدا بوون بە یەك خوای دانا، یان ئاهۆرامزدا بووەتە جێنشینی دروستكراویان).

(جاكسۆن) جارێكیتر ئاهۆرامزدای بەدانای دڵخۆش مانا لێكداوەتەوەو باوەڕی وایە كە (ڕمزدا) شێوەی وشەی (مدها)یە لە ویداكاندا كە بە مانای توانی ڕۆحانی و تێگەیشتن و عەقڵە).

(مۆلتۆن) باوەڕی وایە كە (ئاسورا)ی دانا چەند چاخێك بەر لە زەردەشت پەرستوویانە و خوای ئاریاكان بووەو ئاهورامزداش لەناو عەشایەرەكاندا شێوەی خۆی وەرگرتووە. ئاسوورەش خوای قەبیلە بووەو بە گەورەی خواكان ژمێردراوە. زەردەشت ئەو فرە خوایەتییەی (پولی تیئسم) لەناوبردو ئاهورای لە جێگای (ئاسورا) دانا كە تەنیا دروستكەر و خوای گەورە نەبوو كە بە تەنیا حكومەت دابمەزرێنێت (هەمان شێوە محەمەد ئەڵڵا كە ناوی یەكیٚ بوو لە خواكانی ئەعرابی كۆچەری پێشوازی لێكردو بت و خواكانیتری بە پووچ دانا). ئەو دەنووسیٚ: (ئەم نموونە بەرزە كە خواو ڕاستی تیایدا یەكن بەرەوپێشچوونێكی گشتی بووە لە كۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا كە یەكەمین جار زەردەشت بە كردەوە كردوویە).

پرۆفیسۆر (چیترجی)، مامۆستای هیندی باوەڕی وایە كە (ئاسوورە)ی (مدە)ی ڕێگویدا هەمان ئاهورەی مزدایە. (ئاسوورە) هێمایە و جارێكیتر پێشەوایە و هەتاكو (شێوا) بەناوی

ئەو ماوە یەك ناونراوە لە هیند سەرچاوەی نژاکردن بووەو لە نژا جیاجیاکاندا و لە رێگویدای هەشتەمدا یادی کراوەتەوەو هەتاکو (شێوا)، ناوی (مدە)ی لێنراوە. لە نژاکانی رێگویدای یەکەمدا جارێکیتر (ویشنو) ناوی (مدە)ی بۆ خۆی بردووە. پرۆفیسۆر (بهاگواندا)، مامۆستای سانسکریت جارێکیتر پشتگیری لە تیۆری بالاْکردووەو نووسیویە: لە رێگویدای شەشەم سوکتای هەشتەم بەندی 24 ئەمە گەیشتووە کە (کریشنا) و (دیگران) لە جوملەی خواکان نموونەی (مدە) کە هەبوون.

کاشیاب، مامۆستای هیندی باوەڕی وایە (مزدا) لە وشەی (مهد) یان (مهت)ی ویدایی وەرگیراوە کە (ئاگنی) جارێکیتر بە (ئان) ناوی براوە. (ئاوسرا مهت) لە (رێگویدا) بە زۆری (ئامدە) و ناوی (ئیندرا) و (دیگر)ی خواکانە.

**(هینتس) بۆ (ئاهورامزدا) زاراوەی دڵخۆشی بۆ هەڵبژاردووە.**

(فیلیسن شالە) باوەڕێ وایە کە ئاهۆرامزدا هەمان (وارۆنا)ی خوای گەورەی ئاریاکانە، بەلاْم ئەوەی سەرنجڕاکێشە کە خودی ناوبراو لە شوێنیتر ئەو تیۆرە دەداتە دواوەو رەزامەندە کە (وارۆنا) لە (ئاوێستا)دا بە عەفریتی شەهواتی گۆڕاوە کە دەنوسێ: ((هەتاکو (وارۆنا) لە ئێراندا بە (وارنە)ی دێوی شەهوانی کاری پڕ هێز ناوی براوەو (ئیندراش) بە ناوی ئاندرای شەیتانی ترسناك ناوی گرتووە)).

(شدر) دەنووسێ: (زەردەشت هەموو ئەو خوایانە کە ناوی (ئاسوورە)یان هەیە گۆڕیوونی بۆ ناوی (ئاهورە). ئەو خوایانە لە بەرامبەردا خوی جەنگاوەری کۆنن کە لە سروشتەوە دروستبوون، هەتاکو لە رۆژگاری هیندو جەرمەنیدا ناوی (دوە) بە مانای ئاسمانی هەبووەو بڕیاردەر بووە).

هێرزفێڵد باوەڕی وایە کە زەردەشت تەواوی خواکانی کۆنی وەکو (میترا) و (ورترغنە) یان (بهرام) و (ئاناهیتا) و (وارۆنە) و.. کە بەرامبەر (ئاهۆرامزدا) بڕیاردەربوون بە (دێو) گۆڕیوونی بە سنوورێك کە خوای کفر و بت پەرست نەفرەت لێکراو دایناون کە هەتاکو ناوی هیچ کام لەوانەی نەهێناوەو نازناوی گشتی دێوی بۆ داناون.

(رودلف) دەنووسێ: بە زۆری وتوویە کە خوای زەردەشت لەوەوبەر لەناو ئاریاکاندا پەرستوویانە، بەلاْم هیچ کەس تاوەکو ئێستا ئەو داوایەی جێگیر نەکردووەو نەیتوانیووە بگاتە

ئەوەی کە ئەو خوایە زەردەشتە. پرۆفیسۆر (فریدریش ویلهام) و پرۆفیسۆر (ئامبری)، دوو مامۆستای هیندناس باوەڕیان وایە کە وشەی (ئاسوورا) سەرەتا ناوی گشت خوایانی هیندی بووەو، بەڵام دوایی بەهۆی جیابوونەی مەزەب لە هیندو ئێراندا وردە وردە لە هیند شێوە دژی خواکان وەرگرتووەو (ئاهورا)ش لە هەمان وشە وەرگیراوە. (ئاسوورە) لە وشەی ئاسۆی (سانسکریت)ەوە هاتووە بە مانای رەوان دێ و (ئاسوورا)ش مانی رەوان بەخشین دەدات.

ویلی دیورانت باوەڕی وایە کە وشەی خوا لە ئایینە جیاوازەکاندا مانای ئاسمان لەخۆی دەگرێت. مەغۆلەکان بەخوای سەرەەو (تەنگی) یان ئاسمانیان وتووە، و لە چین (تی) کە هەمان ئاسمانی دەگرێتەوەو لە هیند ویدایی دیائوس، و لە یۆنان زەیۆس، کە ناوی ئاسمانە، و لە ئێران جارێکیتر (ئاهورا) لە وشەی (ئازورا)وە هاتووە کە بە مانای ئاسمان دێ و هەروەها لە زمانی ئینگلیزدا هیۆن و لە ئەڵمانیشدا (هیمل) یان ئاسمان مانای خوا دەدات.

(دوش گیمن) پشتبەست بە رای (ناوادیا)ی لێکۆڵەری هیندی بۆ ئەوە دەچێت (ئەگەر ئاهۆرامزدا بەر لە زەردەشت لە ئێران پەرستبێتیان پێویست بوو وەکو خواکانی ویدایی لە ستایشی ئەودا بۆ جارێك لە سروودەکانی (یشت)دا بەشێوەی (میترا) و (ئاناهیتا) و تیشتریاو.. ناوی بهاتایە. ئەم راستییە کە لە یەشتەکاندا بوونی نییە بەڵگەیەکی براوەیە کە خوایەك بەناوی ئاهۆرامزدا یان ئاهۆراو مزدا بە گوێی زەردەشت لەوەویەر نەکەوتووە).

ئەمە بوو پوختەی دەرخستنی تێڕوانینی لێکۆڵەران. کە ئەم تێڕوانینانە سەرنجڕاکێشن و زەردەشت بەهرەی خۆی لە باوەڕەکانی مەزەبی کۆمەڵگای ئاریایی وەرگرتووە. بەشێك لە توێژەران وا بۆی دەچن کە تەنیا ناوی ئاهۆرامزدا وەرنەگیراەو، بەڵکو خودای ئەو لە (وارۆنا)دا بە تەن کراوە کە گەورەی خواکانی ئاریایی بووەو (ئامشە ئاپسندان)یش هاوشێوەی (ئادیتی) ویداییە.

(لۆمل) داوای شیکردنەوەو لێکۆڵینەوەی ئەو تیۆرەی باسکراوە باوەڕی وایە لە نێوان (وارۆنا) و (ئادیتی) (رێگویدا) و (ئاهۆرامزدا) و (ئامشەئاسپندان)ی گاتاکان هیچ لە یەکچوونێك نییە (دەربارەی ئامشە ئاسپندان لە فەسڵی هاتوو باسێك هەیە) و بە شێوەیە ئاهۆرامزدا ئەسڵی و رەسەنەو زادەی بیری زەردەشت خۆیەتی و لە ریشەی هندو ئێرانی وەرنەگیراوەو ئەگەر ئەو شتە لە مەزەبی کۆن وەرگیرابێت بە تێگەیشتنی تایبەت گاتاکان شێوەکەی قبوڵە. (لۆمل) ئەنجامی ئەو لێکۆڵینانەی خۆی بەو پوختەیە گەیشتووە:

من پەیوەندی مێژوویی (ئاهۆرامزدا) بە (وارۆنا)ی هیندی، (ئامشە ئاسپندان)ی زەدەشتی، بە (ئادیتی) مەزەبی ویدا بەراست نازانم. هەرچۆنێك بێت ئەوە دەرکەوتووە ئاهۆرامزدا ئەو شتەیە کە زەردەشت ئامادەی کردووە نەوەك وەکو ئەوەی وەرگیرابێت بۆیە بە دڵنیاییەوە دەڵێم ئەو شتە وەرنەگیراوە.

گۆڕینی شێوەو نەوایە تەواو کە زەردەشت ئەنجامیداوە بە سنوورێکە کە دەتوانم رابدەم بەکارێکی ناوازەو گەورەو ئیبداعی بژمێرم.

(لۆمل) لەو رووەوە بۆچوونیتری هەیە و دەنووسێ: کە (وارۆنا لە ئایینی ئاریاکاندا بە ناونیشانی پادشای ئاسمان خاوەنی سیفاتی توونددوتیژییەو لە نهێنیشدا رووت و بێ مووەو قەیافەتی ترس و دڵە لەرزە و تووڕە بە رووی مرۆڤدا دەبارێنێ و غەزەب و مەرگ و نەخۆشی بۆ دەهێنی، ئەو هەموو ساتێك فەرمانڕەوای ناوچەی نفووسی مردووەکان بووەو حەزی بە خوێنڕشتن کردووە. بەم جۆرە لەوانەیە زەردەشت (میترا)ێ شێوە نور و ئاڵتوونی و قارەمانی ئاسمان لادابێت و (وارۆنا)ی ترساو و خوای جۆرو تاریکی کردبێتە جێنشینی خوای پاك و رەسەن و نورانی و رۆحانی و ئەوانەی بە رووداو سەر بەون.

بە بۆچوونی من هەندێك لە لێکۆڵەران کاریگەری ئاوێستای دواییان بەسەرەوەیە نموونەش بۆ ئەمە لە یەسنای حەوت بەشدا، یان نزیکترین یەسنا لە زمانی زەردەشتەوە ئاهۆرامزدا بە (وارۆنا) چوێنراوە، بە قسەی (زهنە) سیفاتی (وارۆنا)ی بۆ خۆی داناوە. لە (هات ها)دا هەتاکو لە ئاهورانییاندا ژنانی ئاهۆرامزدا بە عونسوری ئاو دیاریکراوە، هەمان شێوە (وارۆنان)یش لە ویداکاندا ژنی (وارۆنا) بووەو دەریاش شێوەکەی بە ئاو پەیوەستبووە هەروەها لە ئەدەبیاتی دواییشدا (وارۆنا) بەخوای دەریا ناوزەد کراوە.

لە یەسنای حەوتدا (بهری ارزش شەبرو هومنە افزون شدە) ئاشە پەیوەستە بە ئاهۆرامزدا، بە هەمان شێوە (ئاشە) لە ویداکاندا پەیوەستە بە (وارۆنا). (ئاهورا) پارێزەری (ئاشە) و خۆشی و رووناکی بەخشە، (وارۆنا)ش پارێزەری (رتە) و دڵخۆشی و راستی و رووناکییە. لەم (یەسنا)یەدا (ئاهۆرامزدا) خاوەنی توانی سیحر ئامێزە، یان (مایا)ی باشە، (هومایین)ەو لە ویداکانیشدا (وارۆنا) خاوەنی تواناو نهێنی ئامێزەو (مایین) ناویەتی.

لە حەوت فەسڵدا خۆرو رووناکی تیشکدانەوەی (مزدان) (خوا)و خۆریش سەرچاوەکەی خوایە و لە (ویدا)شدا جارێکیتر خۆر سەرچاوەکەی (وارۆنا)یە. بەجۆرێك کە لە ویداکاندا

بڵاوکراوەتەوە، (ئادیتی) دایکی خواکانە و گرنگترین منداڵەکانی (میترا) و (وارۆنا)یە، کە بە زۆری بەشێوەی (میترا-وارۆنا) پەرستوویانن.

وا دیارە (میترا) لەگەڵ ژمارەیەکیتر لە خواکانی ئارییایدا زەردەشت لایداون و برایەتی دێویشی نەهێشتووە. کۆنی مەراسیمی قوربانی مانگاش لەناو خۆدا دوور لە رووناکی خۆر یان تاریکی کە مەرجەکانی ئادابی قوربانی (میترا)یە و بەندە بە نیشانەی نەهێشتنی خوا کۆنەکانی ئارییاییەکان. ئەم رووداوەش لای لێکۆڵەران رەزامەندی تەواوی لەسەر دراوە.

لە رۆژگاری دوای (زەردەشت)یشدا بەهۆی راگەیاندنی درۆوە ئەوە دەبینم کە خواکانی ئاریایی سەرەلەنوێ لە چوارچێوەی یەزدان و لە ئاوێستای دواییدا دەرکەوتنەوە بەتایبەتی (میترا) کە خۆشەویسترین و بەتواناترین خوایە لە ناویانا لە پلە و پایەی مەزهەبی ئێرانییەکاندا. ئەوەی لەمەدا سەرنجراکێشە لە (ویدا)کاندا (میسرە-ئاهورە) یان میترا-ئاهورە جێنشینی (میترا-وارۆنا)ی هیندییە.

لەم سەرحە کورتەدا دەتوانین بەو بەڵگانەی لە ئاوێستای دواییدا هاتووە لە بەشی وئینحیرافی ئایینی زەردەشتدا لێیبگەین کە مەزهەبی ویدایی لە پۆشاکی پەیامی زەردەشتدا ئامۆژگاری دەدات ئەمەش زۆرینەی لێکۆڵەران بە بەشێك لە ئایینی زەردەشتی دادەنێن. لە گاتاکاندا ئەوە دیارە جگە لە (ئاهۆرامزدا) ناوی هیچ کام لە بت و خواو خواکانیتر نییە و لەسەر هێڵێکی دیاریش ئەو خوایانە و بتەکانی ئاریایی بە لێدراوی دەبینرێن، ئەوەش لە دواییدا بووەتە شاکارێکی گەورەو گێژەڵۆکەیەکی سەرسوورهێنەر و باشی لە رووناکیدا نیشانداوە. لەم کارەدا نەمانتوانی لەوە بگەین کە زەردەشت ئایە لە خوا کۆنەکان بەهرەی دەستکەوتبێت. ئەگە بیری زەردەشت سوودی لە سەرچاوەی نامەکانی و خۆشەویستی ئارییاییەکان لە (هۆمنە) و ئاشەو.. میتراو وارۆنا و ناساتیە، کەمێك دەبیێت، بەڵام ئەو هەتاکو لەلابردنی ئەو خوایانەدا ناوی نەهێناون لە ترسی ئەوەی نەوەك پەیڕەوانیان بۆ لایان بڕۆنەوە، بەڵام ئەو وشانەو نامانە بە زمانی دەستکەوتو دیارن کە نەتوانیووە بە زمانی بابلی گاتاکانی خۆی رێکبخات و هەوڵبدات ئەو زاراوانەی بەکارهێنراون لە زماندا سوودیان لێ ببینێ، بەڵام گرنگ تەرزی سوود وەرگرتنەکە هەڵبژاردنەکەیە. ئەو لە هەڵبژاردنا ناوی (ئاسوورە) و (مزدا) بەمانای گشتی یان لای هەیە و جگە لەوانەش ناوی هیچ خوایەکیتری ئاریایی هەڵنەبژاردووە. (ئاسوورە)ش هەمان شێوەیە و لەسەری ناوی نیشانەکراوە کە مانای

ڕۆحانی هەیە کە بە زۆرینەی خواکان گوتراوەو مزداش بە مانای دانانی گەورەو مەخلوقی گەورەی (خاوەن دەسەڵات)ە کە ماناکەی بە ناوەکەیان بەرزو دیارەو خواش دروستکەرو دانایە. ئەمانە گرنگترینی ئەو سیفەتانەن کە زەردەشت بۆ ئەو خوایەی داناوە، یان روونکردنەوەیەکە بۆ ئەو راستییەی دراوە کە زەردەشت شێوەی زانست و زیرەکی بە وێنەی خودا داوە.

راستی و نیزام و حەقیش سەرچاوەی کەمالن و ئاهورامزداش چەشنی خواکانی ئاریایی داوای قوربانی و بەرتیل و نەخۆشی و بێ توانایی بۆ پەیڕەوانی نەکردووە هەروەها بە حەزی خۆشی شتێکی داوا نەکردووە کە گەورەو لە تواناد‌ا نەبووبێ و کارەکانی زۆرو زبربووبن.

لە فەرهەنگی سەرەتاییشدا مرۆڤی کۆن تاوەکو چاخەکانی دوای زەردەشتیش خواکان بە شێوەی تووڕەو شەڕو توانای دەسەڵات داوای پێداویشتییەکانی خزمەتیان لێکردوون کە لە رێگایانا بەجێاین بگەیەنن و لە دەرگایانا بێدەسەڵاتانە بپاڕێنەوە ئەوەش سەرئەنجام بە خوێندنی ویردو نزاو مەراسیمەکانی ئاداب و تەشریفات و پێشکەشکردنی بەرتیل و خێر دەبێت بۆیان بۆ ئەوەی لە خۆیان نزیکیان بخەنەوە. مرۆڤ یارمەتی خواکانی نەداوە بەهۆی دەسەڵاتی جوانیان و داوەریان و خۆشەویستیان بۆی، بەڵکو لە ترسی تووڕە بوون و هەڵچوون و خراپە و وێرانکارییانەوە بۆی لای دروستبووە. هەتاکو لای بەشێك لە ئایینە گەورەکانی دنیاش ئاسەواری ئەم دیاردەیە بەردەوامە و هەیە و لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا دەبینرێت، بەڵام خواکانی گاتاکان بە گشتی بەشێوەیەکیتر رووبەڕووبوونەتەوەو لەگەڵ ئەم خوایانەدا هیچ شێوە نزیك بوونەوەیەکیان نییە.

لە بەرگی یەکەمی ئەم کۆمەڵەدا نیشاندراوە کە رۆحانییەکان و کاهینەکان و دەڵاڵەکانی ئایین و سەودا گەرانی پەرستگا بە چ شێوەیەك بۆ رەونەقی دوکانی خۆیان مرۆڤیان بەرەو لاساری بردووە بۆ ئەوەی بە خوا چاوبرسییەکان و تووڕەو سامناکەکان و بە تواناکان.. بیانترسێنن، تاوەکو لەو ترس و تەنیایی و نەرمیاندا ئەوانە حکومەت و توانای خۆیان جێگیر بکەن.

زەردەشت بۆ فرەکردنی ئەو تێکچوون و سەوداگەریی و ریایی و درۆ و حیلەکردنە هەستاوە ئەو دوکاندارانەی بەناوی لایەنگرانی درۆ و فریودان سزابارکردوون. ئاهۆرامزداش نە لەو خوایانە بووە بە بەرتیل کاربکات نەواسیتە و دەڵاڵیشی هەبووە. ئەو خالقێکی گەورەو داوەرەو هەیەو بەخشندەیەو رازیبوونی ئەویش تەنیا لەژێر سایەی کارە چاکەکاندا جێبەجێدەبێت، خوا پەرستانیش بۆ بەتەن بوونی رۆحانییەت تیایاندا تەنیا لە رێگای ئامۆژگارییەکانی (ئاشا)، و

(هۆمنە)، و (خشترە)وە دەتوانن.. یان بەدەستهێنانی سیفاتی تەواو لە ئاهۆرایی بە پاڕانەوە. لۆمل لەو رووەوە دەنووسێ: (ئادیتییەکان پادشاکانی ئاسمان بوون، بۆ پارێزگاری لە تواناو دەسەڵاتی خۆیان حکوومەتیان دروستکردووە نەوەك بۆ کاری فەزیلەت و خواپەرستی هەر بەو شێوەیەی کە چۆن حکومەتداریان لە رووی زەویدا کردووە.

پاداشت و کفریش پەیوەستە بە هەڵوێست و توانای مرۆڤەوە نەوەك ئەنجامێکی مەنتقی بێت لە کارێکی مرۆڤانەدا، بە هەمان بەڵگەش کەسانێك هەن کە خاوەن باوەڕن، بەڵام لە بارەگای خوادا بێتوانا دەبینرێن و دەپاڕێنەوەو داوای پاداشت دەکەن. خواکان بۆ ئەوە دەڕۆن کە توانایان سەرچاوەی تێڕامانە و بەشیان لە باشی بڕیارەکانیانا و تۆڵەسەندنەوەدایە.

ناڵە و گریان و داننان بە تاوان و دەرخستنی بێتوانایی و تۆبەکردنیش نزیك بوونەوەیە لە دەرگای خوا لە کڵێسادا کە داوای زوویی بەخشین دەکا بە ئاشکراش دڵتەنگی و بێتوانایی لەبەردەم خوای ترسناکدا لای دروستدەبێت و تیایدا دەرئەکەوێت. ئەم بابەتە کە بە مەزەبی عیسایییەت دەپێورێ یادگارێکی تۆبەکردنە. لەوانەشە ئەو بێدەسەڵاتییە لە بەردەم پادشایەکی هیندییا بە زمانی لووس وەلابخرێ، یان بە هەمان شێوە ئەو کەسە بێدەسەڵات و غەمگین و ملکەچە لە بەرامبەر خوایەکی هیندییا، دەبێت چی پێویستە بیکات، بەڵام زەردەشت بە گشتی ئاشنای ئەم شتانە نەبووەو هەرگیز بە دڵتەنگ بوونی لە بەرامبەر خوادا، ڕێزو گەورەیی خۆی لە دەستنەداوە. ئەو کۆششی کردووە کە کارێکی ناشایستە بەکارێکی چاك بگۆڕێتەوە، بەڵام بە زمانی خۆش کە خوا چاوی لێدەپۆشێ و پاداشتی چاکەی بەکارێکی چاك ئەداتەوە. کفریش کارێکی نەشیاوەو بە هیچ شێوەیەك لە ئایینیزەردەشتدا ڕۆشتنی ئاسان نەبووە، بۆ پشتگیری لەو تێڕوانینە (لۆمل) وا دەبینێ کە لە بنەچەدا زەردەشت کەسایەتییەکی مرۆڤانەی بە نرخی تایبەتی هەبووە. ڕەسەنایەتییەکەی لە ئازادی هەڵبژاردنا بووە کە پایەکەی ئایینی زەردەشتە، ئەمەش نیشانەیەکە کە مرۆڤ نرخ و پایەی خۆی هەبووە لە قوتابخانە دەوڵەمەندەکەی زەردەشتدا پەیوەندی زەردەشتیش بە خواوە بەزۆری بەخۆشی و جوان ناسراوانە بووە. ئەو بە خواوە وەکو دۆستێکی بە توانا خۆی نیشانداوە، نەوەك گەورەیەك یان سوڵتانێکی بەدەسەڵات.

ئەو لە سەرتاسەری گاتاکاندا کاتێك ئاهۆرامزدا بە یارمەتیدەری داوایکرد تەنیا یاوەرێك بووە کە لە نیەتیدا داوەرەو جیهانی چاك و گەورەش دانای هەیە و بەخشندەیە و رابەرێکی راستەو

ڕێنمایی کاروانی بەختیارییە هەتاکو بۆ ئەمڕۆش. ئەمە پەیوەندییەکی جوانە و سیفاتێکە هەتاکو لە فشارو تەنگدەستی و بێبەشکردنیشدا زەردەشتی بە دۆستی باوەڕی خۆی داناوە.

ئەمە لە ڕێگارێکدایە کە دوژمنانی بەرامبەر ئەم عاشقە سەرو گیانیان بەختکردووە بۆ هێرشکردنە سەری (مەبەست زەردەشتە) و هەتاکو کەسانی نزیك و گەلانیتریش، کە لەگەڵیا لە گفتوگۆدا بوون لێیدوورکەوتوونەتەوە. ئا لەو کاتەدا بێباوەڕو پشت بووەو بە توانایەکی کەمەوە لە خاکێکەوە بۆ خاکێکیتر رایکردووەو ئەو وتووێژانەش کە لەگەڵیا لەلایەن ئاگرکەرەوەکان و عامەی گەل و مرۆڤە ئازاکانەوە کراون نەیگەیاندۆتە ئامانج. چونکە ئەوانە ئاژەوەگێڕبوون هەرچەندە لە هاوەڵانی خۆی بوون و گلەییان لێکردووە، بەڵام زەردەشت رەسەنایەتی و مرۆڤایەتی و بڵندی تەبیعەتی خۆی لەدەستنەداوە.

ئەو زانیوویەتی کە خواوەند دۆستی میهرەبانی ئەوە نەوەکو پادشای زۆردار. ئەو لەگەڵ خوادا وەکو دۆستێك گفتوگۆ دەکات هەروەکو چۆن هاوەڵێکی میهرەبان لەگلەٚ یاوەرەکانیا بەڕێزەوە مامەڵە دەکات. ئەوەی لەمەدا سەرنجڕاکێشە ئەوەیە هەتاکو لە تەنگ و چەڵەمەشدا داوای رزگارکردنی خۆی لە دۆستەکانی نەکردووەو خوازیاری لەشکرو تواناوماڵیش نەبووەو پادشتیشی نەویستووە چونکە خوا بەو توانای داوە: تاوەکو ئایینی تۆ بە شمشێر رەواج بداو دوژمنانی حەق نەمێنن..

بەڵکو (..ئاهورای چاك دەوڵەمەندی بدەم بە هاوڕێی دۆست بە دۆست) لە رێگای دیالۆگەوە. (ئەمە کارێکە دروستە و تیشکی یاساش سوپای بیری پاك و خۆشەویستی و عەشق بە عەقڵ ساز دەکات) هات 42 بەندی 2. ئەوان خواکان هەرچ زووترە نێرووی (وهومن)، یان بیری پاك و چاك و عەشق و خۆشەویستی و زیرەکی کە گشتی تیشکی راستین، دروستی حەق دەگەیەنێتە ئەنجام. لەبەندی (1) هەمان سروود جارێکیتر زەوی لە ناڵەو ماندووبوونم رووی لێمە.. هەروەها لە کۆتاییدا دەڵێ: چۆن من دڵنیام لە ئاهۆرامزدا خۆشنوودی بکەم. ئەویش پەیوەستە بەبیری خۆشنوودی دروستکراوی خواوەندەکانە بۆی کە هۆکارە بۆ بڕینی رێگای حەق.

(لۆمل) دەربارەی پەیوەندی ئاهۆرامزدا بە زەردەشتەوە دەنووسێ: (وشەکانی زەردەشت کە توانای هەستپێکردنی بە خواوەند و کاریگەری نزیکی بە پەروەردگارەوە هیەە، تەنیا بە زیرەکی و دووبارەکردنەوەی وشەکانی ئەوە گەیشتووە بە شێوە واقیعیەکەی، بەمان ناڕاستەو هەیە. بەبوونی ئەو هەندێك کات کێشە هەیە و ناتوانرێ چارەسەربکرێ یان هەست بەو شتانە

بکاو به زمانێکی تازه که هه‌یه بیگۆڕێ. په‌یوه‌ندی زه‌رده‌شتیش به خواوه‌نده‌وه وشه‌کان هه‌موو جار به‌ڵگه‌ن بۆی.

به‌ڵام بابه‌تێك که لێکۆڵه‌ران سه‌رنجیان لێنه‌دا بێت ئه‌وه‌یه که ناوی ره‌سه‌نی خوا له گاتاکاندا (مزدا)یه که به‌لێکدانه‌وه‌ی رۆشت و دادوه‌ری گه‌وره‌تر دێ، یان دروستکه‌ری گه‌وره‌و دانا که مانای خوا به نهێنی ده‌دات ئه‌مه‌ش له حاڵێکدا که ئاهورا سیفه‌تی خواوه‌ندی هه‌بێت. به‌ڵگه‌کانی من بۆ ئه‌م تیۆره پێکهاتووه له:

1- ره‌وشتی (ئاهورا) کاتێك به غه‌یری خوا ناویان بردووه. له گاتاکاندا له هات 30ی به‌ندی 9و هاتی 31 به‌ندی چواره‌م به (مزداس چا ئاخورائو ئانگهو) ناویان بردووه که (ئازه‌رگشه‌سپ مزداومهین) به مانای فریشته‌کان مانایان کردووه، دکتۆر (تاراپوروالا) ئاهورامزداو په‌رتووکی ئه‌و، (هینتس) مزداوتۆ ئاهوراکان، مۆنامزداو ئاهوراکان، مولتون مزداو ئاهوراکان، ویدن گرن به‌مزداو تۆ ئاهوراکان... به‌شیکردنه‌وه‌ی (ئامشه‌ئاسپندان) ته‌واو ده‌رکه‌وت که خواکانی پله دوو لابران. هه‌روه‌ها لای (بارتولومه) روونبۆوه که ئه‌م تێگه‌یشتنه نادروسته به هه‌مان شێوه که دکتۆر (بوروالا) ده‌بڕینی لێکردووه، هه‌روه‌ها ئه‌وانیتر که‌م و زۆر راین له‌گه‌ڵیابووه، په‌رتووکه‌کان خواوه‌ندو ره‌وشته‌کانی خوایی که هه‌ن. زه‌رده‌شت هه‌روه‌ها به هه‌مان شێوه به (ئاهوراکان) ناونراوه نه‌وه‌ك به (مزدا) و زاراوه‌ی (مزدا)، که ته‌نیا بۆ خوا ناوبراوه، دووه‌م خواپه‌رسته‌کان و په‌یڕه‌وانی ئایینی راستی به (مزد یه‌سنایان)، ئه‌وانه‌ی که مزدایان په‌رستووه له به‌رامبه‌ر (مزدایه‌سنا) و دێویه‌سنا که هاتووه.

2- له (هات)ی 57 به‌ندی 19 ئه‌مه گه‌یشتووه: (مزدا) که ئۆداتا) به ئایین و یاسای مزدا مانای لێکداوه‌ته‌وه (داتا-یاسا) که هه‌مان ئایین و ئایینی مزدایه  و له هیچ شوێنێکی گاتاکاندا (ئاهورائو-داتا) به‌رچاو ناکه‌وێت.

3- له گاتاکاندا وشه‌ی مزدا 180 جار به‌کارهێنراوه که به زۆری به ته‌نیا و به‌بێ (ئاهورا)یه لێره‌دا ئه‌و سه‌رچاوانه مه‌به‌ستیان خاڵق و خواوه‌ندی گه‌وره‌ی دانایه، له حاڵێکدا که ته‌نیا 69 جار ناوی ئاهورا هێنراوه که له زۆرینه‌دا به یه‌کگرتن له‌گلهٚ (مزدا) لێکیان داوه‌ته‌وه، یان له هه‌مان به‌نددا وشه‌ی (مزدا) هه‌ر به‌وجۆره گه‌یشتووه. له چه‌ند سروودێکی که‌مدا که ته‌نیا ئاهوراها هاتووه، له هونه‌ری شیعری هه‌ڵبژێردراویشدا شێوه گرتووه.

له ئەشعاری شاعیرەکانی ئێران، یان وەکو نموونەی لە قورئاندا سیفاتی خوا کە چۆن (رەحمان) و (رەحیم) و (قاصم) و (جەبار) و.. ناوی براوە، بەڵام هەرگیز (رەحیم) پەرت و (جەبار) پەرست لەگەڵ خوا پەرستی یان ئایین و یاسای بەبەزەیی لەگەڵ ئایینندا بەکارنەهێنراوە.

4- مانای خوا لە گاتاکاندا پێشتر بە (مزدا) پەیوەستبووە تا ئاهورا. لە کۆندا گاتاکان قسەیان لەسەر مزدا بووەو زەردەشت بۆ ئەو نوێژی کردووە (28/1) و لە (28/5) گەیشتووە: (ئایا فەرمانی پێکراوە کە دەنگی ویژدان و فەرمانی ئاهورایی بەمزدا بگەیەنم). هەر لەو کاتەدا زەردەشت وەکو فەرمانبەرێکی مزدا بە ئاهورایی گەیشتووە. بەشێوەیەکیتر ناوی خوامزدایە و ئاهورا سیفەتی ئەوە. رەوشی ئاهورایی بچکۆڵە، ئاهورایی تەواو... کە دانراون لە چۆنێتی بەکرهێنانا مانایەکیان هەیە.

5- بەجۆرێك کە دیومە (ئاسوورە) نازناوی خواکان و قارەمانانی ویدایی بووە، بەشێوەیەکیتر بە خواو بە مرۆڤیش گوتراوە، سەرنجڕاکێش ئەوەیە لە ئاوێستادا هەیە. نموونە بۆ ئەمە لە یەشتی نۆزدەەم پادشا خەسرەو ئاهورا نازناوی بووەو لە یەشتی پێنجەمیشدا ئاهوار نازناوی هەموو قارەمانان بووە.

6- لە سروودی 45/10 گەیشتووە: خواوەند (رما) بەنزاو ئیمانی پاکی گەورەوە ئەو شتەی کە هەیتی تیشکی خوایی ئاخورایە لە زانست و زانیاری بە شێوەیەکیتر بە ئاشکرای تەواو ئەوە دەسەڵمێنێت کە چۆن خواوەند (مزدا) و گەورەی دانا (ئاهورا) بەشی لە بوونی ئەوەدا هەیە. بە مانا سیفەتی ئاهورایە و چۆنێتی راستی خوایەتی ئەو لە خوایەتی ئاهوراییدا شاردراوەتەوە.

(پورداود) و بەشێك لە لێکۆڵەران باوەڕیان وایە کە ناوی خوا لە ئێراندا (بغ) و (بگە) بووە. لە نووسینەکەی سارگۆن پادشای ئاشووردا. (721-705پ.ز) ناوی ئێرانییەك بەرچاو دەکەوێت بەناوی بگداتی، کە هەمان بەغدادی ئێستایە و بە خوای داد مانای لێکدراوەتەوە. ناوی رەسەنی (بێستوون)یش کە (بغستان)ە بە مانا شوێنی خواکان بووە، هەروەها ناوی حەوتەمین مانگی ساڵی (بگە)ی خوایە کە پەرستوویانە.

بەم لێکۆڵینەوەیە ناوی خوا بەر لە زەردەشت (بگە) بووەو ئاهورامزداش ناوێکە کە زەردەشت هەڵیبژاردووە.

به تیڕوانینی من ئەوەی لە ئاوێستای دواییدا و لە کۆمەڵگای ئێرانیدا بەرچاو دەکەوێت ئەوەیە کە گاتاکان زیاتر نامۆن وەك لە ویداکانی سەرەتایی لەبەر ئەوەی لە دوو سەردەم و لە یەك شوێنداو لای قەومێك شێوەی گرتووەو ئاوێستای دوایی و یەشتەکانیش چەند سەدەیەك دوای زەردەشت لە دەوروبەرێکی نزیك بە یەك رێکخراون.

ئاهۆرامزداش ناوێکە زەردەشت هەڵیبژاردووەو کەسایەتییەکەی گرنگترینی هەمووانە کە لە گاتاکاندا بۆ خواکان دانراون. دیاریکردنی ئەو رەسەنایەتیی و برایەتییەش هەڵبژاردنەکەیە بە مەرجێك لەو هەڵبژاردنەدا سوودی لە زاراوەکان و ماناکانی ویدایی وەرگرتبێت کە بە زمان و فەرهەنگی کۆمەڵگاوە وابەستە بووە، بەڵام لە ئەنجامی رووداوی‌ی کۆنەوە نەبووبێت. زەردەشت لە هەڵبژاردنی ناوی ئەو خوایەدا و شاکاری ناولێنانەکەی سوودی لەو زاراوانەی کۆمەڵگا دیوە واتە لە تازەگەرێتییەکەیدا سەرکەوتووە. ئاهورامزدای گەورەو دادوەرو بێهاوتاش رووی برایەتی و یەکیەتی خستۆتەوە. بەم برایەتییەش لە شێوەی ناوەکەیدا نییە، بەڵکو لە تێگەیشتن و چۆنێتی رێنماییەکەیدایە کە ئەنجامی دەدات.

لە گاتاکاندا خوا گەورەتر نییە 28/8، ئەزەلییە و یەکەمینە 45/10، کۆنترین بیرو دروستکەرو یاسای ئەزەلییە 31/7، بە توانایە 42/4، بەنرخترینە 47/9، گەورەترینە 45/6، دروستکەری دنیایە 50/11، باوکی (وهومنە) 31/8، باوکی ئاشە 44/3، دروستکەری رووناکیی و دروستکەری مرۆڤە کە بە ژیری و ویژدارنی رێکیاندەخات 31/11، دروستکەری ئاو و رووەکە 51/7، ویستوویە حکومەتی یەکیانی لە جیهاندا دروست بکات 41/3، داناترینە 46/19، دووربینترینە 33/13، زانست یان موتڵەقە 43/6، بە بەزەیی و دادوەرە 51/4، لە کۆن و ئێستادا درەوشاوەیە و کۆتایی مانگە 7/ 31 بەو شێوەیە ئەو لەگەڵ هیچ پەیکەرێك و بتێك و خوای پلە دوو و خوایەکدا نەبووەو پەیوەندیشی بە دەڵاڵ و کاهینەوە نەبووەو بەکاری نەهێناون.


سەرچاوە

مهندی جلال الدین اشتیانی/ زردشت/ مزدیسناو حکومت

چاپ هفتم 1374، لا119-138

# زەردەشت.. حكومەت

لێكۆڵینەوەیەك كە لەوەبەر لەسەر رۆژگاری زەردەشت كراوە ئەوە نیشاندەدات كە باسی حكومەت یان دەوڵەتی دامەزراو ناوی نییە و سوڵتە و دەسەڵاتیش نەهاتۆتە كایەوە. بەهەمان شێوەش ناتوانین چاوەڕێبین كە بابەتێك لەو رووەوە لە گاتاكانیشدا هەبێت.

لە هیچ كام لەو ئایینە گەورە دروستبووانەشدا لە راستیدا دەربارەی حكومەت شتێك نەگوتراوە تەنیا ئەوە نەبێت لە چوارچێوەی فیكری ئایینەكاندا توانراوە شتێك لە بنەمای كۆمەڵگاوە وەربگیرێت. لە سەرچاوەی زەردەشتیشەوە ئەوەی لەسەر فیكری ئوسوڵی لە گاتاكاندا لەبەرچاو گیراوە سەبارەت بە دروستكردنی حكومەت یان دەوڵەت لای زەردەشت بوونی نەبووە. لای منیش یەكەمین یان گرنگترین هۆكارێك كە بووەتە هۆی سەرهەڵدانی فەرمانڕەوایەتی لە فێرگەی كۆمەڵگادا هەڵسوكەوتی مرۆڤەكەو كەسایەتی و شوێنەكەیتی لە كۆمەڵگادا. لە بەشی یەكەمی ئەم كۆمەڵەدا ئەوە نیشاندراوە كەچی شێوە مەزەبێكی پەرستگایی دانراوە بۆ پەرستنی خواكان و رازیبوونیان ئەوەش بە هەڵبژاردنی كاهینی نوێنەر بووە بۆ ئەوەی پشتی سوڵتە و حكومەت بگرێ و پێوەی پەیوەستبێت. لەناو ئەو مەزەبانەشدا كەس سوڵتەی موتڵەقی نەبووە، چونكە ئەو سوڵتەیە هەر بەدەست خواكانەوە بووە كە بە رێگای نوێنەرەكانیان زەویان بەڕێوەبردووە. ئەوانەش كاهین بوون لە كۆمەڵگاداو دەسەڵاتی سەربەخۆیان هەبووە.

لە ئایینی جولەكەشدا (یەهوە) تاكە پادشایەك بووە كە لە سەرەتادا سوڵتانی نەوەی (بەنی ئیسرائیل) بووەو هەموو جولەكەش لەبەرچاوی یەكسان بووە. ئەمەش بەڵگەیەكیترە بۆ رۆژگارێك كە بە وردی مامەڵەیان بەو باوەڕە كردووە كە بۆ دیموكراسیەتی ناو عەشیرەتەكە دەگەڕێتەوەو جێگیر بووە. پیاوانی ناو عەشیرەتەكەش لەژێر دەسەڵاتی گەورەی گەورەكەیاندا بوون كە سەرپەرشتی كارەكانی كردوون ئەمەش لە كاتێكدا بووە كە دەسەڵاتی حكومەت نەبووە، بەڵام مافی هەموو لایەك بە یەكسان لەبەرچاو گیراوە. رۆژگارێكیش كە سوڵتەی حكومەت لەژێر دەسەڵاتی رۆحانییەكانی نوێنەرانی خوادا بووە باوەڕەكە لەوەوە سەریهەڵداوە كە پادشای سەر زەوی

جێنشینی پادشای ئاسمانە. لە ئایینی عیساشدا سنووری دەسەڵات بە گەورەبوونی سنووری زەوی گۆڕاوە. لەناو باوکانی مەسیحیشدا هەموو مرۆڤ بەو شێوەیە ئامۆژگاریکراون کە یەکسانن ئەوەش شێوەی کۆمەڵگای کۆمۆنیستی سەرەتایی نیشاندەدات هەروەها لە نامەکانی (پاولۆس)یشدا ئەوە هاتووە کە (سوڵتان) ئیتاعەی لەسەر رەعیەت داناوەو ئەوەی یەکسان کردووە بە دنیای دووەم (قیامەت). لەناو مەسیحییەکانیشدا پادشا وەکو نوێنەری خوا دەسەڵاتی هەبووە بەهۆی ئەوەی کڵێسای بەخۆوە پەیوەستکردووە هەر ئەوەش وایکردووە کە بتوانێت لەناو حکومەت و سوڵتەدا تاوانی خۆی دیاری بکات. لەو فێرگەیەدا مرۆڤ و ئاژەڵ موڵکی خوان و کڵێساش لە ژیان و مەرگیان ئاگادارەو ژیانیش تەنیا بۆ (مەسیحە) کە نوێنەری خوایە و فەرمانڕەوایەتی دەکاو لەناوا جیاوازی ناهێڵی و کۆتایی پێدێنێ.

لە ئایینی ئیسلامیشدا دادوەر خوای تەنیایە و لای ئەویش مرۆڤ بە یەکسان لە دایك بووە و هیچ کەسێك لە کەسێکیتر گەورەتر و جیاوازتر نییە. چەند تەرزێکی فیکریش کە لە بارەی سەرکردەو پێشەواو سوڵتانەوە دەرکەوتووە لەم ئایینەدا شوێنیان نییە. کاتێکیش سوودیان لە وشەی (اولی الامر) بینی کە جارێك لە رووداوێکی کۆمەڵایەتیدا هاتووە ئیتاعەکردنی پادشاو دادوەر و پێشەوا بەشێوەی فەرمانپێکردن باوەڕەکەی پێوە بەسترا کە پێویستبوو. رۆژگاری دیموراسیەتی سەرەتای ئیسلامیش بەخێرایی تەواوبوو کە لە شوێنی خەلافەتی سوڵتان نشینەکان جێگای گرتەوە.

لەسەر بەڕێوەبردنی کۆمەڵگای (زەردەشت)یش زانیار تەواو بەدەستەوە نییە و ئەو توێژینەوانەش کە لەو رووەوە کراوە کۆمەڵگای عەشیرەتی ئاژەڵداری نیشاندەدات. لەو رۆژگارەشدا سەرۆکەکانی (مەزەبی-سیاسی)، یان سوارەی گەورەی عەشیرەت، یان خێڵ دەوریان گێڕاوەو (زەردەشت)یش بە عەشیرەتی ویشتاسپەوە لکێنراوە. ئەو گۆڕانکارییە لەبەرچاوەش کە لەو کۆمەڵگایەدا بۆ بەڕێوەبردنی بەدەستیان هێناوە روون و ئاشکرا نییە. یەکەمین شتێکیش لەو کۆمەڵگایەدا لە سروشتی پەیامی زەردەشتدا سەرنجڕاکێشێت کەسایەتی تەواوی مرۆڤ و هاوبەشیکردنیەتی لە هەڵبژاردنی ئازادا ئەمەش گرنگترین پلەیە کە دەیدرێتێ. مرۆڤیش تەنیا هەر بەوە نەوەستاوە بەڵکو خوای خۆشی هەڵبژاردووە. ئەوەش نیشانەیە بۆ خواپەرستی کە پایەی بەرزی ئەو ئایینە دەرئەخات کە ژیرانە داناکان هەڵیانبژاردووە هەر بەوەش خوای دانا لە هەواڵی سەر زەوی بە ئاگا دەبێت.

لێرەدا پێویستە ئەوە بخەینە بەرچاو لە کەسێکدا ڕێنەکەوتووە حکومەت و سوڵتە هەتاکو سەرۆکایەتی کلێساش کۆبکرێنەوە کە مرۆڤ تیایدا ئازادبێ و لە کارەکانی بە ئاگابێت. سەرەتاش دەبێ ئەوە بزانین کە چەندین لێکۆڵینەوە لەو ڕووەوە کراوە کە نەیانتوانیوە ئەوە نیشان بدەن کەسێکی کلێسایی دەسەڵاتی حکومەت وەربگرێت. لە کۆمەڵگای خواپەرستانیشدا ڕاستی بەڕێوەبردن بە هەڵبژاردنی ئازادبووەو مرۆڤەکەش پێشوازی لێکراوە. بەدرێژایی مێژووش ئێرانییەکان هەڵگری ئەو باوەڕە بوون و لەسەری ڕۆشتوون، ئەوەش پەیامەدا ئەوەیە کە ڕابەری هەموو مرۆڤە. ژن و مێردیش کە خاوەنی بەرهەمهێنانی هیچ جۆرە جیاوازییەك لە نێوانیانا نەبووەو لە هیچ کام لەو سروودانەی کەسایەتی (زەردەشت)یشدا جیاوازی لە نێوان ژن و پیاو و گرووپێکی تایبەت لە کاهین و ڕۆحانی و خاوەن پیشەو پێشەوادا نەبووە. (ئاشەون) کە لە پەیڕەوانی ڕاستین ئەوانەن کە لە ژن و مێرد و زانان و نەخوێندەوار و خواپەرست پێکهاتوون کە ڕێگای حەق و ڕاستیان گرتووە. لە کۆمەڵگای نموونەیی بەرزی گاتاکانیشدا هەموو ئەو کەسانە لە درۆ دووردەکەونەوەو پەیوەندی بەڕاستییەوە دەکەن بۆ دروستکردنی سیستەمێکی حەق پەرستی و پاکێتی و هاوڕێیەتی و خۆشەویستی بۆ ئەوەی لە کۆمەڵگادا خزمەت بکەن و ڕێگانیشاندەر بن بۆ تەواوی خێزانەکان و شارو سەرزەمینی (کۆشا). دەمارکرژی و قین و نەفرەت لە خراپەکانی پەیڕەوانی درۆیە، بەڵام پەیڕەوانی (ئاشا)، یان (وهومنە)ی هاوشێوەی، بە تەوازوعن و لە پێشەوەی خواپەرستانن کە لە قین و دەمارگرژی و نەفرەت بەدوورن. هەڵبەتە کۆمەڵگایەکی هاوشێوەی کۆمەڵگای نموونەیی بەرز هەبوو، بەڵام نەماوەو لە شوێنی کاروانی ئەم کۆمەڵگایە شوێنی گرتۆتەوە.

سێیەمین دەرکەوتووی پەیامی زەردەشت ئاگرکەرەوەکان و سوارچاك و دادوەرە ستەمکارەکانە کە لەگەڵ هەموو مرۆڤێکی خاوەن وەزیفەی ڕاستکرداردا لە ململانێدان. چوارەمین دەرکەوتوو لایەنگرانی خواپەرستانە لە چینی لاواز و ژێر دەستەو دژ بە زۆربڵێکانە.

پێنجەمین دەرکەوتووی ئایینی خواپەرستان دروستکردنی هیوایە بۆ ژێر دەستەکان کە لە دواییدا بەسەر زۆربڵێکان و دادوەر و درۆکاراندا سەردەکەون، واتە ئەوانەی کە بێکەڵکن. دەربارەی دەرکەوتووەکانی ئایینی خواپەرستانیش لە بەشە جیاجیاکانی ئەم نامەیەدا قسەیان لەسەر کراوە بۆیە پێویست بە دووبارەکردنەوە ناکەن.

بیری زەردەشت لای لێکۆڵەران بەو ئەنجامە گەیشتووە کە ئەو تەنیا مامۆستای زەردەشت نەبووە بەڵکو رەوشت لە کۆمەڵدا لە کارەکانی کۆمەڵایەتی ئەودا رەنگی داوەتەوە. زەردەشت وەکو عیسای کلێسا تەنیا بۆ رێکخستنی کارەکانی بەهەشت و دۆزەخ لە پەیامەکەیدا نەهاتووە کە حکومەتی خواش لەو پەیامەیدا وەکالەتی داوەتێ بەڵکو ئەو بۆ دروستکردنی نیزامێکی راستی مرۆڤایەتی هاتووە کە بۆ ژیان دروستی بکات ئەوەش یەکێکە لەو شتانەی کە لە پەیامی زەردەشتدا بە زۆری بەرجەستە بووە.

من سەرلەنوێ دەیڵێم و دووبارەی دەکەمەوە: (زەردەشت ئایینێکی تاکی تازەی دروست نەکردووە بەڵکو ئەو بە پێچەوانەوە دژی شێوەکانی ئایینی ناو کۆمەڵگاش بووە کە بە سوودی هەژارەکان رۆشتووەو دەنگی داوەتەوە. (زەردەشت) لەمەدا بەو ئەنجامە گەیشتووە: ئەو نیزامەی کە هەبووە بۆ چاککردنی ژیانی خەڵکی لە هەژارو خاوەن ئاژەڵ و لەوەڕگاکان بەگشتی سروشتی نەبووە. ئەو سیستەمێکی باشتری دۆزیوەتەوە کە چەند بێگەرد و روون و ساکاربووە کە سروشتی شەڕکەران وابووە بە تەنیا کە نەتوانن هەستی پێبکەن. بەپێچەوانەی ئەو نیزامە بووە کە کاهین و نەجیبزادەو هەتاکو خواکانیش هێناویانە بەدرۆ خزمەتیان کردووەو حکومەتەکەیان بەهێزکردووە. ئەو درۆ پەروەرو فریوکارانە وا دەبینن کە ئاگایان لە خۆیانەو سەردەکەون، ئەگەر خۆشیان لەبەردەم راستیا دیبیەوە بڕیار دەدەن شەڕی لەگەڵدا بکەن. هەر کەسێکیش یەکجار هەستی بە نیزامی راستیکرد و بە خزمەتی گەیشت ئەقڵ و ئیرادەی پاکدەبێتەوەو بەسەرکەوتن دەگات، چونکە راستە و پەیوەستە بە خواوە. لەمەدا زەردەشت کە دژی داب و نەریتی ناشیرین و خواکان بووە ئادابی راستی پاراستووەو نەترساوە، هەروەها سەرسەختانەش لە ململانێدا بووە دژیان کە بەو کارانە هەستاون؟!

ئەوەی لە پەیامی زەردەشتدا هاتووە کە یەکتاپەرستییە گرنگی گەورەی هەبووە لەسەر زانست و زانیاری و هەڵبژاردنی ئازاد. زەردەشت لە کۆندا پەیامی خۆی بە رێگای زانست و بە ئاگاداری ئەقڵ و ئیرادەی راست هەڵبژاردووەو ژیانی پێبەخشیووە. نەزانی بەکاری شەڕو درۆ و خراپەکاری داناوە کە هۆکاری نەمان یان لەناوچوون رێگانیشاندەریەتی. کاری راستگۆکانیش تێکۆشانە بۆ دروستکردنی نیزامی حەق کە ئاگاداری هەڵبژاردن بێت و لەگەڵ خراپەکاراندا ململانێ بکات. چونکە خراپەکار رێگا دادەخاو ناهێڵێ مرۆڤ پێشبکەوێ بۆ ئەوەی مرۆڤ و تەواو کۆمەڵگا ببنە دۆستی.

سروودی 4م 46 له کەمال و جوانی و چاکەدا دەدرەوشێتەوەو (درۆپەرستانیش دژی پەیڕەوانی راستی ناو کۆمەڵگان له دنیای ئێستاو قیامەتدا، چونکه ئەوانه به تواناو بەهرەدارن و کردارییان چاکه و بەخۆشی دەژین. کەسێك ژیانی به تواناو بەهرەی خۆی بەرەوپێش بەرێت و دژی شەڕ بوەستێ دنیا به رێگای ئەقڵ به باشی دەبینێ و دژی شەڕ و ستەمگەریشه. ئەوەش پەیوەندی به توانای حکومەت و کۆمەڵانیترەوه نییه بەڵکو نیشانەیه بۆ ئەوەی جیهان به رێگای باش پێشدەکەوێ. ئامانج لەمەشدا بۆ ئەوەیه (هۆمنی) زیرەکی پیرۆزی ئازاو ئەقڵ و بیری پاك له کۆمەڵگادا دەسەڵات بگرێ. چونکه هەر بەناوی ئایین نیشتمان سەربەخۆیی له دەستدەداو مرۆڤەکانیش زنجیرکێش دەکرێن و جادوویان لێدەکەن. هۆکاریش بۆ ئەمه دەگەڕێتەوه بۆ ئەوەی که ئەوانه ئاژەڵداارن و دروستکەری گۆزەو گلێنەن و به ئاماژەی شوانەکان دەحولێن که هەرگیز لەگەڵ ئایینی یەکتاپەرستیدا نین.

دەسەڵاتی دیکتاتۆری فەردیش به هیچ شێوەیەك لەگەڵ پەیامی زەردەشتدا رێککەوتن ناکات، چونکه دەرکەوتنی دەسەڵاتی رەها یەکێکه له بەڵگەکانی لادان له ئایینی زەردەشت. دەرکەوتنی دەسەڵاتی رەهاش له کۆمەڵگای ئێراندا پشت بەستنەبه سیستەمەکه بەهاو ئاهەنگی تەواوی کلێسای زەردەشتی که گاڵتە پێکردن و کەمکردنەوەی کەسایەتی مرۆڤەکەیه. بەو جۆرەی که له بەرگی یەکەم توێژینەوەیەکی سەرەتاییم لەسەر دەوڵەتی دروستبوو له ئێراندا باسکرد بۆ ئەوە دەچین که دەوڵەتەکه لەژێر کاریگەری فەرهەنگ و سیستەمی دەسەڵاتی بابل و ئاشووردا بووبێت که خواو پادشاو کاهین پایەکانی سیستەمی دەوڵەتەکانی دراوسێی ئێران بووه لەو رۆژگارەدا که لەسەری دروستبوون، هەروەها دروستبوونی دەوڵەتی مادیش له رواڵەتدا لەسەر دەوڵەتی ئاشوور شێوه وەرگرتووه.

ئاشوورییەکانیش له کۆنترین ناسنامەی دەوڵەته کۆنەکانن که لەناوچوون و لەسەر شەڕو هێرش و کاولکاری و خوێنڕشتن لەگەڵ مرۆڤی ناوچەکەدا ژیاون بۆ پارێزگاریکردن له خۆیان هەروەها بۆ ئەوەی ئەوانه پێشکەوتن و سەربەخۆیی و گەورەیی بەخۆیانەوه نەبینن. ئەمانه (واته ئاشوورییەکان) دڵڕەق و داگیرکەر و ترسناك بوون که به رێگای خۆ بەگەوره زانین لەسەر شانی لاوازەکان دەرکەوتوون و دروستبوون. لێرەدا ئەوە دەڵێم: بەهۆی ئەو خراپەکاریانەوه کۆمەڵگای هاوشێوەیان زیاتر بووه.

سایکس دەنووسێ: (باسێك کە دەربارەی (ماد) بەدرێژی هاتووە ئەوە دەرئەخات لە تەشریفاتیاندا بە هەزاران خزمەتکاریان هەبووە کە جلکی سوورو ئەرخەوانیان لەبەردا بووەو بە (گەردنبەند)ی ئاڵتوون خۆیان جوانکردووەو لە دەرباربوون. ئەو جۆرە خشڵانە بەزۆری ئەوە نیشاندەدات کە لە شوێنێترەوە وەریانگرتبێت واتە لە ئاشوورییەکانەوە. کاتێکیش کە دەوڵەتی ماد بەرەو گەورەبوون رۆشت و توانای زیاتر بوو هێشتا ئایینی زەردەشت لە ئێراندا نەچەسپابوو کە تیایدا لادانی موغەکانی ماد لە ئایینەکەدا سەرنجڕاکێش بوو.

باسێك کە دەربارەی هاخامەنشییەکان کراوە ئەوە دەگەیەنێت کە لەناو عەشیرەتی هاخامەنشی یا ئایینی (یەشتاکان) دەبینرێت کە تیشکدانەوەی خواپەرستییە، بەڵام ئەو بوونە لە کۆمەڵگادا بەگشتی ئاسەواری نییە.

لە بەرگی یەکەمدا ئەوە نیشاندراوە کە فەرهەنگی ئاوێستایی شوێنی تایبەتی خۆی لە حکومەتی (کۆرش) و (داریۆش)دا هەبووە کە ئاداب و رەوشت و شێوە کۆمەڵایەتی پارسییەکانی لەخۆگرتووە. فەرهەنگی ئاوێستای کۆنیش لە کۆمەڵگای هاخامەنشیان و دەربار و حکومەتی هاخامەنشیدا کاریگەری زۆری هەبووە بەتایبەتی لە سەرەتای دروستبوونییەوە. راپۆرتی مێژوونووسان و نووسینەکانیش دەبارەی رەوشت و سیفات و ئاداب و وێنەکانی ناو کۆمەڵگای پارسییەکانی دیوانی (کۆرش) و (داریۆش)یش پشتگیری لەو کاریگەرییە دەکەن، بەڵام ئەوەی هەیە و راستە بەهیچ شێوەیەك سیستەمی فەرمانڕەوایەتی لە ئێراندا لەگەڵ ئایینی خواپەرستیدا نەبووەو ئەو ئایینەش هەتاکو بەشێوەیەکی لادەر دەربڕینی لێکراوەو دەرکەوتنی لە فەرمانڕەوایەتیشدا کاریگەری نەبووە. ئەو گۆڕانکاریانەش لە حکومەتی ئێراندا دروستبووە بە هاتنی خوا پادشاکە 2500 ساڵ مرۆڤی خستۆتە ئەندێشەوە بەهیوای بەرزکردنەوەی رۆحی تەواوی مرۆڤایەتی بووە کە لە ناخۆشیدا ژیانی بەسەربردووە. لەمەدا سەرەتا لاسایی سیتستەم و نفووسی فەرهەنگی بابلی و ئاشووری کردووەو دواییش بە هاوئاهەنگی لەگەڵ موغەکان یان رۆحانییەکانی کۆمەڵگای دیوان کە لایەنگری بڵاوبوونەوەی ئایینی دەرباریان دەکرد.

لەوانەیە ئەم پرسیار پێش کاتی خۆی کەوتبێت ئەویش: ئەگەر پەیامی زەردەشت دژی خوا پادشاو توانەوەی رۆحی مرۆڤایەتی بۆ رزگاربوون بەو بەهێزییەی نەبووایە چۆن دەیتوانی دواتر دەسەڵات لەناو مرۆڤ پیادە بکاو ریشە بگرێت؟ ئەم پرسیارە لای (زهنەر) جارێکیتر پرسەیەکە دەیهەژێنێ ئەوەش بەو

جۆرەیە: زەردەشت کاتێك دژی ئایین و ئاداب و شێوەی دروشمەکانی بتپەرستی بووە چۆن هەر ئەو ئادابە سەرلەنوێ بەناوی زەردەشت بەیانی کارپێکردنی لەسەر دەرکردووە؟

ئەگەر چ بەڵگەی مێژوونووسین بۆ ئەو رۆژگارەی لەبەردەستدا نییە بۆیە ئێمەش بەو هۆیەوە نازانین ئەو گۆڕانکاریانە چییە لە کۆمەڵگاکەدا کە زەردەشت تیایدا ژیاوە روویداوە، یان بە چ شێوەیەك بووە، بەڵام یەکەم: من وا دەبینم لە یەشتاکانی کۆندا ئاسەواری خوا پادشاو دەسەڵاتی رەهایی نەبووە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە هەتاکو باوەڕە لادەرەکانیش نەیانتوانیووە دژی پەیامی پاکی زەردەشت بووەستن کە ئاسەواری لەناو پایەی شاهەنشایی و حکومەتی رەهاییشدا هەبووە.

دووەم: رۆژگارێك کە فەرمانڕەوایەتی لە ئێراندا هەبووە وردە وردە باوەڕەکانی مەزەبی لەژێر کاریگەری و ئامۆژگاری ئەو جۆرە دەسەڵاتە لادەرانەدا بووەو ئایینی کلێساش کە پێشووتر لە دیوان نزیك بووە لە دوای سوڵتەی ساسانی ئاشنای دیوان بووە.

ئایینی جولەکەش سەرەتا بە دەسەڵاتی حکومەت رازی نەبووە، بەڵام دواتر کۆبوونەوەکانیاندا گەیشتوون بەوەی جولەکە بەو دەسەلاتە رازی بێ و ئایینی دەرباریش دروستبکەن. ئیسلامیش ئامۆژگارییەکانی دژی هەموو جۆرە سوڵتەیەك بووە، بەڵام کاتێك مسوڵمانەکان گەیشتن بە شارستانییەتی ئێران و رۆم و فەرهەنگی شاهەنشایی، ئێرانییەکان وردە وردە بە ئایینەکەیان رازیبوون و مزگەوتەکانی ئیسلامیش پێشوازیان پێوەکردن و هەڵیانبژاردن لە کۆمەڵگای زەردەشتدا و بەپێی ئەو بەڵگانەی کە لە باسەکەدا هاتوون یان ئاماژەیان پێدراوە بووتە هۆی ئەوەی وردە وردە رۆحانییەکان لە نوێوە توانایان بۆ بگەڕێتەوە. ئایینی کلێساش بۆ مانەوەی ژیانی خۆی دروستبوو کلێساش دوای تواناو جێگیربوونی حکومەتی هەڵبژارد و لەگەڵ حکمدا بووە لایەنێك لە دابەشکردنی دەسەڵاتەکەدا. ورد وردە مرۆڤ بە ئیتاعەت راهات لەگەڵ حکومەتی خوایی و فرەخوایی، حکومەتی پادشاش بووە نوێنەری خواو.. جارێکیتر پێشوازی لە ئایینەکە کرد.

ئایینی (مزدیەسنا) کاتێك لە دەشتەکانی باشووری دەریاچەی ئۆراڵ بە بەرزاییەکانی ئێران گەیشت، لەو ناوچەیەدا چەند چاخێك مایەوەو دەبینرا، بەڵام رەنگی رەسەنایەتی خۆی لەدەستدا بەهۆی ئەوەی بتپەرستی و فرەخوایی و کاهینەکان ئەسڵەکەیان گۆڕی. بۆیە لای زەردەشتییەکانی ئێران ئیتاعەی سوڵتان و باوەڕ بە فرەخوایەتی و ئەوانەی لە ئایین و مەزەبەکاندا خاوەن پایەبوون، بە زەردەشت نامۆبوون. مرۆڤێك کە بیزانیایە خوا دۆستیەیتی و بە هەڵبژاردووە لەبەردەم خوا بێکەڵکەکان و خوا سەر

نەوییەکانی باپیرەیان و کەم ئاقڵەکان و خواکانی درۆدا بەشەڕ بێ لەگەڵ لەشکرەکانیان ئەوانە تەنیا پیاوان و نۆکەرانی پادشان، بێ تواناو بێکەڵکن و لەبەردەگای ئەو خوایانەدا مشەخۆرن، بەناوی (موبد) و (موغ) و (رۆحانی) کە زنجیری کۆیلەیەتیی و دیلێتی لە دەستوپایان پێچراوەو سەری گەورەیان لەژێریانەوە بەرزدەکەنەوە.

ئازادی و سەربەستی و هەست و ئەقڵ گەورەترین دیارییە کە بە مرۆڤی خاوەن کەسایەتی دراوەو لە ئاژەڵ جیاکراوەتەوە. ئەمەش راستییەکی درەوشاوەیە و لە گاتاکانیشدا لە کۆنەوە نیشاندراوە، زەردەشتیش بەدەنگ گەیاندوویەتی هەروەکو دەڵێ: ئەی مرۆڤ با قسەکانت جارێکیتر روویان لە ئەقڵ و زانست بێ بۆ ئەوەی سەرچاوەکەی رۆشن بێا. بەو راستییە گەورەیە بەرەو رووی خۆشەویستی خواوەند دەبیتەوەو بە گیان و ئەقڵ دەپەرستی. وریابە و بۆ بارەگای رووناکی و بەهەشت ئامادە بەو بەهەشت دەستبخە کە دەروون و ویژدان و کۆمەڵگاش دەیانەوێت. ئەی مرۆڤ لە خەوی غەفڵەت راپەڕەو شەماڵی خۆشی مرۆڤایەتی هەست پێبکە و ئاهەنگی سەربەستی و خۆشی بکە تاوەکو بە سیفاتی کەمال بگەیت و خواش یارمەتیت بدات. تۆ ئەی رۆڵەی ئادەمی ئازاد، ئەی مەخلوقی هەڵبژێردراوی نزیکم بە چەکی زانست و راستی و بیری پاك خۆت رابهێنە تاوەکو بە باشی و راستی هەڵتبژێرن. مردن و لەناوچوون بەهۆی خراپەکاری و نەبوونی ئەقڵەوەیە کە درۆکاران توانای گەورەکردنی سەرچاوەکەیان هەیە و ستەمگەر ئەنجامیدەدات. ژیان و مانەوەی راستی لە ئازادی و خۆشیدایە کە زانست و زانیارییە. مرۆڤی ئازاد و دانا زیندووەو مرۆڤی وێنەییش کە گرفتاری بێ ئەقڵییە و سەرهەڵگرتووەو دیلی زنجیری نەخوێندەواری و فریودان و شتیتر و درۆیە کە لە ژیانی راستی بێبەشە، بەو پێیە گەوهەری درۆگەر بە باریش بێت مردنە و گەوهەری پاکی و راستیش ژیانە. خۆشی یەزدان لەوەدایە کە تۆ ئەی مرۆڤ بەڕاستی خۆراکی پەیوەندی لە رێگای ئازادی و سەربەستی مرۆڤایەتیدا پێشبخەیت. دێوە تیرەکان سەربەستی مرۆڤ بە قوربانی شتێك دەکەن و بەخراپی خۆیان دەیسازێنن و نیشانیدەدەن کە بەشێوەی مرۆڤایەتی فەرمانڕەوایەتی مرۆڤ دەکەن بەو توانایەی کە خوا پێیداون. بەرامبەر ئەو سوڵتە باشە ئەهریمەنەکان هەردەم لە گوماندا دەبن و دەستیان لە کۆمەڵگای دەبڕێ هەروەها درۆش بەدەستی راست دەسپێرن تاوەکو مرۆڤ بتوانێت بەهۆی درۆوە پێشبکەوێت و ژیانێکی نوێ بۆ مرۆڤایەتی لە دنیادا دروست بکات. ئەوانەی کە بەناوی ئایین ئامۆژگاری درۆدەکەن و خۆیان بە تەبا نیشان دەدەن

لادەرن و دوو روون و قسەکانیان بڕناکات لەبەر ئەوەی دەبنە بەربەست لەڕێی بەردەوامی توانایاندا ئەم پوختەیە بەشێکە لە (هات)ی 30 و 31ی گاتاکان کە بە هەر زمانێك نووسرابن گۆڕیوومن و لێکۆڵینەوەم لەسەر کردوون. ئامانجیشم لەمەدا بۆ گەورەیی هەمان پەیامە کە بۆ ئازادی و دانایی مرۆڤ چەند بەنرخە و چارەنووسی لەسەرە بەو شێوەیەی کە مرۆڤ لە دیوانی پیاوی ئازادا داواو پێشەوایەتی خۆی هەرگیز ناکاتە قوربانی رای دیکتاتۆرەکان و کاهینە خراپەکان ئەگەر بەزۆر و فشارو پاداشت پێدانیش بێت. دەسەڵات وەرگرتنی پادشاش لە کۆمەڵگای ئێراندا بەهۆی ئایینەوە نەبووە بەڵکو دوای ئەوە بە چەند چاخێك بەر لەدەرکەوتنی دەوڵەت لە ئێراندا ئەوە دیاریکراوە کە مرۆڤ لەسەر مەزەبی ئایینی (مەزدیەسنا) نەبووە بەڵکو لەو ئایینە لای داوە ئەوەش بەهۆی بێ ئایینییەوە بووە. ئەو ئایینەش کە لادەر و کەمە کەمێك پایەکانی بە پێی یاسا فەرمانڕەوایەتی کردووە بە درێژایی مێژوو بە خراپترین شێوە لە پەیامی زەردەشتدا باسیکراوە ئەوەش بەۆهی ئەوە بووە کە پشتگیری شاهەنشای هەبووە.

وردکردنەوەو شیکردنەوەی پێشکەوتن لە نامە جیاجیاندا لە ئێران باسیان هاتووە کە شارەزایان لێیان دواون و کاریان لەسەر کردووە. لەم بەشەدا بەکورتی باسی دیاردەکانی حکومەت و دەسەڵات دەکەین لە ئێراندا لە هەمانکاتدا بەراوردی دەکەین بە ئوسوڵی پەیامی زەردەشت بۆ ئەوەی دژەکانی سیستەمی کۆمەڵایەتی لەناو ئایینی (مەزد یەسنا)دا دەربکەوێت. ئەو قسەیەش پشتگیری لێ بکرێت کە تەواوی حکومەتەکان بەدرێژایی مێژوو بەناوی ئایین لە ئێراندا بە پێچەوانەی ئوسوڵی بیری (زەردەشت) بوون.

دەربارەی سوڵتانەکانی ماد زانیاری تەواو بەدەستەوە نییە. بەپێی قسەی مێژوونووسانی یۆنانی مادەکان لەژێر دەسەڵاتی ئاشوورییەکاندا بوون. ئەوەی لە سوڵتانەکانی نێوان دوو رووبار وەرگیراوە ئەوە دەگەیەنێت کە پێشکەوتنی ئاوێستایی لە حکومەتی ئەواندا نەخشێکی لایان جێنەهێشتووە. نموونەی قسەکانی هێرۆدۆت کە گوازراوەتەوە بۆ ناسینەوەی مادەکان ئەو دەنووسێ:

ئاوێستایی لە حکومەتی ئەواندا پاشماوەیەکی جێنەهێشتووە. لەو بارەیەوە (هێرۆدۆت) کە ناسراوە بە باسەکانی لەسەر رووداوەکانی مێژووی ماد نووسیویە: (ئاستیاگس) کە دوا پادشای (مادە) لە خەویا کچەکەی بینی درەختێك لەناو سکیا دەرچووە کە تەواوی ئاسیای گرتۆتەوە،

بەڵام کاتێك فەرمانیدا منداڵە نوێکەی کچەکەی بکوژێ ئەو فەرمانەی بە سەرداری خۆی (هارپاگۆس) سپارد بۆ ئەوەی کارەکە ئەنجامبدات. (هارپاگۆس) منداڵەکەیدا بە شوانێك تاوەکو فەرمانەکەی پادشا بەجێبگەیەنێت. ژنی شوانەکە وادەریخست کە منداڵەکە مردووە. کاتێك کۆرش گەورەبوو ئاستیاگش کە ئەوی دی خۆشحاڵ بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی (هاپاگۆس) فەرمانی پادشای جێبەجێنەکردووە داوەتی ئەوی بۆ نان خواردن کرد. کوڕی ئەو سەرداره بە نهێنی بە فەرمانی پادشا کوژراو لە گۆشتەکەی خواردنێکی پوختە دروستکرا بێئەوەی (هارپاگۆس) لەوە بە ئاگابێت. لەناو ئەو خواردنانەی (هارپاگۆس) سەرقاڵی خواردنیان بوو بەلەمێك دانرابوو کەللە و دەست و پێی منداڵەکەی لەسەر بوو کە بۆی دانرابوو،

بۆ ئەوەی ببینێ کە ئەو گۆشتەی دەیخوات هی کێیە!! هەڵبەتە راستی ئەم داستانە تەواو دیار نییە، بەڵام نموونەی ئەم شتانە لە سروشتی سوڵتەی سەردەمەکەدا هەیە.

بەپێی قسەی هێرۆدۆت (دیاگۆس) یەکەمین پادشای (ماد)ە کە سەرۆك عەشیرەتەکانی (ماد)ی خستەژێر دەسەڵاتی. گرنگترین شتێك کە ئەو هەوڵی بۆ دابێت شێوەی دەرباری ئاشوورییەکان لە نێوان مرۆڤی دوارنشین و کۆچەریدا بڕیارێك دەربکرێت بۆ جیاکردنەوەیان.

(دیاگۆس) فەرمانیدا کە هیچ کەس بێ مۆڵەت نەیەتە دیدەنی پادشا بەڵکو هاتنی ئەو کەسە دەبێت لە رێگای پەیامنێرێکەوە بێ بە مانا بە یەکیان بگەیەنێت!!

لە حزوری پادشادا پێکەنین و باوێشکدان قەدەغە بوو هەروەها قسەکردنیش لەگەڵیا بەپێی داب و نەریتێك بووە کە لە فەرهەنگی شاهەنشایی ئاشوورییەکانەوە وەرگیراوە کە پێداویستییەکانی ژیانی عەشیرەتە کۆچەرییەکان و ئازادەکان و کۆمەڵەی ژێر دەستە و فەرمانبەران دایانناوە. لەم گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەدا ئاییني (مەزدیەسنا) هیچ شێوە نەخشێکی یان پاشماوەیەکی نەبووە.

هاخامەنشییەکان بوونە میراتگری دەسەڵاتی مادەکان و (کۆرش)یش یەکەمین شاهەنشای هاخامەنشی بوو کە دایکی شازادەیەکی میدی بوو کە شێوەی حکومەتەکە و دەرباری دانا، بەڵام ئەوەی لێرەدا دەمەوێ بیرتا بێنمەوە نفووسی فەرهەنگی ئاوێستاییە کە لەناو ئەو گەلانەدا پێشتر پێشکەوتووانە هەبووەو لەو رۆژگارەشدا بینراوە.

لەسەر کۆرش زانیاری زۆر لەبەردەستا نییە هەروەها لە نووسینەکان و باسەکانیشدا بە کەمی هەن، بەڵام ئەوەی کە هەیە نیشانیدەدات کە پادشایەکی بەتواناو خاوەنی سیفاتی

جوانبووەو پەروەردەکرنیشی لەناو مادەکانا بووە کە پێیانەوە وابەستە بووە. (کۆرش) تواناو زبری بەڕێوەبردنی سوڵتەکەی لە باوك و باپیرییەوە بۆی ماوەتەوە هەرچەندە هۆکارەکانی ئەو زبرییەش لای ئێمە روون نییە، بەڵام بەلای منەوە هەمان کاریگەری فەرهەنگی ئاوێستایی لەسەرە جگە لەوەش لە سەرەتاشدا لەسەر رێبازی پادشاکانی (ماد) سوڵتەی بەڕێوەبردووە کە سوودی بینیووە لە شورای راوێژکارانی جەوت سەرۆکەکانی بنەماڵەکان کە بۆ بەڕێوەبردنی وڵاتەکەی لەبەرچاوگیراوەو بووەتە نموونەی سیستەمەکە.

پرۆفیسۆر (Hippel)ی لێکۆڵەری هاوچەرخی ئەڵمانی نووسیوویە: هاخامەنشییەکان سیستەمی بەڕێوەبردنەکەیان هەمان شێوەی وەرگرتووە کە پێکهاتووە لە خۆرێك و بە چواردەوریا شەش ئەستێرەی گەڕۆك هەم کە بە هەموویان کۆمەڵەیەکی حەوت دروست دەکەن. ئەوانە دەزگای تەکبیر و راوێژی حەوت شازادە کە پێکدەهێنن کە (کۆرش) لە نێوانیانا کەسی یەکەمە و لەسەر شێوەی (پریمۆس ئینترپارس)، یان کەسی یەکەم لەنێوان هەموواندایە کە ئاسەوارەکەی هەمان شێوەی ئاهورامزدایە کە چوار دەوریان گرتووەو پێشوازی لێدەکەن. بەشێوەیەکیتر نفووسی فەرهەنگی ئاوێستایی هۆکارێك بووە کە سیستەمی پادشایەتی پارس شێوە تایبەتی بەخۆوە بگرێت کە سیستەمی مادەکان لەمە جیاوازبووە. لە بەرگی یەکەمی نامەی بەڕێوەبردن نەوەك حکومەت بەو شێوەیە جارێکیتر حکومەتی هاخامەنشیان ئاماژە دەدات کە پێدەچێت بەزۆری لە چاخی کۆرش و داریۆشدل ئەو کارە بەو شێوەیە کرابێت و کۆتایی هاتبێت. هەتاکو هەستانی (داریۆش)یش دژی گاوماتەی موغ لەگەڵ ئەو شەش شازادەیەدا بە پیەمان بەستن رێککەوتوون.

لەو رۆژگارەدا پادشا دەسەڵاتی تەواوی هەبووە لە حکومەتەکەیدا بۆ دانانی خوا، یان خواکان ئەمەش بە باوەڕی مرۆڤی سەرزەمینی خۆرهەڵات خواکان بەپێی پلەوپایەیان دابەشبوون. لەو رووەوە (هێپلڵ) و ژمارەیەك لە لێکۆڵەران بۆ ئەوە دەچن کە وردە وردە بیری خوا پادشا لە ئێراندا نفووسی بڵاوبۆتەوە. لەمەدا ناوبراو پشتی بەهەمان باوەڕ بەستووە کە (کۆرش) توانیوویەتی حکومەتی بەتوانی خۆی دابمەزرێنێت.

ئەوەی تایبەتە بە حکومەتی (کۆرش) دیاریکردنی جێگری پادشا بوو کە خۆیان بۆ ئامادەکرد، بۆ ئەوەی شوێنی بگرێتەوە لەبەر ئەوەی سوڵتەکەی کۆتایی هات، جێگرەکەش تاوانبارێکی شێتبوو.

(کامبیز)، یان (کامبوجیه) برادەری خۆی (بردیا) و بەشی زۆری ئەو گەلانەی خراپەی دەکردو ئازاری مرۆڤی دەدا.

(ویل دیورانت) نووسیویە: ((رای تازە لەسەر ناخۆشییەکانی فەرمانڕەوایەتی (کامبیز) ئەوە دەگەیەنێت کاتێك ناخۆشی دڵی گرت خوشك و ژنی خۆی (رۆکسانا)ی کوشت و کوڕی خۆشی (پڕکساسپ) بە تەور کوشت و (12) کەسیشی لە گەورەکانی پارس بە زیندوویی خستنە ناو گۆڕەوەو فەرمانی کوشتنی (کرزۆس)ی راوێژکاری باوکی خۆشیدا)).

ئەوەی سەرنجڕاکێشە بەرامبەر ئەم تاوانە دڕندەیانە وەڵامدانەوەیەك لە مرۆڤ و دەربارەوە بە ئاشکرا نەبوو ئەمەشش راستییەکە و پشتگیری لێکراوە کە لە رۆژگاری (کۆرش)دا لەسەر ئیتاعە و وەرگرتنی تواناو خوا پادشایی راهاتبوون کە لە کۆمەڵگاشدا سەقامگیربوو بەجۆرێك کە کەسانی ژێر دەستە و رەعیەتی پادشا شارەزایان هەبوو لەسەر ئیتاعەکردنی جێگرە دیوانەکەی کە بەکارێکی دانراوی شایستەی بەجێ مامەڵەی لەگەڵدا دەکرا.

لە نووسینەکانی داریۆش و پاشماوەی پێشووتردا کە لەبەردەستدان ئەو دەسەڵاتی لە کۆرشەوە بۆ ماوەتەوە، مادەکانیش لە میراتگری وەریانگرتووە. سەرەتا دەرباری ئەو بەهەمان توانای (کۆرش) لە حکومەتەکەیدا پێیگەیشتووە. لەو باسەی کە لەسەری دواین سیفاتی باشی ئەم پادشایە بێ وێنە بوو لە رووی مرۆڤایەتییەوە ئەو بە تواناترین و شایستەترین فەرمانڕەوای ئێرانی کۆن ناسراوە. بەبوونی ئەم شتە دیاریکرا وانەی بەرزو بەنرخی رەوشتی، جارێکیتر داریۆش گەڕایەوە لەگەڵ خراپەکانی سوڵتەدا ئالودەبوو و ناڕاستەوخۆش پشتگیری لە خوا پادشا کرد.

**(شدەر) دەربارەی داریۆش دەنووسێ:**

هەر کەس باسی کارەکانی داریۆش لە نووسراوە گەورەکەی بێستووندا بخوێنێتەوە بە دەمارگرژ و تووڕەبووی دادەنێت، بەڵام کە پادشا ئاماژە بە وەفاداران و هاوڕێیانی خۆی دەدا لە گەورە ئەفسەرانی کە پێشەوایەتی شەڕەکانیان بۆ کردووەو یارمەتیان داوە بۆ ئەوەی دەست بەسەر ئەو وڵاتەدا بگرێ کە ژێردەستەکانی یان پیاوەکانی بوون موچوڕکەیەك سەرتاپای گیانی دەگرێ. کارەکان و هێرشەکانی پادشا گەورەییەك نیشان دەدات، بەڵام شتێکی تیادا نییە: هەست بە ئازادی و نرخی ناکات کە لایەق بێت بە مرۆڤی ئازاد کە ئازادیشە بۆ خۆی و دڵەڕاوکێدا دەژی.

پڕۆفیسۆر (بنگستن)ی ئەڵمانی دەنووسێ: سەرم سووڕدەمێنێ کە لە هیچکام لەو نووسراوە بە نرخانەی داریۆشدا نەخشی هاوکاران و یاوەرانی نابینین ئەمەش لەبەر ئەوە بووە پادشاکان تەواوی رەعیەتەکانیان بە یەکسانی سەیرکردووە واتە بەشێوەی غولام و ژێردەستەی خۆیان کە فرمێسکیان بۆ نەڕشتوون.

پادشا گەورەکان حەزیانکردووە مرۆڤ و میللەت بۆ ئەوان بژین و بە توانا گەورەکانیان مۆڵەت بدەن کە لەژێر شەرەفیاندا مومتەلەکاتیان هەبێ بۆ ئەوەی بتوانن سەرنجیان بۆ لای خۆیان رابکێشن ئەوەش بە لەناوچوونیان دەبێ لە گۆڕەپانی شەڕدا.

لە نووسراوەکەی تەختی جەمشیددا (داریۆش) و (خشایارشا) کەمێك گەورەتر و بەرجەستەتر لەوانیتر لە نەخشەکەدا دەرهێنراون، ئەمەش نیشانەیەکی ئاساییە کە پادشا لەگەڵ مرۆڤدا دەبێت جیاوازی هەبێت. بەو شێوەیە هەر لەو نووسراوەدا هاتووە: پادشا دەبینین هاوڕێیەتی دەکاو دەمی داخستووە. پیرسی سایکس دەنووسێ: (هەریەك لەو رەعایانە کە ئامادەبوون لەبەردەم پادشای گەورەدا لەبەردەمیا لەپەو روو کەوتوون لە تەواوی ئەو ماوەیەدا و دەستەکانیان شاردۆتەوە ئەمەش داب و نەریتێك بووە هەبووە).

(داریۆش) جارێکیتر هەمان هەڵەی کۆرشی دووبارەکردەوەو (خشایارشا)ی بەدڕەوشت و بێتوانای بەجێگری دانا لەجیاتی ئەوەی ژمارەیەك لەمەردی بەرجەستەکراو و فەرماندەی لایەق هەبوون یەکێکیان دابنێت کە لە چواردەوری کۆببوونەوە. لە دەربار (خشایارشا) لەم جێگرییەیدا تووشی گەورەیی دەروونی بوو، ئەو تەنیا بە باشی و جوانی بالای دڵخۆشبوو ببووە سەرچاوەی باشی مێژوونووسان کە بڕیاریان لەسەر ئەدا، بۆ خراپەکاری سوڵتەکەشی رای تەواویان داوە.

(خشایارشا) لە سنووری خۆیدا باشتر لەوانیتر پیرۆزتر بووەو مۆڵەتی بە کەس نەداوە لێی نزیك ببنەوە، هەتاکو لە دەرباری گشتیشدا دەرباریان و رەعیەتەکەی کە پێویستبوو بە هەر هۆیەك بێت ببینن دەبوایە پەردەیان بپۆشیایە ئەوسا مۆڵەت دەدران و ئەویش خۆی جیادەکردەوە.

پڕۆفیسۆر هەنینگ دەربارەی (خشایارشا) دەنووسێ: (بەپێی فەرمانێك هیچ کەس مۆڵەتی پێنەدراوە لە پادشا نزیك بێتەوە یان گیانبەری بکەوێت لەبەر ئەوەی پیرۆز بووە. ئەو لە شەڕەکانیدا جیا لە کەسانیتر لە گالیسکە شێوە خۆرەکەیدا لەو شوێنە

دڵتەنگ بوو کە دووربوو لە شەڕەکە. ئەو هەتاکو لە ئەسپ سواریشدا لەوانیتری قەدەغە دەکرد بۆ ئەوەی بگاتە پایەی بەرزی پیرۆزی و ئەیترساندن. لە کاتێکدا لە نووسراوەکەی داریۆش بەدەستمان گەیشتووە ئەو لە شەڕەکاندا هاوبەشی دەکرد و لە ئەسپ سواری و تیرهاوێشتنیشدا شارەزایی و شانازی بەخۆوە دەکرد).

(ویل دیورانت) دەنووسیٚ: ((باوکی (دە) کوڕ، چوار کوڕی خۆی بۆ مەیدانی شەڕ بۆ گۆڕەپانی نەبەردی ناردن کە پادشا مۆڵەتی پێدابوو، کوڕی پێنجەم کە رووەو باوکی بەهێواشی دەڕۆشت. بە فەرمانی پادشا کوڕەکەیان بەدوو لەتکردو بە هەردوو لای ڕێگاکەدا هەڵیانواسی کە لەشکر پیادا دەڕۆشت ئەمەش بۆ ئەوە بوو ببێتە چەند بۆ کەسانیتر)).

(ویل دیورانت) دەنووسیٚ: ( ئیمپراتۆریەتێك هەتاکو ئەو کاتەی توانای بەرزی هەبوو بە ڕێگای کوشتن و بڕین پارێزگاری لە خۆی کرد، بەڵام ڕێککەوتنێك هەمان توانای کوشتنی جارێکیتر هۆکاری جیا بۆ مرۆڤ و دەربار دروست دەکاو لاوازی سوڵتەش کەمێك دەرئەخات.

بەبیٚ هۆکار نەبووە کە سوپای گەورەی (خشایارشا) لە یۆنان بەرامبەر سوپایەکی بچووکی شکست بخواو لە ئاشکرابوونیدا ناچار بەراکردن بێت. لەم شەڕەدا بە قسەی هێرۆدۆت نێردراوی ئاسپارت بۆ هێدرانس کە سەردار و فەرماندەی سوپای تایبەت و ناسراوبوون و پارێزگاریان لە پادشاکانی ئێران دەکرد بەناوی نەمرەکان لە دەربەندی (تەرموپیل) کە یۆنانییەکان بەخۆشییەوە وەریانگرتەوە چیان وتووە: (ئاری تۆ خۆت دەزانیت کە چەند ژێر دەستە بوویت بۆ ئەوەی تامی ئازادی بچێژیت کە نەتچێشتووەو لە شیرینییەکەی بە ئاگانیت. هەرکات بە ئاگابوویت بە ئێمە ئامۆژگاری دەدەی و بۆ پاراستنت دەجەنگیت. نەوەك تەنیا هەر بە نیزەی خۆت بەڵکو بە تەورەکانی خزمانیش) (بەشێك لە مێژوونووسان ئەم قسەیە دەخەنە پاڵ کۆمەڵێك لە یۆنانییەکان کە لە ساتراپی ئاسیای بچکۆڵەدا بەو جۆرە وەڵامیان داوەتەوە).

پرۆفیسۆر (فرای) بە پێوانەکردنی یۆنانییەکان و ئێرانییەکان لەو رۆژگارەداو پێوانەکردنیان بە زەوی و گرنگی ئازادی لە کۆمەڵگای یۆنان و حکومەتی موتڵەقی ئیتاعەکراوی ئاسایی لە ئێراندا، ئەنجامێك وەردەگرێت ئەویش: (بە خوێندنەوەی دیاریکراوەکان لە سیفات یۆنانییەکان و ئێرانییەکاندا دەتوانم بگەمە راستییەکانی هۆکاری سەرکەوتنی یۆنانییەکان و پەیبردن بە شکستخوادنی ئێرانییەکان).

له دواییدا بەهۆی کاریگەری گەندەڵی و فشاری دەرباری (خشایارشا) و گۆڕانی ماعنەوی و گۆڕانکاری لە فەرهەنگی ئاوێستاشدا وردە وردە بەهۆی کاریگەری نفووسی ئایینی موغەکان بووە بەردبووەو لە ڕێڕەوی خۆی لایدا کە پێشتریش کۆمەڵگای ئێرانی لەرزاویشی گرتبۆوە، بەجۆرێك کە ئیمپراتۆرێکی گەورە نەیتوانی بەرامبەر کۆمەڵگای بچووکی یۆنان و هەتاکو بەرامبەر شاری (ئاتن)یش توانای بەرەنگاری هەبێ. (خشایارشا) دوای ئەوەی لە (ئاتن) بۆ دەرباری خۆی پەنای بردەوە کە پێشووتر داگیری کردبوو، بەڵام سەرئەنجام بەهۆی گەندەڵی دەربار لە ساڵی 465ی پێش زایینی بەدەستی یەکێ: لە سەردارانی سوپای سوڵتان بەناوی (ئارتابانۆس) یان (ئاردوان) کوژرا (ئاردوان گەورەی هەزار کەسی ئازابوو کە بەناوی هەزاپت ناوی براوە).

سایکس کە خۆی سەرباز بووەو زۆر لەگەڵ پادشاکانی ئێراندا کاری کردووەو بە ئاریایی بوونی خۆشی شانازی کردووەو تێکۆشاوە بۆ ئەوەی چاکەکانی ئەو پادشایانەی ئاریایی نیشانبدات لێرەدا ناچاربووە دەربارەی خشایارشا چەند خراپەیەکی بەسەردا بدات هەروەکو دەڵێ: (بەهۆی نەشارەزایی و گەندەڵی و ڕەوشتی خشایارشا دوای 20 ساڵ سوڵتە و دەسەڵات پاداشتی خۆی وەرگرت کە تووشی چارەنووسی خۆی بوو بەدەستی (ئارتانۆس) سەرۆکی پاسەوانەکانی خۆی بە کوشتن چوو.. ئەو کاتێك کە بەدەسەڵات گەیشت بە تواناترین دەوڵەتێك کە تاوەکو ئێستاش لە دنیادا هەیە خاوەنی بوو.

هەروەها سوپایەکی گەورەو هۆکارەکان و هێزەکانی بێ کۆتایی لەژێر دەستیا بوو. بەبوونی هەموو ئەو میراتە و بڵندێتی لە دەریادا زللەیەکی لە یۆنانییەکانەوە خوارد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە شەڕ درێژەیدا بۆ سڕینەوەی ئەو لکەیە، بەڵام کۆتایی بەخۆی هێناو لە یۆنانەوە بۆ ئاسیا رایکردو دوای تاوەکو کۆتایی هێنان بە ژیانی لەگەڵ هاوسەرەکانیا دەژیا و کارەکانیشی بەخواجاکانی کۆشك سپارد.

لە سیستەمی دیکتاتۆریدا سوڵتەی فەردی توانای دەوڵەت بەکاردەهێنێ تاوەکو جڵەوی رابەرایەتی و فەرمانڕەوایەتی بگرێ. (بەڵام) لە دواییدا خودی ئەو مرۆڤە خۆی لە رۆژگاری گەورەبوونیا لە مەیدانەکەدا هەر وێنەی خۆی واتە دیکتاتۆر نیشاندەدات. دوای داریۆش گەندەڵی سوڵتەو رۆحانییەکان وردە وردە پاشماوەکانی فەرهەنگی ڕەسەنی مەزدیەسنای بەرەو رووخاندن برد کە خەرافیاتی موغەکان لە ئایینی دەربارەی هاخامەنشییەکاندا بەناوی زەردەشت ئەنجامیاندەدا.

(وەندیداد) بەروبوومی ئەو هاوئاهەنگییەی دەربارو رووحانییەکان بوو لە رۆژگاری (خشایارشا)دا. شدەر دەنووسێ: لە رۆژگاری پادشاکانی کۆنی ئێراندا ئایینی موغەکان کە بەناوی زەردەشت ناوزەد کرابوو،

ئایینی دەستەی فەرمانڕەواکان و دەرباربوو نەوەك ئایینی مرۆڤ بێت، سەرۆکایەتی ئایینەکەش لە وێ،ەی فەرهەنگی دەستەی فەرمانڕەوایەکەدا بەدەستهاتووە. کلێساش بۆ پارێزگاری لە شوێ،ی خۆی پەیوەندی بەدەستەی فەرمانڕەواوە هەبوو قازانجی لێدەکردو جارێکیتر بە کەمی تەکبیری دژی حکومەت دەکرد. شۆڕشی موغەکان لە فەرمانڕەوایەتی (کامبیز)دا دەتوانین بە یەکێك لە سەرچاوەکانی زانیاری دابنێین.

سەرنجڕاکێش لەمەدا سەرهەڵدانی ئایینی موغە لە نوێوە لە رۆژگاری داریۆش لە دەرباری هاخامەنشییەکاندا و هەتاکو لە دەرباری (خشایارشا)شدا نفووسی هەبوو. لە باسێکی کورتی دەرباری سوڵتەی مادەکاندا و دوایی لە حکومەتی کۆرش-کامبیز-داریۆش-خشایارشا هەمان دیاردە دووبارەبۆتەوە. سوڵتەی سەربەخۆش لە فەرهەنگی ئاوێستاییدا بەهۆی نفوسی فەرهەنگی سامی و لاساییکردنەوەی دەربارەکانی کۆمەڵان کە دراوسێن لە ئێرانیشدا شوێنی خۆی گرت. لە حکومەتی مادەکاندا فەرهەنگی ئاوێستایی ئاسەواری نییە، بەڵام لە دەوڵەتی هاخامەنشیدا ئاسەواری رۆشنایی نفووسی فەرهەنگی ئاوێستایی دەبینرێتز کۆرش لەم کاریگەرییەدا بێبەش بووە بەهۆی ئەوەی لە نووسینەکانیدا ئاماژە بە ئاهۆرامزدا نادات، بەڵام کارەکانی ئەو بۆ فەرهەنگی ئاوێستایی هێمایە، چونکە پێیدەوڵەمەند دەبێت. لای لێکۆڵەرانیش ئەوە روونەکە چەند چاخێك بەر لەو رۆژگارە لە باکووری خۆرهەڵات و خۆرهەڵاتی ئێراندا ئەو فەرهەنگە نفووسی نەبووەو عەشیرەتی هاخامەنشیش دواتر بە شێوەیەك کە من هەواڵم لەسەری هەیە بەو ئاشنابووە. رابەری ئەم فەرهەنگە لەو سەردەمانەدا (یەشتەکان) و (یەسنەکان)ی کۆن بووە کە تیایاندا بوونی لادانێك لە پەیامی زەردەشتدا بە زۆری نزیکترە وەك بە باوەڕەکانی سەردەمەکانی دوایی.

(کامبیز) شازادەیەك بوو کە لە دەبار هەروەکو دەبینین پەروەردەکرابوو، بەڵام کەمتر رێککەوتن هەیە لەسەر شێوەی پەروەردەکردنەکەی واتە لە شوێنێك بووبێت کە توانای تەشریفات لە گەورەبوونیا بووبێت. کامبیز لەسەرو ئەوەشەوە کە نەخۆش بوو، بەڵام رۆحی سەرکردایەتی تیادا هەبووە ئەمەش ئەوە نیشاندەدات کە زۆرینەی ئەو شازادانە لەگەڵ نەخۆشییەکانیشیاندا رۆژگارەکە یارمەتیداون.

داریۆش هاخامەنشی رەسەن لەگەڵ گەندەڵی دەرباردا نەژیا، جگە لەوەش تەواو پەیوەندی بە مادەکانەوە نەبوو. لە باوەڕەکانی ئەودا بە ئاشکرا فەرهەنگی ئاوێستایی تیشك دەداتەوە، ئەو بە چەند پلەیەك بەو باوەڕانە لە کۆمەڵگادا بە پەیامی زەردەشت زیاتر ئاشنابوو، ئەوەش

بە ئێمە مۆڵەت دەدات کە هەست بکەم و بزانم ئەو باوەڕانەی لەو رۆژگارەدا لە عەشرەتەکەیەوە بە میرات بۆ ماوەتەوە نەوەك لە موغەکان کە لەو رۆژگارەدا بەناوی زەردەشت مەزەب و ئاداب و رسومەکان پەیڕەوکراوە. ئەوەی بەناوی مەزەب دەوترا داریۆش راکانی لەوەندیدادا دەبینرێت لە یەکچوونێك لەگەڵ پەیامی زەردەشتدا لەوانەیە بەگشتی لەدەستدا هەبێت لە حاڵێکدا کە بەیانەکانی داریۆش تەواو لە چوارچێوەی یەشتاکاندا رێکخراوە هەتاکو لە هەندێك سەرچاوەشدا پێشتر کەوتووە.

پەروەردەکردنی (خشایارشا) لە دەربار جارێکیتر هەمان شوێنی کامبیزی گرتەوە لەگەڵ بوونی جیاوازییەك ئەوەش بەهۆی بوونی موغەکانی دەربار کە توانای زیاتری بۆ دروستکرد کە بە ئایینێکی لادەر ئاشنا بوو. ئەو کە لە رۆژگارێکی مەزەبیدا ژیاوە لە باوکییەوە بە میرات بۆی ماوەتەوە بەشێوەیەك وەکو پادشایەکی ئایین پەرست ئامۆژگاری کردووە ئەوەش بە ئاشکرا لەو لێکۆڵینەوانەدا دەرئەکەوێت کە تەرزی بیری زەردەشتی تیادا دەبینرێ کە باسیدەکەین.

بەو پێیە لەناو تەواوی رووداوەکاندا کە جێگای سەرنجدانن ئەوە دەرئەخەن کە هیچ کام لەو پادشایانە لەگەڵ پەیامی زەردەشتدا نەبوون، هەتاکو داریۆش خۆشی کە نزیکترین پادشا بووە لە سەرتاسەری ئێراندا بە ئایینی زەردەشت. بەو پێیە گەندەڵی لە دەرباری (خشایارشا) لە ئێراندا لەوەش زیاتر بووە هەروەکو (گێرشمەن) لەو رووەوە دەنووسێ:

لە دواییدا (داریۆش) فەرمانیدا بە دانانی چاودێر و پیلانگێڕان لەسەر دەربار و سوڵتەکەی بۆ کوشتن و تیرۆرکردنی ئەندامانی گەورە خێزانەکان ئەمەش رەواجی بە کوشتن و بڕینداو بووە هۆکاریش بۆ خوێنڕشتنەکە.

دوای مردنی کوڕی ئەدەشێری سێیەم ناچاربوون کەسێکی دوور لە خۆیان بەناوی (داریۆش) لەسەر تەخت دابنێن. ئەو تەنیا لە خێزانێکی هاخامەنشی بوو کە سەردەمێك توانی بەهێز دەسەڵات لە دنیادا بگرێتە دەست و فەرمانڕەوایەتی بکات.

بەجۆرێك کە لەوەوبەر باسیکراوە لە مێژووی کۆندا زۆرینەی ناوەندەکانی دەربار لە کاسەلێسەکان بوون ئەوانەی مانگانە لە سوڵتان کەلوپەل وەردەگرن و نووسراون لەگلە گەندەڵ و چاوبرسییەکانیتری سوڵتە کە کەمتر لە کۆمەڵگا بە ئاشکرا دەرئەکەون. لەگەڵ بوونی ئەم قسە

و باسانەشدا دژایەتی داریۆش هەر دەمێنێ کە نیشانەیە بۆ لادان و خراپەکاری و گەندەڵی و دڕندایەتی کە زۆرینەی دەربارەکانی جیهان لە سەرتاسەری مێژوودا گرفتاری بوون.

بینیم (خشایارشا) هاوڕێی خۆی کوشت و خۆشی بەدەستی (ئاردوان) کوژراو (ئاردوان)یش بەدەستی ئاردەشێری یەکەم کوژرا.

ئاردەشێری یەکەم لە مێژوودا بە ئاردەشێری پیر ناسراوە هەروەکو دەڵێن ئەو سەد کوڕی بووە کە لە ناویانا چوار لەوانە بەر لە مردنی خۆی لەناوچوون یان بە پیلان بە کوشتن چوون. دوای ئاردەشێر کوڕەکەی بەناوی خشایارشای دووەم لە شوێنی دانیشت کە دوای چەند هەفتەیەك بەدەستی هاوڕێی خۆی (سوگدیانس) بە کوشتن چوو. دوای شەش مانگیش هاوڕێی (سوگدیانس) بەناوی (ئوکوس) ئەوەی خستە ژێر خاکەوەو لە شوێنی دانیشت و ناوی داریۆشی دووەمی لەخۆی نا. ئەو خوشکی خۆی بەناوی (پەریزاد) (پەریزاتیس) مارەکردو هاوڕێیەکیتریشی هەبوو بەناوی (ئارسیتس) لەژێر خاکدا شاردەوە.

(داماد پادشا) بەناوی (تری توخمس) شەیدای خوشکی خۆی (رۆکسانە) (رۆشنگ) بوو کاتێك پیلانی جیابوونەوەی لە کچی پادشا گێڕا، بەڵام پادشاو بەدەستووری (پەریزاد) (رۆکسانە) پارچە پارچەیان کردو تەواوی بنەماڵەی (تری توخمس)یش لە ناویانا دایکی و خوشکی بە زیندوویی خستنیە گۆڕەوە.. ئەو ئاژەڵانە کە خراپتر لە شێرو پڵنگ و دڕندەتر لە هەر ئاژەڵێکی دڕندەیتر کە یەکتر پارچە پارچە دەکەن و بەزەییان بە کەسدا نایەتەوە لە گیان و ماڵی مرۆڤ کە لەژێر دەستیاندایە ئەوەش بۆ بەردەوامیانە لە سوڵتەدا.

ویل دیورانت دەربارەی ئەو پادشایانە دەنووسێ بە سوود وەرگرتن لە قسەکانی (هێرۆدۆت) و لێکۆڵینەوەکانی (راوڵەنسون) هەروەکو دەڵێ: (توانای پادشا سنووردار نەبووە، ئەو توانیوویە بەیەك وشە و بێ دادگاییکردن و بەڵگە هەر کەسێك بیەوێت دەیکوژێت ئەمەش شێوازێکە کە هەندێك لە دیکتاتۆرە مۆدێرنەکان پەیڕەوی دەکەن. دەسەڵاتی کوشتنەکەش دراوەتە دەست دایکی یان ژنی خۆشەویستی کە لەو شوێنە پێیدەکەن. ئەمەش وایکرد کەسێك نەتوانێت قسە بە گەورە گەورەکانی قەوم بڵێ. باوکێك کە کوڕەکەی بێ تاوان بوو لە بەرامبەر پادشادا رایانگرت و بە رەزامەندی ئەو بەتیر کوشتیان کە تەنیا پادشاش بوو تیرهاوێژێکی بە توانا بوو بە فەرمانی پادشا لەناو تەختەیەکدا قاچیان بەستەوەو پادشاش سوپاسی کردن کە ئەوەی بۆ خزمەتی ئەوان کردووە.

(ویل دیورانت) دەربارەی بەدڕەوشتی هاخامەنشییەکان دەنووسێ: (بەدڕەوشتی و کۆتایی ئێران لە یەکچوونی تەواوی هەیە لەگەڵ (رۆم)دا. ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ گەندەڵی بەڕێوەبردن و نزمبوونەوەی ژیانی مرۆڤ کە بەکاری زۆر هەستاون بێ ئەوەی دەربار گرنگیان پێبدات. ژیانی خۆشی چینی ئەشراف و رابواردنیان لە خۆراکی زۆر و خەرجی زۆر بێ ئەوەی سنوورێك هەبێت بۆیان نیشانەیە بۆ مرۆڤ و دڕندایەتییە بێ ئەندازەکەی. ئەم گەندەڵی و نزمبوونەوەیەش لە رۆمیشدا هەبوو، کاتێك دەسەڵاتی شێوازی کۆماری گۆڕا بۆ دەسەڵاتی (سزاریسم).

ئەو مێژووەی بە ئێمە گەیشتووە ئەوە دەگەیەنێت کاتێك ئەسکەندەری گەورە (ئەستەخری) پایتەختی هاخامەنشی داگیرکرد (120000) تەبەق ئاڵتوونی کۆکردەوەو لە (شووش)یش (20000) تەبەق ئاڵتوونی چەپاوکرد جگە لە شوێنانیتر تالآنی بەدەستهێنا. پلوتارك دەنووسێ: دە هەزار گالێسکە و (5) هەزار حوشتر پێویستبوو بۆ گواستنەوەی خەزنەکانی (ئەستەخر) کە بەشێك لە مێژوو باوەڕیان وایە ئەو سەرمایە گەورەیە چۆن توانراوە لەناو سەردارەکانی ئەسکەندەردا دابەشبکرێ کە گۆڕانکاری لە ئابووری ئەو رۆژگارەی جیهاندا دروستکردووە.

ئەو قسانە دەمانگەیەنێتە ئەنجامێك کە تا چ سنوورێك دەرباری هاخامەنشی پشتی مرۆڤی ئێرانی قورسکردووە. یان بە چ شێوەیەك ئەوانە بەرامبەر هێرشەکان و چەپاوکردنی ماڵیان لەلایەن تاوانبارن و خۆپەرستانی کۆمەڵگاوە بەشخوراوبوون. (شدەر) بەڵگەی نەمانی هاخامەنشییەکان و کەوتنی ئێران بردەوە بۆ پەیوەندییەکانی نایەکسانی پادشا لەگەڵ رەعیەتەکەیدا واتە بوونی گەورەیەتی و پایەدارێتی و جیاوازی چینایەتی بێ ئەندازەی زیاد لەگەڵ ژیانی پڕ خۆچشی و تەشریفات و قەسرو حەرەمسەراو خواجاکانی حەرەم.. بە زیرەکی خاوەن غوڵامەکان کە پادشا لەژێر دەستەکانی چاوەڕێی دەکرد توانییان یەکێتییەك لە نێوان ئەو بەندانە و دەربار یان سیفەت غوڵامی درۆ واتە ئەوانەی راستی دەگۆڕن چەند پەلەیەك پێشیان بخەن و گەورەیان بکەن تا دەگەنەوە بە ئازادەکان.

لە خاڵێکدا کە راپۆرتەکان دەیگەیەنن زمان لوسی و خزمەتکاری و ژێردەستەیی بەزۆری لە ئێراندا رەگ و ریشەی بەردەوام رۆشتووەو هەتاکو لە خێزانە گەورەکانیشدا لەناو ئەسراف و پیاو ماقوڵ و سەرمایەدارانیشدا تێکۆشاون کە ئادابی دەربار بە قەوارەیەکی بچووکتر پەیڕەو بکەن. ئەوانە کە لە دەربار غوڵام ژێردەستەی پادشا بوون لە ماڵەکانیاندا گەورەو خاوەنی

کۆیلەی رووخۆش و ژێردەستە بوون ئەمەش هەمان گەندەڵییە کە وردە وردە لە کۆمەڵگای ئێرانی گرتۆتەوە کە هەمووان بە برایەتی لەژێر دەوارێکدا ژیاون کە لە ناویاندا فەرهەنگی فرەخوایەتی و کەس پەرستی جێگیربووەو هەتاکو ئەمڕۆش بەشێوەی جیاجیا پاشماوەکەی لە بتپەرستی و تاکپەرستیدا ماوە.

فەرهەنگی فرە خوایەتی و بتپەرستی بە سنوورڕێك لەناو ئێراندا نفووسی بڵاوبۆوە کە توانیوویەتی گۆڕانکاری بنەڕەتی لە رۆح و بیری مرۆڤدا بهێنێتەکایەوە هەموو ئەو لێکۆڵەرانەی دەربارەی کۆمەڵگای ئێران تویێژینەوەیان داوە لە خۆیان هەرگیز پرسیار نەکردووە کە ئایینی سەرتایی (مزدیسنا)ی ئازاد هەبووبێ و پایە و بناغەی ئایینەکەش لەسەر بڕیاردان بووبێت وەکو ئێستای ئیسلام کە فرەخوایەتی لای تاونە و وازهێنان لە دوو دڵەکان و رابەر مەرجی یەکەمی موسڵمانە کە رایگەیاندووە.

خەڵکانێك کە بە درێژایی مێژوو هەنگاوی گەورەی بۆ خۆیان نابێ و ئەو سیفەتانەیان تیادا بەرجەستە بووبێت، بە بەراورد یان بە گەلانیتر و ئەو قۆناغەی پیادا رۆشتووە چۆن بەژێر دەستەیی و پەستی رازی دەبن و بەر لە هەموو کۆمەڵگایەك لە تاك پەرستی و لاساییکردنەوەی پەرستنی تاك خۆیان رزگارکردووە.

سەرچاوە

مهندس جلال الدین اشتیانی

زرتشت/ مزدیسنا و حکومت

چاپی هفتم 1374، لا413-430.

## (تەلارسازی)ی سەردەمی ماد

ئەگەر تەلارسازی بەناونیشانی یەکێك لە دیاردەکانی فەرهەنگ، شارستانییەت لەبەرچاو بگرین تەلارسازی رۆژگاری ماد بەدوو سەردەمدا رۆیشتووە ئەوەش جێگای لێکۆڵینەوەیە.

1- سەردەمی بەر لە دامەزراندنی حکومەتی پادشایی.

2- سەردەمی دوای دامەزراندنی حکومەتی پادشایی.

لە سەردەمی دووەمدا کە تەواو چاخێکی گرتەوە بەر لە چاخی شەشەمی پێش زایین پاشماوەی تەلارسازییان کە پەیوەستبێت پێوەیان بەزۆری دەست ناکەوێت. تەلارسازی ئەو سەردەمە کە لە سەردەمی دواتردا شوێنی بەدواداچوون و تەواکردنە لە شێوەدا ساکاربووە و پێکهاتووە لە خانووی یەك نهۆم و گۆشە چەسپاو، سەربانەکەی تەخت بووەو نەیانتوانیووە تەلاری گەورە بۆ پشوودان و مانەوەیان دروست بکەن تاوەکو لەو رۆژگارەدا بگەنە دروست کردنی شاریان لە هەوڵەکەیاندا شێوە شار بنوێنێ.

### تەلارسازی دووەم

پاشماوەکانی پەیوەستە بە سەردەمی دووەمی تەلارسازی ماد لەوانە دیمەنی گۆڕەکەی فەخریکای نزیك شاری (مەهاباد)، دوکات داود لە سەپەلی زەهاو، ئەشکەوتی (ئارنی یارخ) کە گۆڕێکی هەیوانی فەرهادە لە نزیك ماکۆ، هەروەها گۆڕی کوڕ و کیچ لە ناوچەی سووڕداشی سلێمانی کە (میتوان) ناوی هێناوەو بە پاشماوەیەکی هونەری بەردینی بەرجەستەی مادی داناوە کە رەگ و ریشەی لە هونەری تەلارسازی تایەفەکانی گوتییەوە وەرگیراوە. قزقەپان کە پێیدەچێت گۆڕی کیاکسار بێت ئەم گۆڕە هەمان شێوەی گۆڕێکیتری هەیە کە ناسراوە بە (سەحنە)ی کرماشان، بۆ هەموو ئەو پاشماوانە لەوانەیە مادەکان سوودیان لە هونەری تەلارسازی مرۆڤی ئۆرارتۆ وەرگرتبێت.

### تەلارسازی کۆشکی ئاکباتان (هەمەدان)

(هەمەدان) وەکو شارێك تەنیا پەیوەست نەبووە بەسەردەمەکانی (ماد) و (هاخامەنشی) کە گرنگی خۆی هەبێت بەڵکو لە رۆژگاری سلوکییەکانیشدا وێنە و توانای دەرکەوتنی بووە لە کاتێکدا سوپای فەرماندەکانی سلوکی دژی پارسەکان بووە. کاتێکیش سالآنێك دوای ئەوان ئاشکانییەکان توانایان بۆ گەڕایەوە توانیان تەواو ئێران بگرن، هەمەدانیش دوای ئەوە کرایە پایتەخت و مایەوە هەتاوەکو پایتەختی هاوینەیان دانا. هەر بەو شێوەیەش ئاسەواری گەورە کە پەیوەست بوو بە سەردەمی دەسەلآتی ساسانی لە چەند شوێنێکی جیاوازدا لەو شارەدا دۆزرانەوە ئەو شارەش واتە هەمەدان هەر بەو جۆرە لەو رۆژگارەدا مایەوەو بووە سەرچاوەی دەسەلآت و بڕیار تاوەکو ئەو کاتەی پایتەختی هاوینەی خۆیان دانا شاری مێژوویی هەمەدان یەکەمجار بە شێوەی (ئامادانە) ناوی هاتووە، هەڵبەتە (هێرۆدۆت) ئەم شارەی بە (ئەکباتان) ناوبردووە و مێژوونووسە ئەرمەنییەکان کۆتاییەکەشیان کە (راوڵەنن)ە باوەڕیان وایە (ئاکباتان)ی هێرۆدۆت هەمەدانی ئێستا نییە و شوێنی پایتەختی کۆنی مادیش لە تەختی سلێمانی ئەمرۆی نزیك دەریاچەی ورمێی لای باشووری خۆرهەلآتییەتی، بەلآم (دیمۆرگان) کە کەسێکە لەو رووەوە لێکۆڵینەوەی کردووە ئەوەی چەسپاند ئاکباتانی هێرۆدۆت هەمان هەمەدانی ئەمڕۆیە و تەپۆڵکەکانی سەر زەوییەکەیشی جێگای حەوت قەلآکەی کۆشکی هەمەدانە کە دیاریکراوە.

تەلارسازی ئەوان بەو شێوەیە بووە کە کۆشکی پادشایی لە (هەمەدان) لەسەر گردێك دروستکردنی دیاری کراوەو بڕیاری لەسەر دراوە بەشێوەی حەوت دیواری رەنگاو رەنگ و بازنەیی داخراوبووە. شێوەی دروستکردنی ئەو دیوارانە بەشێ,ەیەك بووە کە لە یەکتر بڵندتر بوون. لە پێشەوە کۆشکی پادشا و گەنجینەکەی بڕیاریان لەسەر دراوە. هەر یەکێك لەو دیوارانەش رەنگێکی بووە، دیواری یەکەم رەنگی سپی و دیواری دووەم رەنگی رەش و دیواری سێیەم رەنگی ئەرخەوانی و دیواری چوارەم رەنگی ئاویی و دیواری پێنجەم رەنگی سوور، یان نارنجی و دیواری شەشەم رەنگی زیوی، دیواری حەوتەم ئاڵتوونی.

لە دوو شوێنیتر لە خۆرئاوای ئێران پاشماوەی تەلارسازی مادەکان هەن یەکێکیان لە 12 کیلۆمەتری باشووری خۆرهەلآتی شاری کنگاوەرە لەسەر رووی گردی گەورەی ناسراو بە ناوی (گودین تەپە)، ئەویتر لە گوندی (نوشجان)ی 60 کیلۆمەتری باشووری

هەمەدان، یان 20 کیلۆمەتری خۆرئاوای (مەلایەر). لە گودین تەپە ئاسەواری ژیان و دانیشتنی 50 ساڵەی بەر لە زایین دۆزرایەوە تیایدا قەڵایەك درکەوت دیوارەکانی لە خشت دروستکرابوو بە پانی 4 مەتر. بەشی ناوەوەی بۆ دانیشتنی خێزان بووە کە لە ناویان چەند ژوورێك هەن لە یەکترەوە نزیکن بۆ چێشت لێنان و پێداویستییەکانیتری رۆژانە بەکارهێنراون. لەناویانا تەلارێکی گەورەی چوارگۆشە دەرکەوت درێژی باڵێکی 24 مەترەو لەسەر شەش پێنج تاکی کۆمەڵەکەی تەختە بەرزکراوەتەوە. شێوەی ئەم تەلارە دەچێتەوە سەر شێوەی تەرێکیتر کە لە تەختی جەمشید دۆزرایەوە بەناوی تەلاری (بارعام). سەکۆیەك لە ناویا بەشێوەیەکی گچکە ئامادەکراوە بۆ ئەوەی میوانەکان ولەسەری دابنیشن، لە بەرامبەریا تەختێکی تایبەتی پادشایی دروستکراوە، لە نزیکییەوە ئاگردانێکی خشت بەرچاو دەکەوێت کە بەرزترە لە تەختی زەوییەکە.

لە گردی (نوشجان) دیوارەکانی قەڵایەك دەرکەوت کە، گەورەن و ژوورەکانی ئازووقەش درێژن و بەرهەیوان و تاقیان تیادا هەن. تەلارێکی ناوەندی هەشت گۆشەش بەرچاو دەکەوێت کە پاشماوەی ئاگردانێکی تیادایە کە ژمارەیەك پارچەی زیوی مارپێچ لەناو گلەکەیدا دۆزرانەوە کە پێیدەچێت بە شێوەی دراو بۆ مامەڵە بەکارهێنرابن.

دروستکردنی پەنجەرەی بچووك لە دیوارەکانیدا (قەرەوڵخانە) بەرچاودەکەون ئەوە دەگەیەنن کە لە سەرانسەری ئێرانی خۆرئاوادا لە بنکە سەربازییەکانی مادەکان ئەو دیاردەیە پەیرەوکراوە لە هونەری تەلارسازیدا.

لە کۆتایی ساڵی 2002 کۆمیسیۆنی شوێنەوارناسی ئێران بە سەرۆکایەتی دکتۆر یوسف مەجید زادە لە بارەی دۆزینەوەی شاری دێرینی شوورەدراوی کیلۆمەتری ئۆزبەکی سەر بەشاری مەهاباد بڵاوکردەوە کە هاوشێوەی ئەو شارە لە هیچ شوێنێکیتر لەو زەوییانەدا نییە کە شوورای کۆن دەوری دابێت. تەواوی ئەو کای کنەو پشکنینەبووە هۆی دۆزینەوەی قەڵایەك لە سەردەمی ماد کەرو بەرەکەی 950 مەتری چوارگۆشەیە لە بەرزی 26 مەتری تەپەی ئەسڵی زەوی شوورا دراوەکەی ئۆزبەکی دەرکەوت، کە پێدەچێت 150 ساڵ مادەکان کاری حکومەتیان تیایدا ئەنجامدابێت، تەواوی ئەم قەڵای مادە تەلای شوورا دراوە پەرستگا و ژووری

پاسەوان و عەنباری بیرێکی تیادایە بۆ کۆکردنەوەی ئاو لەگەڵ دیواری گەورەی تەلاری دانیشتنی خێزانەکانی فەرمانڕەوای قەڵاکە.

لە کنەو پشکنینەکەدا دەرکەوت دیواری قەڵاکە کە بۆ سەردەمی ماد دەگەڕانەوە هەروەکو باسمانکرد بە دوو ڕەنگ بۆیە کرابوون لێرەدا ئەوەی بەدەستمان گەیشت بۆ یەکەمین جار دۆزینەوەی پەیکەری بەردینی پەیوەست بوو بەو سەردەمەوە.

سەرچاوە

ماستەرنامەیەکە لەسەر مێژووی ماد

بە زمانی فارسی لە زانکۆی تاران وەرگیراوە

# سیستەمی ئیداری مادەکان

سیستەمی ئیداری مادەکان هاوشێوەی سیستەمی ئیداری رامیاری ئاشوورییەکان و ئۆرارتۆییەکان بووە و مادەکانیش لەسەر شێوازی ئەوان وڵاتەکەیان بەڕێوەبردووە بە شێوەیەك کە، یەکەیەکی سیاسیان لە هەموو ئێراندا هەبووە واتە سیستەمەکەیان لەسەر یەك شێوە بنەما دامەزراوە، بەڵام جیاوازی لەوەی هاخامەنشییەکان بووە و فراوانتر دروستکراوە. بەو جۆرە دامەزراوی کۆمەڵایەتی (ماد) هەتاکو ئەو کاتەش لەسەر چوارچێوەی دەوڵەتی دانراوە لە چاخی جەوتی پێش زایین، بەڵام چالاك نەبووە. بەڕێوەبردنی پارێزگاکانیش لە ویلایەکاندا لەسەر شێوە وڵاتی ئاشوور بووە واتە (والی) بۆ کارەکانی دارایی و داد و سەربازی دانراوە، هەر ئەوەش وایکردووە قەڵەمڕەوی پارێزگاکانی ماد گەورەتر بووبێت لە پارێزگاکانی ئاشووریی و ئۆرارتۆیی.

### دابەشکردنی چینەکان و شێوەی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگای ماددا

لە سەرەوەی هەرەمە بە توانا دامەزراوە سیاسییە ئیدارییەکەی کۆمەڵگادا پادشا دێت کە خاوەنی بڕیارە و دوای ئەویش بنەماڵەی دەسەڵاتدار و ئەشراف دێت کە بڕیار بەدەستن. (ئاپرون) یان (ئاترون) کە پیاوانی ئاگر یان مجەورەکانی خزمەت بە ئاگر دەگرنەوە لەدوای ئەوانن بە پلەی سێیەمیش سوپا، یان نیزامیەکان دەگرێتەوە، دوای ئەوانیش شوانکارەکان و جوتیارەکان دێن کە لە کۆمەڵگای (ماد)دا حسابێکیان بۆ نەکراوە.

### سیستەمی ئابووری ماد

دەرکەوتنی کۆیلەکان لەناو دامەزراوەکانی عەشیرەتەکانی (ماد)دا هۆکارێك بووە بۆ پەرتبوونی مادەکان ئەوەش لە ئەنجامی لەشکر کێشی و کۆچکردنیان بە زۆر و بەگشتی و دەست بەسەرا داگرتنی زەوییەکانیان و چەپاوکردنی ماڵ و ماڵاتیان هاتۆتە گۆڕێ. ئەو تاڵانی و دیلگرتن و کۆیلایەتییەش لەناو خەڵکیدا لە چاخی هەشتەمی پێش زایین هەر وەکو لە

نووسراوەکانی ئاشووریدا دەردەکەوێت لە ئەنجامی سەرکەوتنیاندا لە شەڕەکانیانا دروستبووە، هەروەها سەرکەوتنیان بەسەر عەشیرەتەکانی (ماد)یشدا تۆمار کردووە کە توانیویانە کەلوپەلی زۆری خاوەن پیشەکانی ماد بۆ خۆیان بە تالانی بەرن. ئەم چیرۆکە بۆ خاوەن پیشەکان ڕەگ و ریشەی هەیە و شێوەی تایبەتی لە ئابووری پیشەسازییاندا رەنگی داوەتەوە یا ئارەزووی بە کۆمەڵگای ماد داوە. تێڕوانینێك بە ئابووری مادەکاندا دەردەکەوێت

بە ئاژەڵداری بەڕێوەچوون، بەڵگەش بۆ ئەمە لەسەر زۆرینەی گڵێسەکانیان وێنەی ئاژەڵی شاخداری گەورە دەردەکەوێت. وا دەرئەکەوێت ئابووری کشتوکاڵی مادەکان دوای جێگیربوونیان لە کۆمەڵگادا روویدابێت.

بەپێی سیستەمی ئەو پرۆژەیە ژیانی ئابووری مادەکان لە بناغەدا لەسەر ئاژەڵداری و کشتوکاڵی بووبێت، بەڵام لە کشتوکاڵدا زیاترە دەستکەوتیان هەبووە بەهۆی  ئەوەی خاکی ماد بە پیت و فەرتر بووە بە بەراوردی بە خاکی کشتوکاڵی ئاشوور و ئۆرارتۆ چونکە بەشی زۆری وڵاتەکەیان کراوە بە کشتوکاڵ و باخ بە تایبەتی بەرهەمیتری کە تایبەت بووە بەوان. بەڵگەی لەبەرچاویش بۆ ئەمە بەروبوومی باخیان لە ترێ و کشتوکاڵیان لە گەنم تابلۆکانی کۆشکی سارجۆنی دووەمیان پێڕازاندوونەتەوە کە دیار و لەبەرچاون. جگە لەوانەش ئاشوورییەکان سوودیان لە مانگا و ئاسن و ئاوریشمی جوانی مادەکان لە هەزارەی یەکەمی پێش زایین دیوە کە لەوانەوە پێیان گەیشتووە و لەناو خەڵکیدا دەستاو دەستیکردووە، هەروەها لە خاکی مادیشەوە نەوتیان دەستکەوتووە کە پێیان گوتووە رۆنی مادی. مادەکان پەیوەندی بازرگانیشیان لەگەڵ دراوسێکانیانا بەردەوام هەبووە، بەڵام دوای داگیرکردنی نەینەوا ئەو پەیوەندیانەی لە پێشووتردا هەبوون گرفتیان بۆ دروستبوو،

بەڵام ئەو سامانە ئابوورییەی لەناو کۆمەڵگای (ماد)دا پەیدابوو، بووە ئەستێرەی درەوشاوە بۆ (ماد) و کاریگەرێتی زۆری بۆ دانیشتووانەکەی دروستکرد.

گرووپێك لە مادەکان لە کاری کانزایی و زەڕەنگەڕیدا توانا و بەهرەی چاکیان هەبوو، لەهەمان کاتیشدا خاوەن پیشەکانی ئاروویی و عیلامی لە وڵاتی (ماد)دا کاریان دەکرد. دوای یەکگرتنی سکاکان و مادەکان و تێکەڵاو بوونیان و توانەوەی سکاکان لەناو مادەکاندا، ئەوانە سەرقاڵی کاری سەربازیی و هێرشبردن و لەشکر کێشی بوون و کارە ئاساییەکانیان بە گەلانی ناوخۆ و ژێر دەستەکان سپارد. لە هەموو ئەوانەش زیاتر لە دنیای کۆندا هونەر و بەهرە و پیاو چاکی و نرخدان بە دۆستایەتی و ژیانی ناوازەی مادەکان بەناوبانگ بووە و داب و نەریتیان لەناو گەلانیتردا بە گشتی وەرگیراوە.

سەرچاوە

ماستەرنامەیەك لە زانکۆی تاران

وەرگیراوە لەسەر مێژووی ماد